# دیوانا

# مەلا یووسف زڤنگی

## مەلا یووسف حەسەن عوسمان زڤنگی - بۆتی

## ١٩٠٧- ٢٠٠٢

شرۆڤەکرن

مەلا ئەحمەد مەلا یووسف زڤنگی

ڤەوژارتن و بەرهەڤکرن

د. فاخر حەسەن گولی

Zakho Centre
for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخو بۆ ڤەکولینێن کوردی

سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەکۆلینێن کوردی

| | |
|---|---|
| پەرتووك | دیوانا<br>مەلا یووسف زڤنگی |
| شرۆڤەکرن | مەلا ئەحمەد زڤنگی |
| ڤەوژارتن و بەرهەڤکرن | د. فاخر حەسەن گولی |
| چاپ | ئێکێ/ ٢٠٢٢ |
| دیزاین | دیـــار عــبــدالله |
| بەرگ | جەگەرخوین جەمیل<br>وارهێل عبدالباقی |
| ISBN | 978-9922-661-06-3 |
| ژمارا سپاردنێ | D- / ٢٦٦٩ / ٢١ |



Zakho Centre
for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەکۆلینێن کوردی

zcks@uoz.edu.krd +964 750 471 0863
Iraq- Kurdistan region, Zakho- Univesity of zakho

## پێشەکی

دەمێ مرۆڤ ژیاننامەیا مەزنە زانایێن ئایینی یێن کوردان دخوینیت، چەند خالێن گرنگ مینا: چاوانی و جهێ خواندن و ماموستایێن ئەوان دیار و ئاشکرا دبن، ب ئەڤێ چەندێ پێزانین باش بدەستڤە دهێن. واتە پشکەکا باش ژ دیرۆکا زانستیا سەردەمێ ئەوان بۆ ڤەکۆلەران بەرچاڤ دبیت. (مەلا یووسف زڤنگی) ئێکە ژ ئەوان زانایێن مەزنێن کورد کو تەڤایا ژیێ خوە د بیاڤێ زانین و زانستێن ئیسلامیدا تەرخان کربوو. ب نڤیسینا پەرتووکێن د بیاڤێن جوراجوردا جهێ خوە د ناڤ مەزنە زانایێن ئایینیدا کریە، ژلایەکێ دیترڤە ب نڤیسینا هەلبەستێن ب هەر سێ زمانێن کوردی و عەرەبی و تورکی زەنگینیەك بەرچاڤ ئێخستیە تورەڤانیا هەر سێ زمانان ب تایبەتی د زمانی کوردیدا. د ئەڤێ پێشەکییێدا هەوڵ هاتیەدان ژیاننامەیا هەلبەستڤانی ژلایێ جڤاکی و رەوشەنبیری و ئایینی و گرنگترین تیبینیان ل سەر دیوانێ بەرچاڤ بکەین. داکو ب ئەڤێ چەندێ پێزانینێن زێدەتر بگەهنە خواندەڤانان.

### هەلبەستڤان ژ لایی جڤاکیڤە:

مەلا یووسف کوڕێ حەسەنێ کوڕێ عوسمانێ کوڕێ عەلیێ کوڕێ حەسەنێ کوڕێ عەلی ئیسڤا ناڤدار ب (مەلا یووسفی زڤنگی)، ل سالا (١٩٠٧)ێ، ل گوندێ زڤنگا (حاجی عەلیا) ئەوا دکەڤیتە د چیایێ بوتاندا چاڤێن خوە ل دونیایێ ڤەکرینە، بابێ ئەوی ژ زەنگینێن گوندێ ناڤبری ژ هۆزا (ماسەکا) دهاتە هژمارتن، ئەوا بەشەکێ مەزنێ ئەوێ ل سەر دیانەتا ئێزیدیێن میترایی، زارۆکینیا خوە ل گوندێ خوە بوورااندیە. ناڤهاتی سەرەڕای ئەوێ چەندێ کو کەسایەتیێ ئایینی بوویە، ناڤداریا خوە یا جڤاکی ژی

هەبوویە و خودان پێگەهەکا مەزنا جڤاکی ل دەڤەرا خوە و دەوروبەران بوو. (مەلا یووسف)ی ژیارا هەڤژینیێ ل گەل خانمان (حەنیفا موحەمەد حەسەن فندکی و عەیشا عەلی حەمەدانی) پێکهینابوو، خودایێ مەزن هەشت کور (عەبدولڕەقیب، حەسەن، ئەحمەد، عەبدولعەزیز، واثق، جونەید، موحەمەد ئەمین و ئەزهەر) و چار کچ (ئوم کەلثوم، عەفیفە، حەلیمە و زەینەب) ب ئەوان بەخشی. ناڤبری ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٢/٢/٢٢)ێ، د ژیێ (٩٢) سالێیدا ل باژێڕێ (نسێبین)ێ، بۆ هەتاهەتایی ژ ئەڤێ جیهانێ بارکر.

**هەلبەستڤان ژلایێ زانستیڤە:**

(مەلا یووسف)ی خواندنا قورئانا پیرۆز هەتا (تەرکیبا) مەلا یوونسێ ئەرقوتەینی د (تەصریف)ێدا ل نک (مەلا سولەیمان هوسەری) ل گوندێ خوە خواندبوون. هەروەسا وانە ل دەڤ زانایێ مەزن (مەلا ئەحمەد مەلا موحەمەد زڤنگی) ئەوێ (دیوانا جزیری) شرۆڤەکری خواندیە.

(مەلا یووسف)ی ل دەڤ (مەلا یەحیا مەلا ئیسماعیل فندکی) خواندیە، هەتا کو ل گەل ئەوی چوویە دەمێ ئەوی ل نک زانایێ ناڤدار (مەلا عەبدوڵلا بدلیسی) ل باژێڕێ (عاموودا - ڕۆژئاڤا کوردستان)ێ وانە دخواند. هەروەسا د ئەوی دەمیدا گەلەك مەلایێن بژاردە ل (عاموود)ێ وانە دگۆتنە فەقیان ژ ئەوان (مەلا ئیسماعیل، مەلا فەتحوڵلا، مەلا عەبدوڵلەتیف و مەلا موحەمەد)، هەلبەستڤانێ ناڤدار (جەگەرخوین)ی، ل گەل (مەلا یووسفی زڤنگی) ل دەڤ (مەلا عوبەیدوڵلاهی) وانە د خواندن. (جەرگەرخوینی) ل وێرێ هەلبەستێن خوەیێن نەتەوەیی ڤەدهاندن، هەژی گۆتنێ کو ئەوی سەردەمی باژێڕێ (عامووددا) بنگەهـ و ناڤەندا زانین و زانستێ بوو. کو سەدان

فەقییێن کورد ل وێرێ وانه دخواندن و گەلەك ژ ئەوان بووینه زانایێن ناڤدار. دیرۆکا ئەوێ سالێ (١٩٢٣)ێ، هاتیه تەخمین کرن.

(مەلا یووسف) ل گەل هەڤالێ خوه (مەلا یەحیا)ی کو سەیدایێ ئەوی ژی بوو ئەوێ د ژیێ گەنجاتیا خوەدا مالئاڤایی کری چوونه خواندنگەها (ئەحمەدیێ) ئەوا دکەڤیت گوندێ مەزنێ (ئەحمەدیێ) ل سەر ڕوبیارێ دیجله ـ سنۆرێ ویلایەتا (مێردین)ێ، مفایەکێ باش ژ زانین و زانستێ زانایێ مەزن (شێخ کەمال)ی ژ دویندەها (شێخ خالدێ جزیری) وەرگرتیه، کو ئەو ئێك بوو ژ خەلیفێن (مەولانا خالدێ نەقشەبەندی)، ب کارێ وانەگۆتنێ ل خواندنگەها (ئەحمەدی)یه ڕادبوو. (شێخ سەیفەددین) برایێ (شێخ کەمال)ی ژی وانه ل خواندنگەها ناڤبری دگۆتن.

(مەلا یووسف زڤنگی) پەرتووکا (نتائج الافکار) ل دەڤ زانا (مەلا حوسێن بێرکەندی) خواندیه و پەراوێز ل سەر گەلەك پەرتووکێن ئەوی داینه. هەروەسا (سییوتی) ل سەر (ئەلفیا ـ ئیبن مالکی) ل نك (شێخ ئیبراهیم حەقی کوڕێ شێخ حوسەینێ باسرەتی ـ شێخ بوتان) ب داوی ئینایه. پەرتووکێن (کافیا) و (ئیساغوجی) یێن زانایێ بناڤودەنگ (مەلا خەلیل سێرتی) د (نەحو)ێدا ل گوندێ (جێلەکا) ل ناڤ (هارونا) ل دەڤەرا بوتان، پەرتووکا (شافیا) یا زانا (ئیبن حاج شەهرەزوری) و (عوسامەدین) د (وەضعی)دا ل دەڤ (مەلا ڕەمەزان جێلەکی) بابێ زانایێ مەزن (موحەمەد سەعید ڕەمەزان بۆتی) کو دانەرێ پەرتووکا (نور الیقینیه) وانه وەرگرتیه.

(مەلا یووسفی) ل دەڤ (مەلا ئەحمەد زڤنگی) شرۆڤەکەرێ (دیوانا مەلایێ جزیری) ل گوندێ (عندیوەرێ) مفا ژ وانەیێن ئەوی وەرگرتیه، لێ پشتی (مەلا ئەحمەد) ژ گوندی بەرەڤ سورییێڤە چووی. پەرتووکێن (شرح

الشمسى) د (مەنطقێ)دا و (شرح العقائد) يا (نەسەفى) ل دەڤ زانا (مەلا موحەمەد زڤنگیێ شکاکى) مەزنە زانایێ بوتان ئەوێ کو ل سالا (١٩٧١)ێ مالئاڤایى کرى خواندینە. هەردیسان ناڤهاتى زانستێ (فەرائض) ل نك (شێخ موحەمەد شێخ حەسەنێ فندکى) خواندیە. هەروەسا ب مەرەما بدەستڤەهینانا زانین و زانستێ سەرەدانا چەندین جهێن دیتر کریە و مفایەکى باش ژ زانستێ مەزنە زانایێن ئایینى وەرگرتیە. (مەلا یووسف) پشتى زەحمەتەکا زێدە ب مەرەما بدەستڤەهینانا زانستێن ئایینى، چەندین سالان مەلاتى و وانە داینە زانست دۆستان و ب سەدان فێرخوازێن زانستێن ئایینى مفا ژ زانستێ ئەوى وەرگرتینە. خەمسارى د بەلاڤکرنا خواندنێن ئیسلامیدا نەکریە.

**بەرهەمێن هەلبەستڤانى:**

(مەلا یووسفى) خودان زانستەکێ بلند بوو، لەورا سەرەڕاى مەلاتى و وانەگۆتنێ، ب نڤیسنا پەرتووکێن د بیاڤێن جوداجودا دا رابوویە و پێکهاتینە ژ:

١- (الفقة الاسلامي)، ب زمانێ عەرەبى، ژ سێ بەرگان پێکهاتیە، دوو بەرگێن ئەوێ هاتینە چاپکرن، یا دیار پێشەوازیەکا باش لێ هاتیە کرن.

٢- (الفوائد الماسكية)، ب زمانى عەرەبى و د بیاڤێ (ئایینى)دا هاتیە نڤیسین و هێشتا نەهاتیە چاپکرن و ژ (٣٨٥) بەرپەڕان پێکهاتیە.

٣- (العقائد)، ب زمانێ عەرەبى و د بوارێ (بیروباوەریان)دا ل سالا (١٩٦٢)ێ، د (١٧٦) بەرپەڕاندا ل گوندێ (گوران دەشت) هاتیە نڤیسین و چاپ نەبوویە.

٤ - (دیدار المأسى)، ب زمانێ عەرەبى و د بیاڤێ ئایینى یێن جوراوجوردا ل سالا (١٩٩٩)ێ، د (٤٧١) بەرپەڕاندا ل باژێرێ (نسێبینێ) هاتیە نڤیسین و تا نوکە نەهاتیە چاپکرن.

٥. (جدار العمال على سبيل سقات).

٦. (كشكول).

٧. (مسائل في التجويد).

٨. ديوانا هەلبەستان.

**مەلا ئەحمەد و شرۆڤەکرنا دیوانێ:**

ماموستا مەلا ئەحمەد کورێ زانا و هەلبەستڤان (مەلا یووسف زڤنگی) خودانێ ئەڤێ دیوانێ ل سالا (١٩٤٧)ێ، هاتیە ل سەر دونیایێ، هەر د ژیێ زارۆکینیا خوەدا دەست هاڤێتیە خواندنێ و ل گەلەك دەڤەرێن کوردستانێ فەقیاتی کریە، ل سالا (١٩٦٩)ێ، دەستویرنامەیا (ئیجازا) مەلاتیێ ل دەڤ زانا (مەلا بەدرەدین)ێ وەرگرتیە. ل سالا (١٩٧١)ێ ل گوندێ (خۆماریێ) ل دەڤەرا (سەرحەدێ) بوویە پیشنڤێژ و گۆتارخوین و دەست ب وانە گۆتنێ کریە و خودان چەندین فەقەهـ بوویە و پاشان چوویە دەڤەرا (جزیرا بوتان). ل گەل مەلاتیێ ب کاروبارێن کوردایەتی و وەلاتپارێزیێ ژی ڕادبوو. دناڤبەرا سالێن (١٩٨١-١٩٨٤)ێ پێنج جاران هاتبوو دەستەسەرکرن. تۆشی گەلەك جۆرێن ئەشکەنجەیێ ببوو. هەر ژبەر ئەڤێ چەندێ ل سالا (١٩٨٥)ێ ژ نەچاری بەرەڤ ئیرانێ ئاوارە بوو. ئێکسەر پەیوەندیێ ب ئێکەتیا زانایێن ئایینی کوردستانێ ل دەڤەرا مەرگەڤەر - زێوە کر. و دەست ب کارێ وانەگۆتنا فەقیان کر و سەرەڕای ئەڤێ چەندێ دناڤ ڕێزێن پارتی دیموکراتی کوردستان ببوو پێشمەرگە، پشتی سەرهلدانا بهارا سالا (١٩٩١)ێ، وەك گشت کوردان ڤەگەڕیا کوردستانێ و ل باژێرێ زاخۆ ئاکنجی بوو. ب کارێ پێشنڤێژی و گۆتارخوینیێ ڕابوو. هەروەسا پەرتووکەك ب ناڤونیشانێ (الفقة المنهجي) د سێ بەرگەیاندا د بیاڤی فقهیدا نڤیساندیە و ئامادەی چاپێ یە.

دیوانا بەردەست ب شرۆڤەکرنا (مەلا ئەحمەد)ی، زەنگینیەکا دیتر ئێخستیە بەرهەمی، ژبەر ئەوێ شەهرەزایا ناڤبری د هەر سێ زمانێن کوردی، عەرەبی و تورکیدا هەی ب سانەهی شیایە ب شێوەیەکێ مالك ب مالك و رێکوپێك ب شروڤەکرنا ئەوان رابیت. هەژی گۆتنێیە ئەڤێ چەندێ تێگەهشتنا وی بۆ خواندەڤانان سانەهی کریە. هەروەسا بۆ پتر رۆهنکرنێ (مەلا ئەحمەد) ئاماژە ب چەندین ئایەتێن قورئانا پیرۆز و فەرموودێن پێغەمبەرێ خودێ (س) کریە.

**چەند تیبینیین گرنگ ل سەر دیوانێ:**

ئەڤ دیوانە مینا گشت دیوانێن دیتر چەند تیبینیێن گرنگ ب خوەڤە دگریت و ب ئەڤی شێوەیێ ل خوارێنە:

- ئەڤ دیوانە ل دویڤ شێوازێ کلاسیکا کەڤن و ب هەر سێ زمانێن (کوردی، عەرەبی و تورکی)، لێ پرانیا ئەوان ب زمانێ کوردی هاتینە ڤەهاندن.
- ئەڤ دیوانە ل دویڤ رێکخستنا (مەلا یووسفی) هەلبەستڤانی ئەڤێ دیوانێ هاتیە ئامادەکرن.
- هەلبەستڤانی ژبۆ ڤەهاندنا هەلبەستێن ئەڤێ دیوانێ مفا ژ ناڤەرۆکا شەریعەتی و شرۆڤەکرنا قورئانا پیرۆز و هەروەسا ژ پەرتووکێن (بدیع الزمان - سەعید نورسی) و گەلەك فەرموودێن پێغەمبەری (س) وەرگرتیە.
- ئەڤ دیوانە یا پرە ژ پەیڤێن عەرەبی، تورکی و فارسی لێ پەیڤێن عەرەبی ژ هەمیان پترن ئەڤە ژبۆ کارتێکرنا ئایینی ل سەر هەلبەستڤانی دزڤریت.
- شێوازێ نڤیسینا ئەڤێ دیوانێ ب دەڤۆکا دەڤەرا (بوتان) هاتیە نڤیسین و هەر کەسێ ب هویرێ ئەڤێ دیوانێ بخوینیت دێ بۆ ئەوی رۆهن و ئاشکرا بیت.

- ژبەر نەبوونا ناڤونیشانێن هەلبەستێن دیوانێ، ناڤونیشانەکێ گونجای ژ ئێکەمین مالکا هەر هەلبەستەکێ هاتیە وەگرتن.

- ب هیچ ڕەنگەکی مە دەستکاریا ڕێنڤیسا هۆزانڤانی نەکریە، ب تنێ د ئەوان پەیڤاندا کو ب شاشیا ڕێنڤیسی دهێنە هژمارتن و کارتێکرنێ ل ڕیتم و واتایا هۆزانێ و چارچووڤێ گشتیێ ئەوێ ناکەت، ڕاستڤەکرن هاتینە ئەنجامدان، بۆ نموونە: (چو ـ چوو)، (بو ـ بوو)، (بو ـ بۆ) و... هتد.

ل داویێ دبێژین: سوپاسیا یەزدانی مەزن دکەین بۆ ئەو هێز و زانینا ب مە بەخشی، هەروەسا سوپاسیەکا تایبەت بۆ کوڕێ هەلبەستڤانی هێژا (مەلا ئەحمەد زڤنگی) و نەڤیێ ئەوی بەرێز (ڕەمەزان مەلا ئەحمەد زڤنگی) و هەر کەسێ دەستێ هاریکاریێ بۆ مە درێژکری دکەین، هیڤیدارم ئەڤ کارە ببێتە جهێ مفا وەرگرتنا گشت خواندەڤانان.

د. فاخر حەسەن گولی

دهۆك ٢٠٢١

# ماشاءالله خودا

(ماشاءالله) ژ مەصروفاتا خاندانا تە خودا
مەصرەفا مێهڤانێ رۆژێ هەر دزانیتن خودا[١]
عالەما گەوریا قۆلێر هەر دێ ل سەر سیفرا تەبێ
تم تەژی و تم بەلاشە هەر تەبارەك ژ تە خودا[٢]
باغێ دونیا سفرا عامێ هەم فیلمێ باغێ ئادەم
ل جەلوەیا صونعێ بنێرە موعجیز و تۆررا خودا[٣]
سەبزەخانا عالەما تە ما قەپالی چار چیە
شیبی طۆبا ل دەرێ هەر کەس ل هەمی ئەرضێ خودا[٤]



[١] ڤیان یا خودایە، ژ خەرجکرنا خانەدانا تە خودا، ب کوردی دبێژن: فلان کەس خودان خانەدانە، خان شوونا حەواندنا مێهڤانا و بازرگانایە، دان و دائییێن خارنا بەلاشە، خەرجا مێهڤانێن خوە دێ یێن رۆژێ هەر خودێ د زانێ چەندن.

[٢] هەر تشتێ ژبلی خودێ ژێرا دبێژن: عالەم، عالەما خودانێ گەوریا قولێر قرکا کون. هەمی رۆژ و شەڤ ل سەر سفرا خودێنە، سفرا خودێ ژی هەر تەژیە و هەر بەلاشە، مەزناهی هەر بۆ تەیە خودا.

[٣] باغ و بیستانێ دونیایێ سفرەك گشتییە فیلمێ بیستانێ باڤێ مرۆڤایە ئادەم، ل رندیا ئافەراندنا وی بنێرە تێ ببینی کەس نکارێ وەسا چێکێ، ئەو تۆررا کو تایبەت ب خوداڤە ل سەر هەمیێ هەیە، وەکە توورا پادشاهی، هەمی بریار ددە دبێژە: ئەز دەست چێکەرێ تەمە.

[٤] (سەبز) پەیڤەکا تورکیە ب کوردی دبێژنێ: شینکاتی، جهێ شینکاتیا عالەما تە ماوەکە چار چیا سەرگرتیە، بەلکی ژ وێ مەزنترە، وەکە دارا تۆبایە. دارا تۆبایێ دارا

بۆخچـــەیـــێ ســـێڤ و زەردەل و تـــری و هنـــار و هلویـــان

تـــە ب ڤـــێ خـــەمـــلا بـــەدیـــع دا (ماشـــاءالله) تـــو خـــودا[1]

ب لیســـانێ حـــال دبێـــژن: ســـەحـــکـــە گـــەر صـــاحیب دلـــی

طـــەیبـــاتن مـــن ب خـــۆ لـــێ ب شـــۆلێ صـــالح بـــۆ خـــودا[2]

ئـــەز کـــەمـــەر بـــەســـتێ ئـــەمـــرم ڕوحـــێ شـــیرین ژ تـــەڕا

ئـــەم بـــەنـــی ئـــادەمـــی نیـــنن تـــەســـلیمی ئـــەمـــرێ خـــودا[3]

بـــۆ تـــە هـــاش و پـــۆڕ بـــەشاشـــن دەڤ لێکـــەن نازیـــك و تـــەڕ

ژ دەســـتێ قـــودەرت بـــۆ تـــە هـــاتم مـــن ب خـــوە ب نـــاڤێ خـــودا[4]

---

بحەشتێیە کو کا وێ ل ژۆرە و چەڤێن وێ ل ژێرن، هەمی ڕەنگێن فێقی پێڤە هەنە، ئەڤ داینا خودا ل بەر دەرێ هەر کەسی و ل هەمی عەردایە خودا.

(١) بەخچەیێن سێف و زردەلە (مژمژ) و تری و هەنار و هلو(خوخ) ئەڤێن هەنە، تە بڤێ خەملا هەیا غەریب دا ئەو ئافەراندنە، چاوا تە دڤێت تو خودایێ.

(٢) ب زمانێ حال ئەڤێن هە دبێژن: سەحبکە گوهـ لێبە ب بهیزە، هەکە تو خودان دلی و زانایێ ئەم پاکن من ب خوە لێ شول و کارێن بۆ خودا دکن بلا چاکبن، ژ گونەها دوور بکەڤە.

(٣) ئەو فێکی ب زمانێ حالێ خوە دبێژێ: ئەز کەمەر بەستیێ فەرمانێمە. هەر دوو دەست چاخێ مرۆڤ دانین سەر هەڤ دبێژن: کەمەر بەستەیە. ل بەر ڕاوستیایە. دبێژێ: ڕوحێ من یێ شیرین ژ تەڕایە. دبێژن: ئەم نە مرۆڤن ئەم سەرپێچیێ بکن، ئەم تەسلیمی فەرمانا خودانە ب زمانێ حال ئەڤێن هە دبێژن: سەحبکە گوهـ لێبە ب بهیزە، هەکە تو خودان دلی و زانایێ. ئەم پاکن من ب خوە لێ شول و کارێن بۆ خودا دکین بلا چاکبن، ژ گونەها دوور بکەڤە.

(٤) ژ تەڕە ئەم بەشاشن. بەشاشاندن کەنیێ هێدیکایە. لێڤێ مرۆڤ ژ سەر هەڤ ڕابن دبێژن: بەشاشاندن. قاسدێ خودێ سلاڤ لێبن تم د بەششی (عرب دبێژن: تەبەسوم) دەڤێ مە بکەنە ئو نازکن و تەڕن. ژ دەستێ قودرەتا خودێ بۆ تە هاتم من ب خوە لێ بناڤێ خودێ بینە (بسم الله الرحمن الرحیم).

ئەز ژ ماكم پۆڕ عەزیزم (نەخل و باسیق) ل ژۆره مێو
ئەم پەیالێن ژ شەڕابێ دۆڕ و مەرجان ژ خودا[١]

ئەم گەهان حەدێ كەمالێ "شەكەر و ریزقێ حەسەن"
مە ب سیككینێ قەصابی ب قۆڕیف ئەهلێ خودا[٢]

من بكە قوەتێ طاعەت ژ تە داخاز مە ئەڤە
نەبە تەضیعێ ئەمانەت شەرمەزارن ژ خودا[٣]

(ماشاءالله لا قوة الا بالله تقول)
(اذ دخلت جنتك) لا ما تبید أبدا[٤]

خارنا بێ كێش و پیڤان نك كەسێ پەیدا نەبوو
عالەمێ بێسلی خودان دكی بێ پاره ژ دەست تە خودا[٥]

زاهدان هندك هلانین ژ حەلال و لەذەتێ
ژبەر عەذاب و بەر حیسابێ من زكێ برچیێ خودا[٦]

---

[١] ماكا من گەلەك باشە خۆڕمەیە و ل ژۆرێ مێوا تریە. ئەم پەیالێن ژ ڤەخارنێ دوڕ و مەرجان ژ خودانە.

[٢] ئەم گهانە ئاخرێ باشیێ، شەكر و ڕزقێ چاك. مە ب كێرا قەسابا ب قۆرێفە. ژێكە یا ئەهلێ خودێ.

[٣] ئەو فێقی و خارن دبێژن: داخوازا مە ژ تە هەیە ژبۆ هێزا پەرستنێ مە ب خوە، نە ژبۆ كەیف و شەهوەتێ مە ب خوە. ڤێ ئەمانەتێ بەردای نەكە ئەم ژ خودا شەرم دكن.

[٤] چاخێ تۆ چووی ناڤ بیستانێ خوە بێژە: ئەوا خودا بڤێت وەسایە هاریكار نینە ژبل خودێ، ئەو بیستان وەكە خوە بەدل نا بە، ناییێ گوهەڕین.

[٥] خارنا بێ كێشان و پیڤان لبا كەسەكی پەیدا نابت، ژبل خودا ڤێ عالەما هە هەمیێ خودان و قەلەو دكێ بێ پاره. ب دەستێ خودا تێتە خودان كرن.

[٦] زاهد ئەون ژ واره دنیا نە پێویستە و خارنا وا كێمە و تاعەتێ وا پرە، چاكێن خودانە هندەك ژ حەلال و لەزەتێ ژ دینی ڕادكن ژبەر عەزاب و پرسیارا حیسابێ.

جیـل قـەتـین و نـاخۆری تـە ماسـكانی بـەر دەرێ تـە

تۆڕ ل پشتێ كەشكۆل د بەر سینگ دیسا هات یا خودا[١]



[١] شاعر دبێژێ: خوەینان خوەر جل قەتین ناڤ ددە. یا خودا ئەڤە ئەوە یێ نان دخوێ و جلا د قەتینێ كو ژ عەشیرا ماسەكا یە ڤایە ل بەر دەریێ تەیە تۆڕ ل سەر پشتا وی یە و كەشكولا كو خارنێ تێخن تێدە ل بەر سینگا وی یە، دیسان هات ل بەر دەریێ تە داخوازا لێبوورتنێ دكە یا خودا.

# پۆڕ هەیبەت

ما تە فەیظ خۆشەب و ئابی بورج پۆڕ هەیبەت نەما

یا نە ئین دیجلە و فوڕاتن پاسیفیك نوقطەئێ ما[1]

کافرە یێ چوو قیاسێ ما سیوا وەك تە نەهن

ژ نوطفەیێ عالەمێ سوفلا ژ لوطفێ ئەرض و سەما[2]

ل هندکان نوّڕ و تەجلی ب شەمال فند و شەما

ل هندکا ئەو مژ و مۆرانە ظولمەتە و کوفر و عەما[3]

ڕەحمەك ژ دەریای چارەکێ ل بەندە بەڕائەت نامەکی

---

[1] شاعێر دبێژە: د پەسنا خودێدا. ما دانا تە وەکە ئاڤا بازارێ خۆشەبێیە کو بەردەوام د هەریکە و زەلالە، بازارێ خوشەبێ د کەڤێ ڕۆژهەتێ بازارێ وانێ د کەڤێ سەر ڕێکا گشتیێ یا دچێ جولەمێرگێ و ئیرانێ، بازارەك کەڤنە و دیروکیە و کەلهەك پڕ بلند و قاهم تێدا هەیە بورجێن وێ گەلەك قاهمن، ژلایێ سلێمان بەگ ڤە بورجا دەرێ هاتیە ئاڤاکرن، ناڤی وی ل سەر هاتیە نڤێساندن. هۆزا کوردێن مەحموودی تێدا دەستهەلات بوونە. یان ژی داناتە وەکە ئاڤا دیجلە و فوڕاتن، ئەڤ هەر دوو ڕووبارێن مەزن ژی ژ کوردستانێ دەردکەڤن و د هەرکن و درێژ دبن دگەهنە دەریا بەصرایێ ل کیشوەرێ عیراقێ دگەهن هەڤ. بەلکی دەریایێ باسفیك ژی دلۆپەك ژ دانا تەیە.

[2] کافر دبە ئەوێ قیاسا خودا ب سەر تشتەك دویڤە بکێ. [لیس کمثلە شیء] (الشوری: ١١) تو تشت وەکە خودانینە ژ دلۆپێ ژ ئاڤێ هەر تشت ئافراندیە [وجعلنا من الماء کل شيء حي] (الانبیاء: ٣)، عالەما ژێر ژ دلۆپێ چێکریە ژ چاکیا خوە عەدر و ئەسمان چێکریە.

[3] ل هندەك مرۆڤا ڕۆناهیا خوە سەر وا دە باراندیە وەکە فند و شەمالکێ کو باوەرمەندن ل هندەکا ژی مژ و تاڕیتی و مۆران باراندیە ئەو ژی گومڕەهیە و کوراتیا قەلبە.

ئیحسان بکە ژ ڤێ دەرنکی سەر من سبکە مەحکەما[١]

یێ تەمە یێ کەس نەهەم عوذرم حەماقەت زێدە بووم

سپارەیێ نەفسێ کرم ژ من ڕا موداقع قەت نەما[٢]

مەعرەض عەرضا ئەمانەت "ب ظولم و جەهلا مە تە نەهی"

ب ضوعفا "خلقی" مە نزانی" لاتحملنا" مە ما[٣]

سالیها ئیبلیس ژ ڕاهێ حەق دەرانین و وەیلێ ما

"لیتوب الله علی ال" موعتەمیدا مە نك تە ما[٤]

سۆنجەلینە بێ سەرمایەنە دەستێ مە هەر ڕابەر تەنە

عەفو و فەضل هینگامەنە ئازاد ببن کی بێژ چما[٥]

ئەز د طرسم ب دین و ئیمان تو نە نێری ل نفشا پاشی

ژ لەو مزوولن ئەو ب دونیایێ ژ بینا ئاپارتیما[١]

---

[١] ژ دەریا دلۆڤانیا خوە بەرائەتی ژبۆ بەندەئێ خوە ناما ئازادیێ جارەکێ دەرینە، ب ڤی ڕەنگی چاکیێ بۆ من بکە ل سەر من دادگەهێ سڤك بکێ.

[٢] شاعێر دبیژە: یا خودا ئەز یێ تە تەنێمە و بەس کێماسیا من ئەز زێدە نەزانم تە ژی ئەز سپارتم نەفسێ کو نەیارە ئەز مام بێ بەرگێری ژێکرن.

[٣] د پێشەنگەها داخوازنامێد یا ئەمانەتیێ، خودا گۆتیە: [انه کان ظلوما جهولا] (الاحزاب: ٧٢)، ئینسان گەلەك ستەمکارە و نەزانە. مە نەزانی چێکرنا مە چەند زەعیفە "وخلق الانسان ضعیفا" (النساء: ٢٨) مە شیان نەمایە. مرۆڤ ژار هاتیە ئافڕاندن.

[٤] ب سالآیە ئیبلیس ئەم ژ ڕێیا ڕاست دەرانی و وەیل ژ مەڕە. باوەریا مە لبا تە مایە کو تە گۆتیە: [لیتوب الله علی المؤمنین] (الاحزاب: ٧)، ئەز د ڤێ باوەرییێدا مە خودا ل باوەرمەندا دبوورە و ژوڤانیا وا پەسەند دکە.

[٥] سووچ پەیڤەك تورکیە، گونەهبارم من چو سەمیان نینە لێ دەستێ مە هەر ڕابەرێ تەنە. ژبۆ ئازادیێ. لێ ب هوورتنا تە و چاکیێن تە مەزنن. هەکە ئەم بێنە ئازادکرن ما کی هەیە بێژێ چما هاتە ئازادکرن.

(معرضـــــــين كـــــــأنهم حمــــــــر مســــــــتنفرة

فـــرت مـــن قســـورة) هـــذا لمـــن رب الســـماء[2]



---

[1] ئەز ژ نفشا پاشی ئەوێن هێژتا وەرن د ترسم تو ب دین و ئیمان ل وان نە نێری ژبەر کو هەر مژوولن ب چێکرنا ئاڤاهیێن بەرز و بلند.

[2] ژ حەقیقەتێ و راستیێ د رەڤن وەکە چاوا گوهدرێژ (کەر) ژبەر شێر د رەڤن. ئەڤا هە ترسا منە یا رەبێ عەزمانا. قورئان و ئیمان وەکە شێرن مرۆڤێ نەزان وەکە کەرێیە (گوهـ درێژ). [كأنهم حمر مستنفرة فرت من قسورة] (النحل: ١٦).

# چ مزگینه یاڕەب

خودا گۆت: ل من بگەرە عەبدم بەسم گەر تو ببینی من
هەمی تشت ژ تەنە ل نك من چ مزگینە ژ تە یاڕەب[1]
مە فەخرە تو خودایێ مە ب تەوحید و ب قورئانێ
مە عالەم چاڤ ل دەستێ تە ب قەنجی ناسی تو یاڕەب[2]
دەما دەم هەر زەمان عەفوێ دخازن ئەم ژ تە یاڕەب
دبن بارێ گونەهاندا زەبوون قۆفکن یاڕەب[3]
ل مە بی چارە و بەلەنگازا نەکی شەفقەت خەبات کانێ
بێ غایەت تو شوکورداری ژ مە هندك ژ تە گەلەك یاڕەب[1]

---

[1] خودا دبێژە کولەیێ خوە من ناس بکە ل من بگەرە، ئەز بەسی تەمە هەکە تو بوەریێ ب من بینی ژ ڤێ هاتێ هزرا شاعێری تێتە زانین و ئەم دبینن [ان تنصروا الله ينصركم] (محمد: ٧) ب کوردی یانی هات ژ ئاسمانا هات، د ئاڤێستا زەرەدەشتدا ژ ئایەت ڕە دبێژێ هات، خودا دبێژە: هەمی هەیێن بۆ تەنە ژلایێ من ڤە. ئەڤ مزگینەك خۆشە یا ڕەب. خودا دبێژە: [هو الذى خلق لكم ما في الارض جميعا] (البصر: ٢٩).

[2] ئەم پێ سەر بلندن کو تو خودانێ مەیی ب باوەریێ و قورئانێ. عالەم هەمی چاڤ ل دەستێ تەیە تو ب چاکیێ هاتی ناس کرن. یا خودا. خودا دبێژە: [قل من يرزقكم من السماوات و الارض قل الله] (سبأ: ٢٤). هەر وەسا جارەکا دی دبێژە: [هل من خالق غير الله يرزقكم من السماء والارض] (فاطر: ٣)، خودانکرن هەر ژلایێ تەیە یا خودا.

[3] هەروهەر هەمی چاخ و هەمی وەختا ئەم لێبووریێ ژ تە دخوازن یا خودا وەکە قاسدێ خوەدێ فەرمانێ دکە [انك عفو تحب العفو فعفو عني] تو عەفوی حەژ عەفویێ دکی تو من عەفو بکە. یا خودا پشتا من بوویە قوفك یانی پشتا من چەمایە دبن وی بارێ گونەهاندا ئەز ژار بۆ مە یاخودا.

ژ بچووکـان هـەر قوصورڕ یـا ڕەب ژ مـەزنـان هـەر عـەفـو یـاڕەب
گونـەهکـاران دەمـا دەم چـاڤ ل ئـازادی ژ تـە یـاڕەب[٢]
ژ گونـەهـان مـە تـەژی دەفتـەر ژ خێـر و قـەنجیـێ بـێ بـەهـر
مـە ویڕانـی عـومر چـوو دەر ل نـك تـە بـێ رویـن یـاڕەب[٣]
ژ گونـەهـێن ڕەش برینـا ڕەش تـو دەرمانكـە نـەمیـنن ڕوو ڕەش
مـە نـە صـۆژی ژ وێ دووژێ ب دەسـتێ مـە بگـرە یـاڕەب[٤]
نـەهـن بـاوەر ژ مـن جـارەك دلـێ تـە ل مـن ڤـەبـت جـارەك
پـەشـیمانم ژ ڕەحمـا خـۆ مـە بـێ هیڤـی نـەكـە یـاڕەب[٥]

---

[١] مرۆڤ چاخێ گازندا ژ وەختێ خوە بکە دبێژە: وەی لەمنێ شاعێر دبێژە: ل مە كەسێن بێ دەست هەلات و بەلەنگاز دلوڤانیێ نەكێ خەباتا مە یا ئاخرەتێ كێمە ئەم ب وێ ڕزگار نابن، تو گەلەك تەشكورا بەندەیێ خوە دكێ ژ مە خەباتەكا هندەك ژ تە دلوڤانیەك گەلەك یا خودا.

[٢] كێماسیی هەر ژبۆ بچووك و كێما پەیدا دبە بەرابەدوێدە لێ بهورتن ژ مەزنا چێدبە یا خودا، تم و تم سوچەدار چاڤێت وێ ل ئازادیێە ژلایێ تەڤە یا ڕەب. مرۆڤا دوو دەفتەر هەنە یەك چاكێن وی تێدە تێنە نڤیساندن. یا دی یا گونەهایە گەنەهـ تێدا تێنە نڤیساندن.

[٣] دەفتەرا مە یا گونەها تەژی بوویە، یا چاكیا ڤالایە خێر تێدە نینن بێ بەهرەنە ژ چاكیا عەمرێ مە ژیانا مە ب ویرانی بادل هەوا دووماهیێ پێ هاتیە ل با تە ئەز شەرمەزارم بێ ڕومەتم یا خودا.

[٤] چاكی وەكە سپیتاهییێە. گەنەهـ وەكە ڕەشاتیێ یە. جهێ گونەهێین ڕەش بوویە برینەك ڕەش هەكە تو خودا دەرمان نەكی ئەمێ بمینن ڕوو ڕەش د ڕۆژا قیامەتێدا، مە نە سوژە ب وێ دوژێ دوژەهـ (جهنم) ب دەستێ مە بگرە یا خودا هەوارا مە تو و دەستگیر ژی تو وی د مالكەكدیدا دبێژە: (بە ئازادی ببن دلخۆش مەدد خاهین ژ تە یا ڕەب).

[٥] باوەری ژ مـن نـە مایـە ژبەر وان گونـەهێن مـن كـرین كـو جارەكا دی دلـێ تـە ل مـن ڤەبیت لێ ئەز پووشمانم ژ وان گونەهێن من كرین ژ دلوڤانیا خوە من بێ هێڤی نەكە یا خودا [لاتقنطوا من رحمة الله ان الله یغفر الذنوب جمیعا] (الزمر: ٣٥).

هەمی جان و جەگەر ل من تەڤ بریندارن ژ گونەه یارەب

ژ دۆژەهـ و ئاگری یا ڕەب عەفوکی یووسفی یارەب[۱]

ڕوهێ یووسف بگر یا ڕەب ب کەمال و ڕندا ئیمانێ

د بن عالا موحەممەد بین ئەمان صەد ئەمان یارەب[۲]

مە گۆتن دۆڕ دیارینە ژ بوونا دوست و هەڤالان

مە هیڤی کو دوعایێن وان قەبوول کی بۆ مە تو یارەب[۳]

ژ شەبابی ئەز کەتم شاپێ ژ شەهوەتان ئەز کەتم داپێ

ڕەڤاند ژ من عەقلێ تەکلیفی ب جەهلەت سووجێ من یارەب[٤]

ژ دەست ڤان ئەز بریندارم ل نك كەس من نەهن دەرمان

ژ بل عەفوێ نەهن دەرمان دەخیلێ دەرگەهـم یارەب[٥]

(امل من فضل احسانه) و یا تۆبەك نەصوح ب من دی

(حبیب الله) مە مەهدەرکە تو ئزنا وی بدی یا ڕەب[۱]

---

[۱] ژبەر گونەهێن من کرین جان و جەگەرا من تەڤ بریندارە یا خودا ژ ئاگرێ دوژەهێ یووسفی ئازاد بکە یا خودا. ژ خوە ڕە دبێژن.

[۲] دیسا ناڤێ خوەتینە دبێژە: روهێ، گیانێ یووسف ب چاکی و ڕندیا قورئانێ و ئیمانێ مە بگرە مە بکە دبن عالا موحەممەد دا ڕۆژا قیامەتێ ئەمان صەد ئەمان یا خودا.

[۳] ئەڤ گۆتن و شیرەتین مە ژبۆ دوست و هەڤالان دیارینە هیڤیا من ئەوە وەکو تو دوعایێن وان بۆ من قەبوول بکی یا خودا.

[٤] ژبەر کو ئەز چاخێ لاوی تێدا بووم ئەز کەتم ناڤ شاپا گونەهادا، مرۆڤ د وی دەمیدا شەهوەت گەلەك خورتە مرۆڤ خوە ڕاناگری ژ وێ ئەز کەتم ناڤ داپا، داڤ ژ مووێ هەسپا چێدکن و مالك مالکە پێ پەڕاندا کەوا دگرن. دبێژێ کو ئەز کەتم داڤێن شەیتانی ڤەداین کو گونەهن عەقلێ ڕاست ژ من ڕەڤاندن بنە زانین ئەز تاوانبارم یا خودا.

[٥] ژ دەستێ ڤان ئەز بریندارم دەرمانێ من لایێ کەسێ نینە دەرمان لێ بۆ هرتنا تەیە ئەز دەخیلێ تەمە من خوە ئاڤێت دەرگاهێ تە یا خودا.

ڕەجا نام ئیستیغاثا من قەبوولکە حوسن و ظەنا من

ژ عالەم ذەرە (جز لایتجزأیم) پفم یاڕەب[٢]

عەقل هندك تە دا من دین نە چوو حەدێ کەمالاتێ

هەوائێ جانیێ ل من دا فەضل تە ژ من بڕی یاڕەب[٣]

ب فەضلا خۆ تو عەفوا من دەرێخی دێ چ بت یا ڕەب

غەنییێ تو ژ عەذابێ من ژ عالەم زەرەیم یاڕەب[٤]

"ولولا فضل الله" قورئان ب "یزکی من یشاء" ئیمان

ئیبراهیم ئەدهەمی گۆتە "أرید ما ترید" یاڕەب[٥]

مە هیڤی فەضڵ و ئیحسان بێ کوشایەم فیطڕەتا ئەوەل

تفضل سیدي بالعفو عني "مبتلا" یاڕەب[١]



---

[١] هێڤیا من ژ تە چاکی و قەنجییە یان ژی تەوبەکا نەسووحە ئەوا تێتە قەبوولکرن تو بدێ من. تو ئزنا خوەشتڤیێ خوە بدە کو ژ من ڕە ببی مەهدەرچی ڕۆژا ڕابوونێ یا خودا.

[٢] هێڤیا من و ناما من یا هەوارێ تو قەبوول بکە، هزرا من یا چاك ئەڤە دەربارە نیتەدا ژ عالمی ئەز زەڕرە مە. ڤە تە کم وەقاسی بچووکم کو ژ هەڤ نایێتە کەر کرن ئەز وەکو پفە کیمە و پفم یا خودا.

[٣] تە هشەك هندك دایە من ژبەر وێ من نەشیا ئایینێ خو کامل بکم کێماسی تێدە ما بایێ سەرپێچیێ ل من دا چاکی تە ژ من بر یا خودا.

[٤] ژ چاکیا خوە تو ل من ببوورە ما دێ چبت یا خودا. تو دەولەمەندی ژ سزادانا من، ژ عالەمێ ئەز زەرەك بچووکم یا خودا.

[٥] هەکە نە ب دانا تە و چاکیا تە بت و قورئانێدە پاکرن ب دەستێ تەیە ئەم ب ڤێ باوەرن [ولکن الله یزکی من یشاء والله سمیع علیم] (النور: ٣١). ئیبراهیمێ ئەدهم گۆت یا خودا تە بڤێت من ژی ئەو دڤێ. ئیبراهیم ئەدهەم گۆت: یا خودا ئەوا تە بڤێت من ژی ئەو دڤێ ئیبراهیم ئەدهەم وەلیەك ژ وەلییێن خودا بوو ژ وان ڕە دبێژن چاکێن خودا.

مەگەر مە سپارەیی نەفسێ بکی یەك (طرفة العین)

د گاڤێ رەم هیلاکێ ئەز ضەعیفم"قوینی" یارەب[٢]

"ترانـي أنـي مغلوب فهلا تنصر یارب"

اما ترحمنی فی خطفي "ولی المؤمنین" یارەب[٣]

مەدەدخاهم ژ دەرگاهەت ئیلاهی بێ کەس و کوسم

مە دەست کەشکۆل دەروێشان تو خالی ڕەد نەکی یارەب[٤]

---

[١] هێڤیا من ژ چاکی و قەنجیا تە هەیە من وەکە بەراهیکی تە ئەز ئافەراندیم لێ بکی ئەو چاخ یێ بێ گونەهێیە. کەرەمکە مەزنێ من بلێ بهورتنا من ئەز خودان بەلا بۆ مە یا خودا.

[٢] دبێژێ هەکە تو مە سپارەیی نەفسا مە یا غەدار بکی دچاڤ نوقاندنەکێدا د وێ گاڤێدا ئەزێ بچم هەلاکەتێ (رەم) یانی دچم، دەڤەرا مە دبێژن (رەم). ژبەر کو ئەز گەلەك ژارم تو من بهێز بکە یا خودا.

[٣] تو دبینی ئەز بندەستم و کەتیمە ما چاوا تو هاریکاریا من بکی یا خودا. چاوا تو دلوڤانیا خوە ل من بکە ئەز هاتیمە دەستەسەرکرن تو خودانێ باوەرمەندایی یا خودا.

[٤] ئەز ژ دەرگاهێ تە دخوازم تو ل هەوارا من بییێ بێ کەسم و بێ کوسم، د دەستێ مندا کەشکولا دەروێشا هەیە ئەز داخوازا دلوڤانیا تە دکم تو دەست ڤالە من نە ڤەگەڕینە یا خودا. بەرێ دەرویش هەبوون ل باژار و گوندا دگەڕهان بێ مال و حال بوون. کەشکولا وان هەبوو ژ چەرم هاتبوو چێکرن ب ملێ خوەڤەدکرن، خەلکێ خێرا خوە ئازوقە و خارن ددان وا ئەوا ژی هەمی بەرددان سەر هەڤ تێخستن د وێ کەشکولێدا و ژ خوە ڕە دبرن و دخارن.

# شەوق

ژ شەقێ من دەڤ بەسە بۆ من ژ تانگوان یەك كەڤنە ژن
ژ ئەتەك و سپانیا كەفەن ژ قەرەوانان من شەداد[١]

صەد هەوار مە ژ ڤی زەمانی مە چكر مە چ دەرانی
یا خودێ گۆت مە هلانی گۆهك بێژنك یەك صەڕاد[٢]

تە عومر چوو ل خۆ ب پرسە توبەكە ئەڤ چ تەحریصە
تو خلاس تاكی نە طرسە ئەی بەخیلێ بێ مراد[٣]



---

[١] شەوقە یان شەفقە - ١٩٢٥ قانونا شەفقێ ل كۆمارا تركیێ دەركەت. كەمال و هەڤالێن خوە بخورتی ب ڤێ نەڤێ كرن سەرێ گەلێ ترك و كوردا دە قانونەك پیس بۆ كوتەكی بوو، شەوقە پوزیكێ وێ درێژە تێت سەر چاڤێ مرۆڤ. من دەڤ بێ پوزكە وەك كۆمایە. شاعێر دبێژی من شەوقە ناڤێ من دەڤ بۆ من بەسە، وێ دەمێ ژنێن ئان كوژی ل كومارا تركی پەیدابوون ئەوێن نیف ڕووت و تازی. دبێژنێ ئەڤێن هەژی بۆ من نابن كەڤنە ژنەك بەسە بۆ من ئەتەك ئەو كراسێ سەر چوكێدایە سپانیو ژی پاتڕونێن دەلینگ فرەهن بەدەل واژی كەفەن بۆ من بەسە كەفەن جلا مریانە.

[٢] سەد جار هاوار د ڤێ چاخێ هەدا مە چی دیت مە چ ژێ دەرانی. ئەوا خودێ گۆتی مە ئەو ڕاكر مە گوهـ نەداێ مە گوهەك یێ كر سەرا د یەك ژی بێژنگ. سەراد ژ بێژەنگێ گرترە هەر دوو ژی كون و كونن ئاڤ خوە تێدە ناگرە ژ دار و چەرم چێدبن.

[٣] عەمرێ تە ڤایە ب دووماهی هات ل خۆ ب پرسە ژ كارێن نەباش ڤەگەرە و پووشمان ببە ئەڤە چیە تو هندە گرێدای ب دنێ ڤە. تو خەلاس ناكی نەترسە كو كەسێ خەلاس نەكریە یا ئەو كەسێ بێ مراد و بەخیل.

## قودرەتا قورئانێ

ژ قودرەت مە حەکیم قورئان بەسە ئەو بۆ هەمی دەردان

ل سەر وی ڕا نەهن دەرمانکە قورئان مە سەر بەختە[١]

دبینی حوکمێ قورئانی چقا کێمبوو د ئیسلامێ

مە قورئان نۆڕە لێ ئەما مە دەور کۆرە نە سەر وەختە[٢]

بگرِ قورئان ئەحادیثا ژ هەمیان ئەڤ بەسن دیسا

ل ئنجیلا نەبی عیسا لەنین و ماو نەنێر سوختە[٣]

بهش وەر فکرە قورئانێ ل ئایەتێن عەدل و ئێحسانێ

د عالەمدا تەرازوویەچی سوڵطانە ل سەر تەختە[٤]



---

(١) قورئان ژ قودرەتا خودێ بۆ مە نوژدار و حەکیمە ژبۆ هەمی دەرد و نەخۆشیان مەر هەمە. بەرێ حەکیما مەرهەم ژ دەرمانا بۆ بریتان چێدکرن، ژ وێ باشتر دەرمان نینن، کی قورئانا مە سەربەختە، بەختێ باش ئەوە.

(٢) دبینێ ڤی زەمانی حکمێ قورئانێ چ قاس کێم بوویە دناڤ موسلماناندا کار پێ نایێ کرن. قورئان ڕۆناهیە لێ خەلکێ ڤێ چاخا مە کورن نەسەر وەختن.

(٣) قورئان و حەدیسا ژ خوە ڕە بگرە ژ هەمی پەرتووکا ئەڤە بەسی تەنە. ئینجیلا نەبی عیسا و ل پەرتووکێن لنین و یێن ماوو تەماشە نەکە یا سوختە لەنین یێ ڕووسە قومونیستی ئانییە یێ دی ماوویێ چینیە ئەوی ژی هزرەك نەباش ئانی ناڤ چینێ [ان الله يأمر بالعدل والاحسان] (النحل: ٩٠).

(٤) ب هزر و بیرەك باش ل قورئانێ ب فکرە ل هاتنێ وێ یێن عدالەتێ وەکهەڤیێ ویێن چاکی، ئەڤە دناڤ عالەمێدە میزانیا وەك هەڤیێنە. قورئان وەك سولتانەکێ ل سەر تەختە. تەختێ عەدالەتێ.

د غەزواندا کو خارن کم دبوو دگۆت: سەیدێ عالەم

یێ مای بینن دێ تەڤ هەڤ کم یەك ڕوح و بەختە[1]

هەوالنامەی کتێب

---

[1] د چاخێ غەزوا دە خارن کێم د بوو یا هندەکا هەبوو یا هنا نەبوو قاسدێ خودێ دگۆتە هەڤالێن خوە کا چ خارنەك وە هەیە هەمی بینن جلەك ڕاست دکرن. هەمی خارن ڤالا دکرن ل سەر وێ جلێ یێن هنا زۆر بوو یێ هنا کێم بوو. جارەکا دی قاسدێ خودێ وەکە هەڤ لوا لەیڤا دکر، ئەڤە عدالەتا راست و درست.

# صەلات سەر موحەمەد (س)

بــۆ خــودا حــەمــدێ (یــوافی) ب هــەر زەمــان هــەر زمــان

هـەم صـەلاتـان سـەر موحـەممـەد ژ هنـدی عالـەم هـەر سـەحـەر[١]

هــەم ل ئــال و هــەم ل ئـەصـحـابێن گـۆزین شـیرین خــودا

هــەم ل شــەهیــد و عــالمین مــە وارثــێن (خیــر البشــر)[٢]

لازمــە قــەنــج ئــەم بــزانن یــێن بــۆ وان شــەهــدە ددن

کیـە (اللـە) کیـە موحـەممـەد ژێ بکـن بـەحـث و خـەبـەر[٣]

هـــەم بـــەیانـــات و نیظــامین دیــن و دونیــا ئــادەمــی

جاهێـل و ئــومی نــە مــنن هــین ژ کیتــابێ هــین ژبــەر[٤]

ســورەتــێ ئــیخلاص تــەلــەسـکۆپ جـامێ تـەوحیـدا خـودا

بـــی میثـــال تێـــرا دیـــارە بـــێ قیـــاس و بـــێ فکـــر[١]

---

[١] ژ خودا ڕابت حەمدەکێ پر زۆر سپاس، ب هەمی زمانان و هەمی چاخان هەروەسا باراندنا دلوڤانیێ ژی سەر موحەمەد بت ژ هەمی عالەمی ل هەمی سحاریا دە.

[٢] هەروەسا دلوڤانی ل سەر هەڤال و کەسێن ویدا ببارە، ئەوێن چووین شێرێن خودا بوون ژ دینێ وی ڕا، هەروەسا ببارن ل سەر شەهیدان و زانایێن مە کو میرات خورێ چاکترین مرۆڤایە کو موحەمەدە.

[٣] پێتڤیە و پێویستە ئەم باش بزانین کا ئەو کینە شەهدە ب وا تێتە تێ دایێن یەك ئەڵڵاهـ یەك موحەمەدە. مە د ڤێ ئەم ڤێ باخڤن، و ژێ خەبەر بدەن.

[٤] پێتڤیە ئایین و دونیا بێنە ڕۆنکرن و ئاشکرا کرن دا وە کو نەزان و نە خوەندەوار د ناڤا مسلمانا دە نەمینن هندەك ژ پەرتووکا فێرببن هندەك ژی ژبەر فیرببن. مسلمان نەزانینێ قەبوول ناکە.

ئـەی مـەژیـێ بـێ هـەیـن کـر مـەرکـەزا هنـدی هـەیـن
نـایێ مـا دلایـێ ل نـەفسـا خـۆ بنێـرِە هـەر سـەحـەر[٢]

صـانتیرِا لـو تـەلـەفزیـون تـەرەتـە تـەلسـیزە ئـەو
حـەرەکـە حسـە ئینتیظامـە ژ فابریقـا کـون تێتـەدەر[٣]

د نـەینکێـدا گـەر ببینـی مـادەلا رِادبـتن
خـەط و نـەقشـی کێشـایە لـەوحـێ تـو رِا سـولْطانێ ل سـەر[٤]

ژ دلـۆپێ چ مـرۆڤن ژ هـەوایـێ چ حـرۆڤن
ژ شـینی شـیرگیف و هنگیـڤ فیکـی و خۆرِمـە و تـرە[٥]

---

[١] سورتێ [قل هوالله احد] (اخلاص: ١) ناڤێ وێ سورەتێ ئیخلاس. خور و یەکیتیا خودایە چاخێ موشرکا ژ قاسدێ خودێ پرسین گۆت کابێژە خودایێ تە چیە و چاوایە و بنە توراوی چیە، خودا گۆت ژ وارە بێژە: [قل هوالله احد] ئەڤ سورەتە وەکە تلسکوپێیە یەکیتیا خـودا تیـرە دیـار دبـە، تلسـکوپ ئـەو دوربینـە ئـەزمان تـێ دە کەشـف دبـە، میکرسکوپ ئەو دووربینە یا زەررە بوون کو میکربێن هور تێدە خۆیا دکن شاعێر ئەڤ سورِەت شبهاندیە وانا.

[٢] خودا ئەڤ مەژیێ مرۆڤان کو گەلەك نازکە وەکە کەفکا بەحرێیە، کریە مەرکەزا هەمی هەبینێ هەمی تشت ب مە ژی ژ هەڤ دهێنە ڤەقەتاندن، ئەڤاهە نایێ مادلا کرن هەر رۆژ کو تورابی ژ خەوێ تەماشەی نەفسا خۆ بکە.

[٣] مەژیێ وەك سلنترا لا تەلوفلانا یە وەکە تەلەفزیونێیە وەکە تەرەتێیە هند تشت تێدا هەنە هەژاندن و لڤ ل ڤاندن و مونەزەم ئەڤا ژکارخانا گۆتنێن خودێ دەرکەتیە کو دبێژە [کن فیکون] (یس: ٨٢) چێبە چێدبە.

[٤] هەکە مرۆڤ تشتەکی د نەینکێدا ببینە هنگێ د بێ رِاستی مادەلا رِادبە، ئەو خزك و نەقش ل سەر هەمی تشتا کو هەنە وەکە تورا سلتانانە ئەڤ نیشانێن یەکیتیا خودانە. کو ئافراندەرێ وان بەس خودا بتەنێیە.

[٥] خودا ژ دلۆپەك ئاڤ ژ ناڤبەینا مێر و ژنێ مرۆڤ چێکرنە مەزناهیا خالق نابتە قیاس ب چ تشتاڤە. د پەرتووکا پیرۆزدا خودا دبێژە: [وانە خلق الزوجین الذکر و الانثی من نطفة اذا تمنی] (النجم: ٥٣). تیپ حروف ژ هەوایێ چێکرنە، و ئەڤ قاسی پەرتووك و

ئـەی طـەبیبـو ئـەی موهـەنـدس زانـاییێن ب ئاپـار و تـەشـریح

شـەڤ ڕەڤـوك ژ ژۆریێ چ زانیـت كـانێ چـاڤ كـا خـەبـەر[۱]

تـو ب ئـەوصـافێن كـەمـالی خـالقێ عالـەم بنـاس

ب وەصـفا ڕەحمـان و غـەفوری نـەبـە مـەغـرور بـێ خـەطـەر[۲]

نـا بـت شـەیطـانی مـە دی بێـت بێـژ ژینـا تـە ژ كـی

بێـژەیـێ عالـەم هـەمـی چێكـر ژ وی ئـەز یـەك ئـەثـەر[۳]

جـارەك دی دە بێـژە كـی ئـەو چێكـرە بـۆدی جـەواب

ب وی و ڕەسـۆلێ وی هـەیـە مـن بـاوەری هـەیـدێ تـو هـەر[۱]

---

نڤیساندن و زانین ژ ڤێ هەوا یێ چێكرنە مەزناهی یا وی یە. ژ تشتێن شین وەكە گەیا و دارا. چاخێ پەز گەیا دخوە دبە شیر دبە گڤ، چاخێ پەنیر تێتە چێكرن ئەو ئاڤا بن دكەڤێ جارەكا دی د كەلینن ناڤێ وێ گڤە، و لوركە، و شیری ژە. مێش ژ گول و گەیا ماددا وێ بەرهەڤدكە دبە هنگڤین (عسل) فیكی و خورمە و تری ئەڤە هەمی ژ شیناتیێ چێدبن.

[۱] یا ئەوێ دبێژە ئەز نوژدارم و موهەندسم و زانایێ كەڤنارامە و زانایێ كەرێن مرۆڤامە، كا د هەمبەری زانین و چیكرنا خوادە كا هوون چنە و زانینا هەوە چیە. شەڤ ڕەڤك چلێ چلێ، شەڤ شەوڤوك، كا چ ژ ڕۆژێ دزانە. نكارێ ڕۆژێ ببینە، مرۆڤ ژی ژ مەزناهیا خودا هەو قاس دزانە.

[۲] دبێژە تو خودا ناس بكە ب سیفاتێن تەمام، كامل، وەكەشیان، و ژیان دیتن و بهیستن د ئاخڤتن، زانین، هەرهەیە. وی هەر هەبیت، خودا ژ هەمی ئەو تشتێن كێماسی تێدە هەبت دوورە، د خودا دە تو تشتێت كیم و نوقسان نینە، دڤیا مرۆڤ تاعەت و عیبادەتێ خودا بكە پاشی هێڤیا دلوڤانیێ ژێ بكە. لێ هەما مرۆڤ بێژە خودا غفور و ڕەحیم و ڕەحمان، ژ خوە وەیە لێ دڤێت مرۆڤ ژی عەمەلەكێ بكە.

[۳] د بەر مرنێ دا و چاخێ سەلامەتێدا شەیتان تێن خوە نێزیكی مرۆڤ دكە دبێژە كێ تو چێكریێ بێژە ئەوێ ئەڤ عالەم هەمی چێكریێ ئەژی چێكرمە وێ بێژەكێ ئەو چێكریە تو بێژە من باوەری پێ هەیە هێدی تو هەرە.

(اسم تفصيل) ژ عەزازيل د قەضيا سەجدەئێ

بينەتار ديسا نەزانن طيفرى ويدا بووى نەر[2]

شرك و تەوحيد هەر دوو ضدن نا گەهين هەڤ تو جار

فاعبدالله ولا تشرك به مثقال ذر[3]

ئايا يێ (عبداللعين) بت قە دبت (عبدالمعين)

قەلب ژى قەلب دەركەڤيتن قالبێ ويران د بەكەر[4]

گەر دبێ ئەهلێ خودامە پاقژم ژ هەر تشت جودامە

لازمە ژێرا ب دەردێ مال و ملك جان و جەگەر[5]

ل سەيدێ عالەم بنێرە مەسكەنەت وى مەطلەبە

ژ طفرپيا دونيێ ڤەگەر زوو تفكە جەهلا ب فيتلوگەر[1]

---

[1] شەيتان تێنە وەسوەسيێ بۆ مرۆڤ چێدكە دبێژە كێ خودا چێكريە بوو وى بەرسڤ ئەڤە. من باوەرى ب ووى و رەسولێ وى هەيە هەيدێ پەيڤەك تركيە تو هەرە.

[2] وقال تعالى[قال ما منعك الا تسجد اذ امرتك قال انا خير منه خلقتني من نار وخلقته من طين] (الاعراف: ١٢). چاخێ خودا گۆتە مەلائيكەتا ژ ئادەم را هەرن سەجدە، شەيتانى گۆت ئەز ژ وى باشترم ئەز ژێرە ناچم سەجدە تە ئەز ژ ئاگر چێكرمە و ئەو ژ ئاخێ چێكريە بنە تورا ڤێژى نەزانين بۆ و خۆ مەزن كرن بوو سەر خوە چوون بوو. گۆت يا رەبى من بهێلە. خودا گۆت من تو هێلايى. ئەڤا هە ژى ژ وى رە وەسا بووێ مرۆڤان ژ رێكێ دەرينە.

[3] شرێكاتى بۆ خودا، و يەكيتيا خودا هەر دوو دژى هەڤن توجا ناگەهنە هەڤ دڤيا خودا تەنێ بێتە پەرستن هنگە ميسقالا زەررە شريكاتى ژێ را نينە.

[4] ما ئەوێ كولەبت بۆ شەيتانى مادبيێ كولەيێ خودا. يانى نابت قەلبێ مرۆڤ چاخى قەلب بت يانى نە صافبت قالبێ مرۆڤى ئەوێ وێران دبە وەكە كەرێ، يانى بێ فهم و نەزان دمينێ.

[5] هەكە تو بێژێ ئەز ئەهلێ خودا مە و ئەز چاكم و ژ هەمى گونەها پاكم و جودامە. وێ دەمێ پێدڤيە ل سەر هەمى ملێ خوە ملكێ خوە و جانێ خوە و جگەرا خوە د رێيا ويدا دەربدێ خودا دبێژە: [وجاهدوا باموالكم وانفسكم فى سبيل الله] (التوبە: ٤).

د تەحیاتێ سەلاما من ل سەر تە یا نەبی
سونەتا تە ژ من ب سەلامەت ڕەبی من شاهد ل سەر[٢]

دونیا (مهمل) ژ (هجاء همزة الوصلة صفة)
نوقطەیا فائا (فناء) دبن سهو سەهوا قەدەر[٣]

ب زمان مە ئەوە مەعبوود ب تیلێ مە ئەوە مەشهوود
چ دلە ڕاهبێ دونیێ وە چ زینارە کەمەر[٤]

من شوباند ئەرقەمێ سەر وێ لەقبو چوومە خۆرێ
زینهاری دنێ بین چ ژ هاو چ هنەر[٥]

نا بێن قەد ڕوو مەحەبەت حاجەتەك گەر مە هەیە
دنێ تەمثیلە توالەت وێ بزانە هن قەدەر[١]

---

[١] تەماشەی سەروەرێ عالم بکە موحەممەد مصتەفا. جهێ دانیشتنا وی ژدونیایێ داخوازا وی بوو. تو ژ کوباری تفریا دنێ ڤەگەرە تفی بکە وێ نەزانینا نە ڕاست و بفەتلو گەر.

[٢] چاخێ مرۆڤ دنڤێژێدا تەحیاتێ دخوینە مرۆڤ دبێژە: (السلام عليك ايها النبي) ڕێکا تە ژ من را ب سەلامەتە ئەز ل سەر وێ بم خودایێ من ل سەر ڤێ شاهد بت.

[٣] ئەڤ دونیا کو ژ تەرە نابێتە وەکە سەیدا مەلا سەعیدێ کورد دبێژە: بێ فەیدەیە و موهمەلە. ژ حروفێن هیجا دڤێت وەکە هەمزا وەسلێ بت. دونیا ژی د ڤێ مرۆڤی بگەهینێ ئاخرەتێ، فەنا و نوقتا فائێ واتا وێ نەمانە ئەڤە دبن سهو سەهوا ئەجل دایە، ئەم هەمی و عالەم هەمی دێ ژ ڤێ دنێ ڤەنابن و بچن بۆ ئاخرەتێ.

[٤] ب زمانێ خۆ ئەم دبێژن [اياك نعبدو واياك نستعين] (القاتحه: ٥) ب تليا خوە يا شەهدێ ئەم دبێژن: (اشهد أن لا اله الا الله واشهد أن محمدا رسول الله) نە خوە ئەڤ چ دلە ڕاهبێ دونیایێ و وێ د حەبینێ، ئەڤ چ زنارە تە کریە پشتك، تە خوە ژێرە چ کوراندیە.

[٥] من دونیا دیت تشتەکێ هەشین وەکە داراسەروێ، سەروە جورەك یێ دارا سنوبەرێیە، بەژنا وێ گەلەك ڕندە. ئەز ژێرە چوومە قەبوو. کەو دبێژە قەب قەب، چاخێ شەڕی ب هەڤالێن خورە دکن. مرۆڤێ چاخێ گۆشتیانێ دکن دبێژن قەبووا تە. یان ژ تە ڕا قەبوو، ئەز ژێرە خوریم، قەبوو خور، خوە ژ دنێ ڤەدە هایێ تە ژتە هەبە خوە تێکلنەکە، چ ئەژدەهایە چ هنەرە، ئەژدەها ماڕێ مەزنە

وەیلیـــان ل وەحیـــێ نـــە نێـــڕین بـــۆ خـــۆ مـــال دیتـــین ئـــەبـــەد
ئـــاتی (فـــي الـــدنیا) دوعانـــە (حطمـــت) کرنـــە مـــەقـــەر[٢]

بکـــە تـــەوبـــێ تـــو ژ ظـــولم و ژ حـــەرام پـــاقژ و پـــاك
دێ نـــەبێـــژی ئـــەز مریـــدم یـــێ د دەســـت دا دارێ شـــەر[٣]

تـــو نـــەبـــە ثـــەعلـــەبـــێ مـــەغـــرور وەرە تـــەوبـــێ ژ نیفـــاقێ
دنـــێ ناســـکە ب دەواقـــێ نـــە ب گۆهـــەر نـــە گۆهـــەر[٤]

عاشـــقێ مـــال و حـــەیـــاتێ ئـــەوە عـــەبـــدێ ڕۆژ و وەقتـــان
هـــەر فـــەواتـــەك صـــەد وەفاتـــەك ئـــەمـــەل صـــەد ئاهـــ کـــەســـەر[٥]

---

(١) بێ دونیا نابە بەلێ قەدرێ وێ و حەژێکرنا وێ د ڤێ نە بت، ژبەر کو حاجەتەك مە پێ هەیە، دونیا وەکە تووالەتێ حەساب بکە تووالەت حەوجەیی پێ هەیە، نەزێدەتر.

(٢) ئەوێن دەربارەی وا دە خودا سورەتێ [ویل لکل همزة لمزة] (الهمزه: ١) ژێکری ئەوان ل گۆتنێن خودێ نە نێرین ژ خوە ڕە مال دیتن تشتەك ئەبەدی گۆتن یا ڕەبی د دونیایێ دە بدەمە مە ئاخرەت ناڤێ، ژبەر وێ ڤە خودا دبێژە مە حوتمەت دایە وا یانی دوژەهە مەقەرێ و بارەگاها وا ئەوە

(٣) ژ کوتەکی و ستەمکارێ و حەرامی توبە بکە پاقژ و پاك بە، ئەو کەسێ شەڕ کەر بت و د دەستێ وی دە هەر تم دارێ شەڕی هەبت د ڤێ نەبیژێ ئەز مریدم و توبەدارم.

(٤) تو نە ب فەتلوگەر بەوەکە ڕویڤی خاپینوك و سەرخوەنەچە، وەرە توبە بکە ژ گونەهێ خوە ڤەگەرە و تو ژ منافقیێ و دوڕوتیێ ڤەگەرە و نەکە. دونیایێ ناس بکە ب دەواقن یانی تەجروبێ. دەوقاندن پەیڤەکا کوردیا ڕەسەنە. چاخێ ب هێکا دلەیستن دگۆتن کا ئەز هێکا خۆە بدەوقێنم ل ددانێ خوە ددان. ڕۆژێن جەژنا بەرێ هێك د کەلاندن و ڕەنگ دکرن و ددان وا یێن ل جەژنێ د گەڕهان، ئەو ژی پێ دلەیستن. لێك ددان کیژان بشکەستا دگەهاێیدی.

(٥) ئەو کەسێ ڤیانا وی مال و ژیان بت ژ ڤێ دنێ ئەوە کولێ ڕۆژو شەڤ و چاخان. هەر تشتەك ژێ دەرباس ببت ب دەستڤە نەیینێ سەد جارا وەکە مرنێیە ژێرا. یەك داخوازا وی پێك نەیێ، سەد ئاهـ و کەسەرا ژێرا دخۆت.

د بـــابێ ڕزقـــدا ڕزق نیڤچـــه تـــو بگـــر ســـونەت ئـــەوە

مـــالێ زێـده د دەســت نـەزانـا ئـەژدەهـاکێ ڕوح چـەکـەر[١]

ب خــۆ قرۆاشــێ دنــێ مــال تــو نــه خــۆ ئــەو تــه د خــۆ

چ حــورەیشــه نــەکــوژی دێ ب حــورەیشــێ تــه ســەقــەر[٢]

حرصــێ بــاقێ کــه قــەناعــەت دەســت نــه ئــاڤێژە حــەرام

ڕاســت و ڕێ دا تــو بچــی بــال وی خــودایێ موقتــەدەر[٣]

زکــێ حرصــێ شــبی دوژێ قــەدهبــت تیــر و تــژی

قیـر نـەعـرەیـەك ژ (هـل مـن مزیـد) دێ پـاری بـت ڕۆژ و قـەمـەر[٤]

دارا ژ قـــەومـــێ طعـــامێ ئـــوردوا ئیبلـــیس د دوژێ

د دنــێ پــارەیــن حــەرامــه ژ حــەڕ ز قــەوم کــەســەك زەر[١]

---

[١] دەربـارەیێ ڕزقـدا یـا بـاش ڕزقـێ ناڤەندیـە، نـە گـەلـەك مالـدار و نـە گـەلـەك خیـزان بـت، سونەتا قاسدێ خودێ ژی ئـەوە. ژبـەر کو مـالێ زێـده دەستێ مرۆڤـێ نـە زانـده ژێـرە بەلایـە نەخۆشیە وەکە مارەك مەزنە کو ژێرە دبێژن ئەژدەها رحێ مرۆڤی دەرتینە. مال بۆ مرۆڤی کو د ڕێکا چاکیا دە خەرج بکە گەلەك باشە.

[٢] شیرەتا دکی دبێژی: یا ئەو کەسێ کو قەرواشێ دونیاێیە ئەو مالێ تە کۆمکری بخوە و چاکیان پێ بکە هەکە تو دل نەهێلێ بخوەی ئەوێ تە بخوە. یانی تو وێ بمرێ بچێ ئەڤە ئـەوی تـو خـاری (قـەرواش) پەیڤـەکا کوردیـا ڕەسـەنە لایـێ غـەرزا و وەلاتـێ ژۆری ب کـار تیـنن شـوونا خـولام و خزمـەت چیـدا. مـال چ مـارەکێ پێڤـەدانێ یـە هەکـە تـە نـە کوژی دێ ببە مارێ تە دۆژەهە. ژبەر کو تە چاکی پێ نەکرنە دبە عـەزاب، دبن مارتێنـە تە.

[٣] ڤیانـا دنـێ و مکوراتیـا سـەر باڤێژە قەناعەتێ بۆ یـێ خـودا دایـی تـە بێنـە دەستێ خـوە نـە ئاڤێژە حەرامی، دا تو ڕاستە ڕاست بچی بگەهی خودێ ئەوێ کو خودان شیانە.

[٤] ئەو زکێ حرس تێدابـە وەکـە دۆژەهێیـە توجـارا تێرنابـە و تـژی ژی نابـە، ژ دونیـایێ، دۆژەهـ ژی وەسایە خودادبێژە ماتو تێرنەبوویی. دوژەهـ دبێژە [هل من مزیـد] (ق: ٣٠) پارییـەك یـێ وێ هەیڤ و ڕۆژە.

ڕەبــی بێچــارێ تــەمـــە مـــن بــارگران کــر کـــال و پیـــر
یووســـفێ خـــۆ نـــە خـــوەی بـــی دێ بمینیـــت شـــەڤ ل دەر[٢]
داهیـــا بـــاڤێ مـــە ئـــادەم ئایـــەتـــا (لا تـــأکلا)
بــۆ مــە ژی ئـەو ئیمتیحانــە یــێ بخــۆت دێ چــت ســەقــەر[٣]
نــە ڕەزیــل و طــم حــەرام ئیمــان ب ظــولمێ پــیس نــەکــر
بــۆ ئـەوی ســەربــەســت و مــزگین هــات ژ نـك ڕەبــێ بــەشــەر[٤]
مــن د دوو دیــن پــڕ دگریــان یــەك صــیانەت یــەك قــەناعــەت
مـــن غـــەلا دیـــت هـــات ژ دەورا دەرا مـــن هـــات و تـــو هـــەر[٥]

---

[١] دارا زەقومێ دارەك ژ ئـاگرێ دۆژەهێیـە ئـەو بـەرێ وی ژی هـەر ئـاگرە چـاخێ جەهەنـەمێ دخـۆن زکـێ وا کونـدکێ و دەردکـەڤێ ئـەو ژی ژ وارە سـەزایە، بـەرێ ڤـێ دارێ خارنـا هـەڤالێن شـەیتانینن شـەیتان. ئـوردووا خـوە د دۆژەهێـدا ڤـێ خارنـا هـە دخـون و پـێ تێنـە سـەزادان. د دونیاێیدا پـاریێ حـەرام ئـەو ژی کـارێ شـەیتان و هـەڤالێن وینـە. ئـەو ژی ژەهـرە زەقومـە و کەسـك و زەرە، مـرۆڤ دەمـا نەسـاخبن د فەرەشـن ئاڤـەك کەسـك و زەر تـاڤێژن، دبێژن: زحفەرانە قال تعال [ان شجرة الزقوم طعام الاثیم] (الدخان: ٤٣).

[٢] یا خودا ئەز بێ چارەمـە و بێ دەستهەلاتم ومـن بـارێ خـوە گرانکریـە ژ گونـەهان، و ئـەز کـال وپیر بوومـە. هەکـە تـو ل یووسـفێ خـوە خـوەیتی نـەکی وێ بمینـت نـە حـەواندی و شـەڤەدەر.

[٣] داهیا باڤێ مە ئادەم، یانی تەشقەلا وی، ئەڤ هاتا هەبوو [فقلنا یا آدم اسکن انت وزوجك الجنـة وکـلا منهـا رغـدا حیـث شئتما ولاتقربـا هـذه الشـجرة فتکونـا مـن الظـالمین] (البقرة: ٣٥)ژ مە ڕا ژی ئەو ئاڤ گەڕاندیە ئیمتحانە یێ ژ دارا حەرام بخوت ئـەو دێ بچت دوژەهێ.

[٤] نە ڕەزیل و تم حەرام بە ئـەو مـرۆڤێن کـو باوەریـا خـوە ب ستەمکاریێ پیس نە کریـێ ژ وی ڕە ڕۆژا ڕابوونێ ئازادی و سەربەستی و موژدە ژ بال خودا ڤە ژێرە تێت.

[٥] من دوو تشت دیتن پڕ دگریان یەك پاراستن و یەك قەناعەت بوون، ئـەڤێن هـە د چـاخێ مـە دا گەلـەك ژار بوونـە. مـن دیـت خـەلا (کـولب) هـات ژدەردا گۆتـە قەناعەتێ دەورا مـن هات تو هەرە. زکێ مرۆڤا هەر برچییە. تێر نابە.

یـــەك طــــەبعـــێ پـــاك یـــا دی دایـــین و مـــەردی

ب هـــەر دووان دێ فـــردە و ســـابەریـــن ئـــەی موعتـــەبـــەر[١]

ئـــەی مریـــد لازم بـــزان تـــو كـــی ســـەرۆكـــی نـــژدەڤانـــان

ظـــۆڕ نـــەیـــار نـــەفسا گـــەمـــورە دەڤ طـــەنـــۆر كریـــە چـــەپـــەر[٢]

نـــەفســـێ چـــڕو چـــل ببینـــە یـــێ ژ وێ چڕتـــر نـــەبـــی

دێ بكێشـــە شـــەرم و دۆژێ بـــێ مـــەجـــال و بـــێ مـــەفـــەر[٣]

ئـــەی قـــژك بـــەرهـــەڤیـــا تـــە ژ حـــەرام بـــۆ تـــە نـــە مالـــە

---

[١] دوو تشت ڕاست خودا هنارتنە بۆ مرۆڤان یەك خۆیێ پاكە یا دی داینی و مەرداتیە، هەكە مرۆڤ ب هەر دووا كار بكە دێ ب وا فربدێ فیردەوسا فرەهـ یا مروڤێت چاك، قاسدێ خومدێ دبێژە (انما بعثت لاتمم مكارم الاخلاق).

[٢] یا ئەو كەسێ كو دبێژێ ئەز مریدم توبەدارم پێویستە تو بزانبی سەرۆكێ نژدەڤانا كیە و تو ناس بكی دا تو كار بی د نژدا وی دە جهێ خوە بگر و پێتر ب مەشی. نەیارێ هەرێ خۆرت ژبۆ مرۆڤ نەفسا گەمورە و تەحلە د ناڤا سنگا مرۆڤ دایە ئەو دمر ژ خومڕە كریە چەپەر ژ وا دمر دەربا تاڤێژێ مرۆڤ. دەڤ تەنور دەڤەرەكە ل بوونا دكەڤێ ناڤبەرا گوندێ خێستە و پیرێ دەل ڕا ل بەر ئاڤا مەزن تەحتا وێ بلندە وەكە دەڤێ تەنۆرێیە دبێژنێ دەڤ تەنۆر. وارەك مێژوویە، نڤیساندنا پەهلەوی ل وڕ هەیە ل سەر بەرەكی هاتیە نڤیساندن، هندەك مرۆڤێن مە هەبوون د گۆتن وا مالا گومورا، سم گەمور و موحەمەد گەمور و ئەحمەد گەمور. ئەڤێن هە قاچاخێن دەولەتا تركا بوون چوو بوون بنێ خەتێ سوری، چاخێ سەرهلدانا ڕەحمەتی شێخ سەعید دابو، دهاتن وەڵاتی و دچوون، دەولەتا تركا لەشكەر ئانی سەر وا ئەو ژی ل وێ دەڤەرێ ئاسێ بوون، ل دەڤ تەنور شەر كرن دەولەتێ چ چارە ل وا نە كر. پاشی خوە ئاڤێتن ئاڤێ و خەلاس بوون و چوون، ئەڤا هە شاعر ل سەر نەفسێ ئانیە.

[٣] نەفسێ كێم نە بینە چڕ و چل ببینە هەكە تو ژ وێ چڕتر نەبی تو دێ نەكاری وێ چڕ ئەو تشتێت دمێنت ب مە مرۆڤ ڤە ژ مرۆڤی ڤەنابە وەكە بەنیشت و شیریناهیێ چل بێ نەفسییە دبێژن چلەك هەكە تو نە خوە نە ڕاگر بی وێ تە شەرمەزار بكی هنگی مەفەر دبێ و بەلایێ دۆژەهێڤە تێ ڕاكیشان.

ئەو وەجا کەس ناگرت کا بۆ گوهیشك نە ل خێر و شەر[1]

ئەو خەشیمێ چەرخی چوویی ل سەر دانێ تە دنی

موچەیا ژێ هلفڕاندی ژەهر د ناڤ شیر و شەکەر[2]

یێ ب دانێ نەبێ مەشهوور ب حاتەم طەی ژ عەلاقە

کوپەکێ کوتەکێ خوونڕێژ چ عەلاقە ب عومەر[3]

واجبی شەرعی ئەداکە واجبی مۆڕئەت تەبا

وەر نەبێژە ئەز مەردەمێرم ئەی قەسیسێ سەر ل بەر[4]

موسلمە کانێ سەلامەت موئمینە کانێ ئەمانەت

مازینە ب ظولْم و خیانەت گورك شڤانە سینە بەر[5]

---

[1] یا ئەوێ وەکە قڕکێیە و ژارە بێ کێرە ئەوا تە ژ حەرامی بەرهەڤکری ئەو مالەك پیسە نە تو مالە و ئەو وەجا کەسی نادەیێ فەیدەیە. وەکە کاب و گوهشکێ حەیوانایە. گۆشت پێڤە نینە بکێری خێر و شەڕا نایێ. مالێ حەرام ژی وەسایە بکێری تو تشتی نایێن.

[2] ئەو نەزانێ چەرخا ددێ خوە و دچێ سەر سفرا دونیایێ دان دانەك خارن ئەو خارنا دچاخێ سحارێ دا یان دانێ نیڤرو یان دانێ ئیڤارێ دانە بێ ئەوە خارنا ب خێرا نەبی دهاتە داین مووچە دبێژت: مەعاشیرا مووچە، موچەخۆر یان مووچك وەکە هەسکویێ بچووکترە. ئەوێ ژ موچکا وێ خاربیت زەلامێ وێ ئەو یێ ژەحر کریە دناڤ شیر و شەکردا یانێ حڕام کریە د ناڤ حەلالیدا. حەرام وەکە ژ حرێیە و حەلال وەکە شیر و شەکرە.

[3] ئەو کەسێ بدان و مەردیێ نە ناڤ بانگ بیت چ عەلاقا وی هەیە ژ حاتەم و مەردیا وی باخڤێ ئەوێ وەکە سەیێ نێر بیت. کوپەك سەیێ نێرە و دیلك یا مێیە، و زۆرداربت. کوتەك بیت خوون ڕێژبت چ عەلاقا وی ب وەك هەڤیا عەمر هەیە ژێرا باخڤە.

[4] ئەوا ل سەر مرۆڤی پێویست بت ژ واجبێ شەریعەتێ د ڤێ وێ پێك بینە و ب مروەتیە. هەکە نە وەسابە بلا نەبێژە ئەز مەردەمێرم یا قەسیس یا ئەوێ سەرشوور.

[5] دبێژە ئەز مسلمانم لێ مرۆڤ ژ نەخۆشیا دەستێ وی و دەڤێ وینە ئیمنن.دبێژێ ئەز خودان باوەرم لێ کا ئەمانەت بەلکی خیانەت پتر هەیە. مەزنە لێ ستەمکارە خاینە. شڤانە لێ گورگە دلێ وێ وەکە بەرە حشکە.

دەڤــە قۆشـــە نـــە ل عـــەیشـــە نـــە ل بـــارە نـــە لایشـــە
نینـــە وجـدان ئـــەو ب ئیشـــە ب بـــەلـــەنگـــازێ بـــێ ضـــەڕەر[١]
تـــو ژ ســـەیـــدایێ د پرســـی کـــی شـــبی کـــوچکـی گـــرۆك
ژ خـــوەنـــدنێ یـــێ تێتـــە فکـــرێ ئـــەوە یـــێ ب زۆر ضـــەڕەر[٢]
بگـــرە برجـــا ڕەش برینـــێ ڤـــەکـــە قـــەصـــرا ســـەر برینـــێ
ب صـــەد هـــزاران تـــێ ب خـــونی ژ مـــازن و گـــر گـــر و ســـەر[٣]
مـــوئمنێ دۆڕ و یۆجـــەبـــبن موحتـــەرەم وی قـــەت نـــەبـــین
بـــەر ل شـــەیطـــانێ لـــەعینـــە د زەکـــی بـــی ســـەر و بـــەر[٤]
ئـــەی موتـــەڕەك ل حـــەدیثـــێ زوو ڤـــەگـــەر وەرنـــە دەرەنـــگ
صـــەد ئـــەمانـــەت مـــەکـــە تشـــتێ وەکـــو بـــێ ئـــەصـــڵ و ئـــەثـــەر[١]

---

[١] مرۆڤێ ستەمکار و نە قەنج شبهاندیە پەرەندا نەعامێ، ئەڤە ژ نعامێ ڕە ب ترکی دبێژن دەڤـە قـۆش دەڤـە هێشـترە. قـوش پەرەندەیـە. ئـەڤا هـە مەتەلوکـە ل سـەر مرۆڤـی چ بەرچورانـەیێ دبێـژن مـاتو دەڤە قوشی. چـاخێ دبێژنـێ کـا بـاری هلگـرە دبێـژی مـا ئـەز پەرەندەمە تەیرم، دەما ژێرە دبێـژن بفـرە دبێژیـێ مـا ئـەز هێشترم ئەڤە ستوکرا مـن هندە درێـژە و لنگـێ مـن وەکـە یـێ هێشـترێیە ل بـەر تورانـایێ سـتەمکار ژی وەسـایە ل بـەر تورانابێیت. وژدانا وێ ژی نینە کو ل سەر مرۆڤێ بەلنگاز و ژار ژی ب ئێشە.

[٢] دبێژێ هەکە تو ژ سەیدایی بپرسی، بۆ خوە دبێژە: کیە وەکە کوچکێ مرۆڤ گرە. ئەوا ژ خوەندنێ تێتە فکرا من و ئەز ژێ دزانم ئەو کەسەیە ئەوێ زۆردار و ستەمکار و نەخوەیێن دگەهن مرۆڤان، ئەو ژی وەکە وی سەیی تێتە کوشتن.

[٣] ژ دونیایێ ئاخڤە وێ برجا ڕەش برینێ بگرە دەرێ وێ قەسرا سەریا دبێژێ ڤەکە تەماشە بکە تو تێدا ببینێ ب سەد هەزاران سەرێن مرۆڤێ مەزن و گرگرە تێدانە ژبەر وێ ڕەها نە بوون کوشتنە و ژ ناڤچوونە هەڤالتیا وێ وهایە.

[٤] باوەرمەنـدێ نەراسـت و دروسـت بـت دوو ڕوو بـت و خـوەهر و ڤـا ژی بـت، ئـەو نـە مرۆڤـە بێقیمەتە. قەدرێ وی نینە بێ ڕۆمەتە ئەوی باش نەبینە. بەرێ وی ل شەیتانیە، ژ دینێ خوە ڕا وەکە مرۆڤێ دزە. بێ سەر و بەرە دبێژێ قەیی ئەز نە مسلمانم لێ چ بەهرا وی دگەل مسلمانیتی نینە.

ئەز فلانێ بن فلانم ل وی گۆهی قەت ڕانەزە
سورەتێ زلزالە سەیدا بۆ حسابا خەیر و شەر[2]

عیش نە دەنگ و بەژن و بالە نە ئاپارمان زلف و خالە
عەمەلە قەلبێ ذەلالە بێ خیانەت بێ ضەڕەر[3]

موسلم زمی و گریز یێ شەریف یێ شڤان
د حەد و ئەحکامان یەکن بێ ئیختیلافە ئەڤ خەبەر[4]

گونەهێن یێن بەر چاڤ خۆیایی (والعذاب) پڕ زێدەنە
ژ لەو عەتابا زێدە بۆ وان هات د قورئان و ئەثەر[5]

حورمەتا خۆ ژ کەس نە خازە گەر دوروستی ژ خودێ ڕا

---

(1) یا ئەو کەسێ ژ گۆتن و شیرەتا دڕەڤێ، وەرە زوو وەرە ڤەگەرە هێش نەبوویە دەرەنگ، سەد ئەمانەتا من ل تە بت ژ وان تشتێ بێ بنیات دوور بکەڤە و نەکە ڕێنەدەپێ.

(2) نەبێژە ئەز فلان کورێ فلانم ب وێ ناڤ ل خوە نەدە ئەو وەجا ئاگرێ ل وی گوهی نەڕازە سورەتێ زلزالە سەیدا کو خودا گۆتیە: [اذا زلزلة الارض زلزالها] (الزلزلة: ١) [فمن یعمل مثقال ذرة خیرا یره ومن یعمل مثقال ذرة شرا یره] (الزلزله: ٧-٨) بۆ حەسابا خێرێ و شەری ئەڤە بەسە.

(3) مرۆڤ نە ب دەنگ و نە ب رەنگ و نە ب قەسڕ و قوسۆر ئاپردومان و زولف و خالان ب ڤان هەمیان مرۆڤ ڕەهانابە ڕۆژا قیامەتێ. قاسدێ خودا دبێژە. [ان الله لاینظر الی صورکم ولا الی اجسامکم ولا الی امولکم ولکن ینظر الی قلوبکم واعمالکم] خودا تەماشەی دلێ هەوە و کریارێن هەوە دکە. ئەوێن دی هەمی ڤالانە قەلبێ زەلال و بێ خیانەت وبێ زەرەر ئەڤە لنک خودا پر بهانە.

(4) ل هەمبەر عەدالەتا خودێ و حوکمێ شەریعەتا خودا د هەمبەر هەر کەسێدا وەکە هەڤە چ مسلمان و فەلە و مرۆڤێ شەریف و شڤان د هەمبەر حەدد و حودودا دە وەکە هەڤن، فەرق و جداهی نینە.

(5) ئەو گونەهێ ئاشکەرا و بەر چاڤ تێنەکرن، سەزایێ وان زیدەترە ژ یێت ڤەشارتی تێنەکرن، ژبەر وێژی دقورئانئیدا ژی سەزایێ وا ب زێدەهی هاتیە بەحسکرن. خودا دبێژە: [من یأت منکم بفاحشة مبینة یضاعف لها العذاب ضعفین] (الاحزاب: ٣٠).

ل دەفتـــەرا طـــوقێ بنێـــڕە چ خـــرار و چ جـــەهـــەر[۱]

ب ظـەن و پـەسـنێن ڤـان نـەزانـان کـی دبـت شـێخ و وەلـی

مینـا هـەسـنێ زەر ب پـەسـنێ کـەس نـەدی بـت زێـڕێ زەر[۲]

صـــەد ئـــەمانـــت خـــۆ نـــە ئـــاڤێژە جهـــێ توهمـــا دنـــێ

قـــە نزانـــی تـــو ڕەهـــا نـــابی ژ دەڤـــێ بتیـــر و تـــەڤـــەر[۳]

ئەی نـەراستێ پـیس خـەبیث بـەرچـەهـڤ سـپـەحـی هنـدور کرێت

دیـــن ب حێلانـــا بیـــتن گیـــژا ژی ڤـــێ فکـــرێ ڤـــەگـــەر[٤]

ژ خانـــا مێهڤانـــا بـــەرێ مـــن ل جهـــەك ئابـــاد و ئـــەسـڵی

---

[۱] قەدر و قیمەتێ خوە ژ تو کەسی نەخوازە هەکە تو ژ خودا ڕە دوروستی، هەر ژ خودا بخوازە ئەو بەسی تەیە [اللهم لا مانع لما اعطیت ولا معطي لما منعت] ڕۆژارابوونێ قیامەتێ دەفتەرا مرۆڤ یا خێر و گونەها تێتە دکەڤێ دەستوکرا مرۆڤ دا وەکە جهەرێ کەرێ ژبۆ یێ نەباش ژ ستووی وی دەرناکەڤە. [وکل انسان الزمناه طائره في عنقه و نخرج له یوم القیامة کتابا یلقاه منشورا] (الاسراء: ١٣).

[۲] ب پەسندا بینا مرۆڤێ نەزان و جاهل دبێ شێخ و وەلی. بەلکو ب کریارێن چاك و باش مرۆڤ د گەهێ وێ پلەیێ گۆتنێن سوفیا بۆ شێخی ئەو فەیدە نادە، چەند مرۆڤ پەسنێ هاستەك زۆر بدێ دیسانا بە زێرێ زەر کار بچە و هەری تێتەکرن نە ب پەسنا.

[۳] سەد ئەمانەت من ل تە بت ئەو جهێ توهما بەرهەڤکرنا مالێ دنێ یان پلەك بلند پێ پەیدا ببێ ژ وێ دوور بکەڤە خونێزیك نەکە. هەکە تو خونێزیك وێ بکی تێ بکەڤێ ناڤ دەڤێ خەلکیدا وێ ژ تە باخڤن تو ژێ خلاس نابی ئەو دەڤێ وەك تیر و تەڤەرایە، زمان وەکە تیرێیە و ددان وەکە ددانێ تەڤرێنە.

[٤] یا ئەوێ ژ خودا ڕا نە ڕاست و درست بت. وێ نە پاك و پیس بت خودا ژ خەبیس ژ گەنەهـ ڕە دبێـژێ حەرام ژی هەر خەبیسە [ونجیناه من القریة التی کانت تعمل الخبائث] (الانبیاء: ٧٤) [الخبیثات للخبیثین والخبیثون للخبیثات] (النور: ٢٦) بەرچاڤ مرۆڤەك رندە لێ هند رویێ وی پیسە وەکە مرۆڤێ منافق (ظاهر ملیح باطن قبیح) ئایین ب حیل و پیلانا بە د ڤێ مرۆڤێت ئایین پەرست ڕاست و دروست بت، ژ ڤێ فکرا هەڤە گەر تو ب ڤێ فکرێ نا گەهی تو دەرا.

بارێ کال و ژ تاقەتێ دەربەر ل فەرمان و قەدەر[1]
یێ جهێ وی ل کورت و چالێ دێ چاوا شاس بت ب مالی
یان ب ئاپارتمان زولف و خالی وارە دێ بارکە ژ سەر[2]
نە پەرەسبە ژبۆ پارا بگەرە پێ دوست و یارا
وەرنە دێ ب لوارا تو بچی ل سەر دبە شەر[3]
ژ پاکێ طەبع و قوەتەك دینی هشینە چەنگ و پەر
وەر نە فڕنادی تو فیردەوسا بەرین بێ چەنگ و پەر[4]
مەرهەما هندی برین بەدل تە نازك بنێر ل خودا
ژ صەد هەزاران یەك وی دوستە لێ نە دوست بهتر دنێر[1]

---

[1] ژ ڤێ خانا هە یا مێهڤانا کو دونیایە بەرێ تە ل وارەکێ ئاڤایە و بنەجە ژی ئەوە کو ئاخرەتە، د ڤێ توژۆیرە بزاڤا باش بکی چاخێ ئەڤ شیعردانیی وی دەمێ کال ببوو ژبەر وێ دبێژێ بارێ کالو ژ هێزا وی زێدەترە کو بارێ گونەهایە، ئەز ل بەر ئەمر و فەرمانا تەمە یاڕەبی.

[2] ئەو کەسێ جهێ وی کورت و چال بن. یا قەبرٍ بت دێ چاوا ئەو ب مالێ دنێ شاش بت و ژ ئاخرەتێ دورکەڤت. یان ب قەسرٍ و ئاپارتمان پەیڤەك ترکیە قەسرێن بلندن، یان برو و لێڤێن ژنا و خالێن ڕوویێ وا ئەو کەسێتر ب ل بیرا وی بت ب ڤان تشتا کەیفخۆش نا بت ژبەر کو هەر دێ بار بکت و بچیێ.

[3] نە وەسابە کو تو پەرا بحەبینی، هەکە تە هەبن ب وا دوست و هەڤالا بگرە. هەکە تو وەنەکەی تو وێ بچێ و بهێلی شونتەڤە مرۆڤێن تە ل سەر وادێ بکن شەڕ زارۆکێن تە وێ لیك نەکن.

[4] ئەو کەسێ خودانێ خویەکی (طبع) پاك بت و ئایینێ وی بهێز بت. هەرهشین و ب چەنگ و پەرە ب وا چەنگ و پەرا دێ فربدێ بچی بەهەشتا بەرین عەمەلێ سالح ژ مرۆڤا را د بێ چەنگ و پەر. قاسدێ خوددا دبێژە: (هندەك ژ چاکێن ئومەتێ ڕۆژا قیامەتێ وەکە برۆسکێ د سەر پرا سیراتێرا د فرین و هندەك ژی وەکە پەرەندا سەردا دفڕن).

ئەی خودا چەندی نە ڕاستم شەقی و شەرمەندە زانم

لێ نەڤینی تە مە ناڤێن گەر بکن من کەر ب کەر[٢]

خان خۆیی ڕوهـ دا بچووکا دین و دونیا کر تەبا

نە دیانەت نە صیانەت دین دە لازەك بێ دە گەر[٣]

حەقێ خالق دەرنەدە ب یەك مەڕحەبا مەخلووقێ ژار

بین تەڤینگەك پەندەوەر وێ بێ سهو سەیوان و سوپەر[٤]

بوونا ئیخلاصێ تەوەکول شاهدە گەر عادلە

وەرنە تەوحید و عیبادەت دێ ب مینن بێ ثەمەر[٥]

---

[١] مرۆڤ د ڤێ ببە مەرهەما هەمی برینا ژ مرۆڤان را دلێ مرۆڤی د ڤێ نازکبە ژخودا ڕە کال خودا بنێرە، ژ کولەیێن وی ژ سەد هەزاران یەك دوستێ ویە و یێن دی نەیارن ل دینێ وی دیسا ژ پتر ل وا یێن نە دروست و نەیار دنێرە و ڕزقێ وان ددێ و نابڕێ.

[٢] یا خودا ئەز دزانم ئەز دەربارەیێ تەدا چەند نەڕاستم و گونەهـ کارم و ژ تە شەرم دکم ڤی ئەز دزانم، لێ ئەوێن نەڤی نین تە نە من ژی ئەو ناڤن گەر ئەو من بکن کەر ب کەر.

[٣] خان خۆیێ یانی خودا ئەوێ ڕوە دایە بچووکا و ئایین و دونیا ژی دانە وی، ئەوێ پشتی ڤان چاکیا ئایینا خوە نەپارێزە ئایین وێدەمی دبێی کارەکی بێ قیمەت و بێ دەگەر. دەگەریان (بەر) پەیڤەك تورکیە یانی بێ بها د ڤێ مرۆڤ ئایینی پارێزەیێ.

[٤] مافێ خودا دڤێ مرۆڤ دەرنەدێ سەخمەرەتی کو یەك دەست چێکرێ خودا ژێرە بێژە مەرحەبا، یانی مەزنەك ژ یەکی ڕا بێژە مەرحەبا ئەو دکارە خوە ژخودێ بکە. تو ژ خودا ڕە ببە وەکە تەڤناپیروکی ئەوا بێ سهە و بێ سیوان و بێ سیبەرە تایێ وێ پڕ زەعیف و ژارە.

[٥] ژبۆ کو تو خودا و ژ خودا ڕابی تەوەکولا تە ل سەرخودا دا ببێ شاهد بۆ تە هەکە تو وەکهەڤیێ بخازی عادل بی [حسبنا الله ونعم الوکيل] (آل عمران: ١٧٣) [قل حسبي الله عليه يتوکل المتوکلون] (الزمر: ٣٨) هەکە نە وەسا بت توحیدا یەکبوونا خودا و خودا پەرستن دمێنن بێ سەمەر.

دێ تــەوەكــول پــڕ تــەمیــز بــت ژ ژەهریــا شــرك و نیفــاقێ
وی تنــێ بــۆ خــۆ ببینــە پشــت و عــەون و میــر و ســەر[١]
حــەزدكــی ژ هــەر كــەس قــەویتــر بــی شــبی پــۆلای بــەر
هــەمیــێ خــۆ ژ وی بخــازە بــەر ئــەمــر گۆهــ تــە ل ســەر[٢]
یــێ تــەوەكــول نــە ل ســەر وی ب تفــاق و مورتــەد دبــت
هــەر وەكــی داخــازا و گــازی د ئیعلامــا ئیبنــو حــەجــەر[٣]
خــانیێ ئیمــانێ نــە ســاغلەم دەڤــەر و عــەیــب تــێ هــەبــن
ئــەو چ ئیمــان و چ تــەقلیــد ئــەو چ شــەهــدە چ خــەبــەر[٤]
دارا طــۆبا شــەكلــێ ئینســان كــوك ل ژۆرە چــەق ل ژێــرە
یووســفی گــەر بكــی طۆبــا شــیعر هــەمــا شــیر و شــەكــەر[٥]

---

[١] دڤێت تەوەكولا تە پڕ تەمیز بت و ژ ژەهرەیا شرك و منافقیێ دوور بت، خودا تەنێ ژ خوە ڕا ببینە پشت و پەنا ە و میر و سەروەر هەر ئەوە.

[٢] هەكە تە بڤێت ژ هەر كەسی خورتر بی و ب قەوەت بت وەكە پولا و بەرا بت هەمی یێ خوە ژ وی بخوازە و ل بەر ئەمر و فەرمانا وی بە و گوهێ تە ژی ل سەر خودا بت.

[٣] ئەو كەسێ نیعمەتا و تەوەكولا وی نە ل سەر خودا بت ب یەكیتیا ئەهلێ شەریعتی ئەو ژ ئایینی دەركەتیە (مورتەد)ە هەر وەكی ئەو كەسێ هاوارا و داخوزا وی نە ژ خودا بت. ژ غەیری ویە ئەو ژی ژ ئایین دەردكەڤە [ایاك نعبد وایاك نستعین] (الفاتحة: ٥) (عبارتە هكذا ومنها ان یجعل بینە و بین الله وسائط یتوكل علیهم ویدعوهم ویسئلهم قالوا اجماعا علی هامش الزواجر ص ١٧٤).

[٤] ئاڤاهیا ئیمانێ چاخێ نە ساخلەم بت دەڤەر و عەیب تێ هەبت، ئەو چ جورێت باوەرێیە ئەو چ جورێ تەقلیدێیە دبێژە ئەز تابعێ موحەممەدم، ئەو چ جورێ گەواهێیە (شەهدە) دبێژە: اشهد ان لاالەالله وان محمدا رسول الله، ئەو چ خەبەرە.

[٥] دارا تۆبایێ دارەكە د بەحشتێدا هەمی جورێن فیقی پێڤە تێت كوكا وێ ل ژورە چقێن وێ ل ژێرە وەكە مروڤایە چاوا كوكا مرۆڤی كو سەرییە مە ژی تێدایە ئەو بنگەهێ هەمی زانینێ یە. دبێژێ هەكە یارەبی تو من بكی تۆبا یانی وەكە دارا تۆبایێ ب بەرهەم

نا گەهەت ئاڤا حەياتێ شاهنشينن نازكان

يێ ب پەڕگالا حەرام ڕەت ڕێ نەناسۆ چوولە لەبەر[1]

فەخرێ باڤێ هەرە دەرسێ دا ب وان ئەوصافێ پاك

حەق ئيلاهێ خۆ تو ناسكى گەر هەبت عەقل و فكر[2]

ئامر و فەعالێ موطلەق هەر خودايە هەمى عالەم

د پەنجەيا قەدر و قەضايێ بێ مەجال و بێ ضەڕەر[3]

هندى عالەم حەوجەيى وى حەوجەيێ كەس ئەو نەهن

يێ وەسا دێ بالقە لەزكى حەوجە دێ ل كێلێ بگەر[4]

ئايەتا خەزنێ د تەوبەتدا وە عيدەك پڕ شەديد

ژ طرسا فەقرى يێ نە دت بۆ وى چ ئافات و سەقەر[1]

---

بم وى دەمێ هۆزانێن من دێ ببن شير و شەكەر، چاوا ئەو شرينن، ئەو ژى ب مرۆڤان وێ شيرين ببن.

(1) ئەو كەسێ ناگەهت ئاڤا ژيانێ(حياتى) كو ئاڤا بركا كەوسەرێيە كو مرۆڤ چاخێ ڤەخوت توجارا نامرێ و ناگەهێ شاهنەشينان ئەوين نازك و رند كو قەسرێن بەهشتێنە. ئەو كەسێ ب پەرگالا حەرام بچێ وێ دنێ (ئاخرەتێ) ڕێ نەناس و چو لەبەر دچێ نە ل سەر ڕێيا ڕاستە (صراط المستقيم) ئەو كەسێ دگەهێ ئاڤا حەياتێ و قەسرِ و قوسوڕان. ئەوێ پەرگالا وى حەلال بت و تەميز بت.

(2) دبێژێ خوە مەزن كرنێ ئەزێ تيێ باڤێژە ژ دلێ خوە هەرە با سەيدايەكێ دەرسێ بخۆنە دا تو ب ڕەوشتێن باش خودايێ خۆناس بكێ هەكە تە هشەك و فكرەك باش هەبت [ان الذين يستكبرون عن عبادتي سيدخلون جهنم داخرين] (الغافر: ٦٠).

(3) برياردەر و كرياردەرێ موتلەق هەر خودايە. هەمى هەين و كائينات حەوجەيى وينە ئەو حەوجەى كەسێ نينە هەمى عالەم د پەنجەيا قەزا و قەدەرا خودا دايە هەمى هەيين بێ دەستهەلات بێ زەڕەرە ل هەمبەر خودا دە.

(4) هندى عالم پيويستى ب وى هەيە ئەوى پێويستى ب كەسێ نينە ئەوێ وەسا ب كێر و شيان بت، دڤێت تو بال ويڤە ب بەزى مرۆڤ حەوجە ل علبيێ وكێلێ دگەرە.

یێ قەسیس و قەلس و نان کور ژبەر فەقیری دەریێ خۆ گرت
ژ کودکێ ب طرس هلفراند و قەد دبت ئەو میر و سەر[٢]

ئەو نەیێ ئاپار و بورجان نە ل کوس و تەختە بەندان
یێ وسا ئینسان نەبین ل وی بابەتە کۆخاتێ کەر[٣]

ژ دەستێ نەمەردە ئێش و دەردە ئەڤ حەدیثە تو نەبەردە
نانێ مەردان دان و دەرمان نۆشی جان و خێر و بەر[٤]

جان تیجارەت پڕ تەمیز بین ژ سەیدا یەك ئەمین هین
ژێ ب بیهی یان ب خوون بازارێ بێ حیلە و ضەرەر[٥]

یێ خودایی ب پەرەو شەهدە زۆر سوند و درەو
ئەحمەق ئیمان کر گەرەو هێژ عەقل نا ئێتە سەر[١]

---

[١] هاتا (ئایەتا) کو د سورەتێ تەوبێدا بەحسا وا کەسا دکە ئەوێن کو زەکاتێ ژ مالێ خوە نادن و ژ ترسا خیزانتیێ فەقیری، زەکات ژی ژ زیر و زیڤ تێتە داین، ئەوێن وەسا بن خودا ژ وا رە گەڤێن مەزن ل وان کرنە [والذین یکنزون الذهب والفضة ولاینفقونها فی سبیل الله فبشرهم بعذاب الیم] (التوبە: ٣٤).

[٢] ئەو مرۆڤێت قەسیس بت کوند بت کنوژ بت قەلس بت ئەڤێن هە دژی مەرداتییێنە ونان کور بت ژبەر فەقیرا خیزانا دەریێ خوە بگرێ دا تشتەکێ نە دێ وایێن حەوجە و ب ترس ژ کودکا خوە دخون و بکەڤچك هلدفرینێ بتر ئەوێ وەسا تو جا نابە ڕێبەر و میر و سەرۆك ئەوێ داخوازا ڕێبەریێ بکت د ڤی مەرد بت.

[٣] ئەوێ وەسانە بابەتە کو قەسرێ هەبن و خودانێ برجا بت و ڕۆناهیا وی هەبت وەکە لوکسا خودان تەخت بت و کولەیێن وی هەبن، ئەوێ وەسا وی مرۆڤ نەبینە بابەتێ وی کوخا کەرایە.

[٤] خارنا مرۆڤێت کنوژ و نە مەرد بت، هەمی ئێش و دەردە ئەڤا هە ژ گۆتنێ نەبینە، نانێ مەردا دان و دەرمانە تو چەند بخوی تویێ نەخۆش نابی نوشە بۆ جانی و خێرە و بەرە (طعام السخی دواء وطعام الشحیح داء، ابن عمر رجاله ثقات).

[٥] تە بڤێت جانێ تە و بازرگانیا تە پاك بن ژ سەیدایەك ئەڤێ فێرببە، تو ژ وی ببهێزی یا بخوینی ئەڤا هە بازارەك بێ زەرەرە و حیلە تێدا نینە.

مەترەیا دەست تە صیڕاطە کێلو مێزین ژی مقاطە
سورەیێ تەطفیف بۆ تە هاتە دەم ب دەم هەر ل وێ بنەر[2]
پەسنێ مالێ خۆ نەدە یێ غەیرێ نەشکێنی تو جار
هەم ب تەوەکەل وەرنە ئەو مال دێ حەرام بت ئەی تەمەر[3]
(فأذنوا منه بحرب في الربا هد شدید)
سورەتێ زلزالە سەیدا بۆ حیسابا خەیر و شەر[4]
طاعەت و حەج ئەکبەرێن خۆ ل بەر حوقوقان قەت نە بین
پڕسا خۆنا پێشێ کر یا حوسەین مایە ل سەر[5]

---

(١) ئەو کەسێ خودا بەردده و دووڤ پەرا دکەڤە و شەهدە زۆریێ ددە و سوندا دخوە ودەروا دکە ئەڤێ وەها بت ئەحمەقە و نەزانە. ئەو باوەریا خوە دکێ گەرەو هێژ هشێت وی نایێت سەرێ وی کا چ دکێ.

(٢) مرۆڤێت دکاندار چاخێ ب مەترێ د کرت و د فرۆشە دڤێت بزانبە کو ئەو مەترە سیراتە دڤێت ڕاست بت. هەکە نە ڕاست بت کێماسیێ تێدە بکە. ئەو ڕێ و ڕاست د سەر پرا سیڕاتێدە دەرباس نابە. و کیلومیزین ژی مقاتەنە دڤێت گەلەك هایێ وی ژێ هەبە، سورەتێ [ویل للمطففین] (المطففین: ١) بۆ تە هاتیە خارێ دا تو دکێش و پیڤانێدە حیلێ نەکێ هەر تو وێ سورەتێ بخوینێ هایژێ هەبێ.

(٣) ب کێر نایێت تو پەسنا مالێ خوە بدی و بێژی گەلەك باش و قەنجە و یێ خەلکێ بشکێنی و نەباش بکی، بێژێ بکێر نا یێت، د دانوستاندنێدا دڤێت تەوەکولا تە ل سەر خودێ بت. هەکە نە وەسا بت ئەو مال دێ حەرام بت یا تەمەرە، ژبەر وەزنا شعرێ ناڤێ تەمەر ئانییە.

(٤) خودا دبێژە [فاذنوا بحرب من الله ورسوله] (البقرة: ٢٧٩) ئەز و قاسدێ من بربا خوە ڕی د جەنگێ دانە (لعن رسول الله صلى الله علیه وسلم تأكل الربا وموكله وكاتبه و شاهده) ڕیبا گەلەك گونەهەك مەزنە ژ گونەهێن کەبائیرایە ژ حەسابا خێر و شەڕی ڕا سورەتیێ (اذا زلزله) سەیدایە ژ مرۆڤا ڕەیە هنگە میسقال زەڕە بادل هەوا ناچە.

(٥) نڤێژ و ڕۆژی و حەج و خێر و چاکیێن خوە ل بەر مافان نەبینە یانی کەسێ مافێ مرۆڤان خار بێ و مافێ خودا پێك ئانیبی ئەو ناکەڤێت ژبەر هەڤ ڤە دبێژن: یەك عەرەب

قەویتی شاش نەبە ب مالێ ئەڤێ دونیێ نە تۆ مالە
بنێرِ ل زوهدا (رسول الله) بەسە بۆ تە ئەوە ڕێبەر[(١)]

سەیدێ عالەم د دەر سێدا خیطابەت بۆ مە کر
ژ دنێ بۆ خۆ هلینن نان و پەرگالا سەفەر[(٢)]

(الولد مبخیل مجبن) مە حەدیثە تۆ بزان
د هەر دوو دونیا دڤێ شێر بی بدە ژارێ بێ مە فەر[(٣)]

صەد خوزی بۆ نەفعێ عامێ ئەز ب بووما پرو ڕێ
ئاخ و ۆتۆزا پیێ قەنجان من نە ئەڤ مسکێ تەتەر[(٤)]

هن ژ ئینسان شبی حەیوان بێ دل و بێ چاڤ و گوهـ
هن مەلەك دبن سیا عەڕشن هن ژی شەیطان و ضەڕەر[(١)]

---

خەلکێ کوفایێ هاتە لایێ ئیمامیێ ئەعزەم گۆت خوونا پێشووێ ب مرۆڤ ڤە بمینێ حەلالە یان پاکە. گۆتە وی: ماتو خەلکێ کیریێ زەلامی گۆت: ئەز خەلکێ کۆفاییمە. تو پرسا خوونا ئیمام حوسین ناکی تو پرسا خوونا پێشووێ دکی. یانی حەقێ عەبدا ب خووی و یێ خودا پیك بنی ئەڤە تە خلاس ناکە. وا حوسێن کوشتبوو ( حەج ئەکبر) ڕۆژا عەرفاتێ و ڕۆژا ئەینێ یەك بن دبێژن ( حج الاکبر).

(١) شیرەتا من ل تە تو ب مالێ د ڤێ شاش نەبە ژ ڕێیا خودێ دور نەکەڤە ئەو مال نە تو مالە، ل پارێزا قاسدێ خوەدێ بنێڕە ئەو بەسی تەیە ژبەر ئەو ڕێبەرە. .

(٢) سەرۆکێ عالەمێ د دەرسێدا بۆ مە د وتارا خوە گۆت: ژ دونیایێ هندێ بۆ خوە ژێ ڕاکن وەکە زاد و زەوادا ڕێویتیەکی زێدەتر نە پێویستە.

(٣) یارولە (وەلەد) مرۆڤێ بەخیل و ترسونەك ڕزقێ خوە ئەڤ خەسلەت نەباشن و حەدیسە تو ڤێ بزانبە. نە ژبەر خوە ئەز دبێژم، د هەر دوو دونیادە دڤێت تو وەکە شێر بێی نەترسی، داییْنی ب کەسێ بێ چارە ڕا بکی و قەنجیێ ب مالێ خوە ب کەتیارە بکە.

(٤) دبێژێ خوزی (خوەسکا) ژ بوونا فەیدا من بگەهشتە هەر کەسێ ئەز ببووما وەکە پرا و ڕێکا. چاوا پرورێ هەر کەس ژێ فەیدێ دبینن وەسا ژ من ژی فەیدە دیتبوونا. ئەز ئەو ئاخ و توزا بن پیێ چاکا بووما ئەز نە ئەڤ گونەهکارە بووما. ئەو توز بێهنا وێ ژلایێ من ڤە خۆشترە ژ بێهنا مسك و ڕندیا شوخ و شەنگێ تەتەرا.

گەر دڤێتن د هەر دوو ڕۆژان سەرفراز قەند و شەکەر بی
ژ هەر برین ڕا دێ بی دەرمان ژ بریرا خوون جەگەر[2]
یێ بریندار خوون مە ژی ڕا هەر نەفەس وی ئاهـ مە ڤێڕا
هەر تلیەك مە تیرە ژێڕا مە صەفەت ژێڕا چەپەر[3]
ما ژ خابێ عالمانە یان ژ خامێ حاکمانە
یان ژ خارێ کوبەکانە ئەڤ فەسادا بەحر و بەر[4]
سەبەبێ ژینێ عیبادەت ژ وێ حوضوڕا خالقە
عەڕض و حالا تەحەسون نەحسان ب ژار و زاری دەینی بەر[5]

---

[1] هندەك مرۆڤ هەنە وەکە ئاژەلانە (حەیوان) چو تشتی فەهم ناکن دلێ وایێ ل سەر مرۆڤا بێشهێ نینە و چاڤێت وا ڕاستیێ نابینن، گوهێت وا ژی کەرە ژحەڤیێ هندەك مرۆڤ هەنە وەکە مەلەکا نە ڕۆژا قیامەتێ دبن سها عەرشێ خودێ دانە، هندەك ژی وەکە شەیتانانە ب زرەرن.

[2] شیرەتێ دکێ دبێژێ هەکە تە دڤێت د هەر دوو ڕۆژادە. دونیا و ئاخرەتێدا سەرفەراز بی و ل بەر دلێ هەر کەسێ شرین بی وەکە شەکرێ قەند بی، دڤێت تو ژ هەمی برینارە تو ببی دەرمان و ژێڕا خوە خوون جەگەر بی یانی حەوجەهیا هەر کەسێ پێك بینی، و حەز ژ کەسوکارێن خوە بکێ.

[3] ئەوێ ژ مە بریندار ببت د بەر وەلاتێ خوە دە ئەمێ خوونا خوە ژێرە پێشکێش بکن. هەر نەفەسەك ئەو بکێشنە ئەمێ ژێرە بکن ئاهێنی هەر تلیەك یێ مە ژ شەڕڤانی ڕە بکن وەکە سەر تیرەکی وەکە گوللەیەکی بلا بەردە نەیاری و ئەم سنگا خوە ژێرە بکن چەپەر بلا خوە بێ بەر و شەڕبکێ. شاعیری گەلەك حەز ژ پێشمەرگە و شەڕڤانا دکر و ئەو ڕاست ددیتن.

[4] ما ژ بەروێ یەکێیە کو زانا د خوە دانە یان ژبەر خاما (قلم) دادومرایە کاریەدەستایە، یان ژبەر خار و سترێن کوپەکایە (زۆرداریە) ئەڤ فەسادا کولدەریا و بەژێدا پەیدابوویە نەقەنجی زێدەبوویە.

[5] ئەگەرا ژینا مرۆڤی خودا پەرستیە ژ وێ حزۆرا خودا پەیدا دبە داخوازناما تەح سو نەحسا بژاری و ڕەبەنی و زاروزاری دەینە بەر خودا.

لازمــه ل صــوفى و مريــدان ل نــەفســا زور ئــەمــين نــەبــن
شــێخ ئــەحــرار دێ ژ كــوبێ تــە ژ دەســت وێ بينــە دەر[١]

فــورس و فورصــەت ژ پادشاهــ وە چ تــەيغــون و چ ئيقبــال
چــاخێ دانــی ســەرســەرێ تــە غــەم ل عالــەم قــال و شــەر[٢]

خــەســفا صــورەت ڕا بوويــە يــا بــاطنى گونــەهــێن مــەزن
چــاخێ كــر پوشــمان نــەبــت ژێــڕا نــەبــن ئاهــ و كــەســەر[٣]

ئــەی تــو نينــێ ژ دل و پــێ ژ هــەيكلــی بــۆ مــن خــەبــەردە
گوشــت و هــەســتى ژيــن و شــين ژ كــو تــە نــەمــا تورتــەگــەر[٤]

---

(١) پێويستە ل سەر مرۆڤێ سوفى مريدا لنەفسا خوەيا زۆردار ئەمين نەبن. ما شێخێى ئەحرار دى ژ كوبێت تە ژ دەستێ وى نەفسێ بينێ دەر و تەرەها بكە شێخێ ئەحرار كيە (الشيخ العارف بالله خواجه ناصرالدين عبيدالله بن محمود بن شهاب الدين احمد الشاشي السمرقندي النقشبندي الزاهد الملقب بالاحرار المتوفي في سلخ ربيع الاول من سنة ٨٩٥ خمس وتسعين وثمانمائه في قرية كمان كشان و دفن بسمرقند، صنف انيس السالكين في التصوف، العروة الوثقى لارباب الاتفاء. هدية العارفين ج٥، ص ٦٥٠).

(٢) فەراسەت و فرسەت هەر دوو ژ پادشاهينە (ژ خودانە) وەه چ سعوودە و چ قوبالە (ئيقبال) چاخێ ئەڤا هە دانى سەر سەرێ تە چ خەمە عالم د شەر دەبت يان گۆت گۆتا بكن.

(٣) وێنەيێن مرۆڤان هاتنە گورين زەلام وەكە ژنا ل خوە دكن ژن وەكە مێرا مرۆڤ وا ژ هەڤ ناس ناكە، ئەڤ خەسفا سورەتە، يا روچكا ئەڤ ئەشكەرايە يا نەديار گونەهێن مەزنن وەكە كوشتن و زنا و مەی خارنێ و ڕيبا و شەهدە زۆرى و گەلەكێن دى ژێ چاخێ گەنەهـ كر و پوشمان نەبوو ژ وێ كر يا پێرا نە ئێشا، ئەڤ ژى خەسفا نە ديارە باتنيە، خەسف دعەردێدا چوونا خارێيە، مەسخ ژبۆ نەكى ژ سورەتەكى دەردكەڤە دكەڤێ سورەتەك ديدان، وەكە ببێ مەيمون يان بەراز.

(٤) يا ئەو مرۆڤێ كو دراستيدا چونەيە ژ دلۆپەك ئاڤ هاتييە ئافراندن دبێژيێ كا ژ هەيكەلێ خوە بو من خەبەردە مانە ژ گۆشت و هەستى و ڕەهانە. ژينا تە و شينا تە ژ كو تە ئانيە هيچ تشتەك دى نينە.

جان چ تەشریح و چ تەدبیر هەندەسا صونعێ قەدیر
تیلی و چاڤێن موهر و ئیمزا وەهـ ژ مە ژی عیلم و ئەثەر[١]

ئەی دەرگەڤانێ خانیێ خان گەر نە درستی قەرە و یلی
بال کەسیڤە نە دە مەیلێ وی نەکە ترخانێ دەر[٢]

گەر تۆ شێرکێشێ خودایێ ژ وی تنێرا جان فیدایی
د خەباتێ بۆ عوبەیدە دل د دیندا شبی بەر[٣]

نە ل مالێ پرونە ل وێ گەردەنا ستوور ژ د نێرە
گوڕستانی مشك و ماڕا زێڕ و زیڤێ قاف و جەر[٤]

ئەی کەمەر بەستەیێ دونیا یار نە بین وەهـ چ نەیار
مەرحەبا تو ژی ب بیسی ڕۆژەکێ هەیدێ تو هەر[١]

---

(١) جان چ لێکدانە و چ تەدبیرە ئەڤ هەمی هەندەسا پیشەیا خودانێ قووەتێیە تلیێن مرۆڤ واژونە (ئیمزا) چاڤ موهرەیێ کەسی نە وەك هەڤن، وەهـ ژ مەژی ژی زانین و بەرمایێ مرۆڤ هەچی ژ وینە ئەوی ب خوە چو هەییێن نینە وەکە کەڤێیە هەچی ڕەگن.

(٢) یا ئەو کەسێ دەرگەڤانێ خانیێ خان خویێ یە گەر ب دروستی دەرگەڤانی (قەرەویل) دڤێت مەیلا تە بال کەسەك دووڤە نەبت و کەسەك نەکی تەرخانی دەریێ یانی دڤێت تو کەسی ئازاد نەکی بچیێ دمالدا، ژ عەبدیێ خەبەر ددێ دڤێت ژ خودا ڕا ڕاست و دروستبی.

(٣) هەکە تو شیر کێشبی بو خودا. (کورمانجی دبێژن فلان کەس شیر کێشێ فلان کەسێ یە) ژ وی تێرا جان فدای دڤێت دخەباتا خوەدا وەکە هەڤالێ پێخەمبەری بو عەبیدەبێ چاوا ژ دینرا خەبات دکر ددینێ خوەدە دلێ تە وەکە بەر بت و سستاهیێ تێدا نەکی.

(٤) ژبۆ دونیایێ مالێ پڕ و گەردەنا ستور چو کارێ وێ نینە بێ فەیدەیە هەر پاشیێ هیلانە و شونا وی گورستانا مشك و مارایە گۆشتێ وی دبێ خوەریێ وان. گەردەنا ستور فەیدا وی نەدا. زێر و زیڤێ ویژی دمینێ د قاف و جێرادە. ژ وا فەیدێ نابینە.

تو نەبێژە چەهڤێن ڕەش بۆ من تنێ کل کردنێ
سەد هزار ب ڕەحما زنێ هەر ڕۆژەکی کوشتن ب بەر[2]
د حەدیثێ سەری هەر گونهیە ڤینا تە دنێ
ژێ گەرانا وێ عیبادەت سێهرە بەندە ژێ ڤەگەر[3]
یا د دیندا دێ درست بی یا نە دێ دونیا پەرەست بی
دوو ژەبەش نابن د دەست بی ئەڤ مەحالە ژێ ب گەر[4]
دێر خڕاب دیارێ ثەمود بین یێ بلەز تیرا نەبوورین
فرتنا بایێ موخالف ژبەر کەڤەر ئاڤێت گەڤەر[5]

---

(١) یا ئەوێ کو ژ دونیایێ را کەمەر بەستەیە تو وێ ژ خوە ڕە یار و دوست نەبینە، وەهـ چ نەیارەك مەزنە هەکە جارەکی مەرحەبایەکی ژێ ببهیسی ئەوا ڕۆژەکی ژتەرا بێژە هەی دێ هەرە جهێ تە لبا من نینە ئەو ژی مرنە.

(٢) ب وێ نەوە خاپاندن نەبێژە چەهڤێن خوە یێن ڕەش ژبۆ من تەنێ کل کرنە تێدا و دوستا منە بەکلی هەر ڕۆژەکی زنایێ بسەد هەزارارە دکێ و پاشی و د ڕەجمینە ببەرا وا دکوژە دونیا نە دوستە نە یارە.

(٣) د حدیسێدا (رأس کل خطیئە حب الدنیا) هەکە مرۆڤ گەلەك حەز ژێ کرنا خوە گرێبدە ب دونیایێڤە و ژ ئاخرەتێ دوورکەڤە ئەو ژ مرۆڤا ڕە گەلەك زەڕەڕە و گونەهە، ژێگەرانا وێ یا دونیایێ خودا پەرەستیە. دونیا ساحرە سهرێ ل مرۆڤ دڤێت مرۆڤ ژێ ڤەگەرێ.

(٤) یان مرۆڤ د ئایینێ خوەدا وێ دروست بت یان دونیا پەرەست بت یەك ژ ڤان هەر دووایە. هەر دووکا ب هەڤڕا مرۆڤ نکارێ بگرێ وەکە دوو زەبەشا چاوا مرۆڤ نکارێ د دەستەکیدا بگرێ هەروەسا دونیا و ئاخرەتێ ژی ب دەستەکی نایێ گرتن.

(٥) دونیا دێرەکی خرابەیە نابێ مرۆڤ ژ خوە ڕە بخێ وار، دڤێت مرۆڤ زوو بلەز تێرە دەرباز ببت، وەکە دیارێ سەمموودە (ثمود: قبیلە بائدە یرجع تاریخها الی اقدم العصور، سکنە بالقرب من الحجر فی وادي القری وردة ذکرها في النصوص الآشوریة في عهد سرجون ٣، القرن ٨ ق.م)) المتجد ص ٣٠٣ د قورئانا پیرۆز دا د گەلەك جهادا هاتییە بەحسکرن. سەموود مدینة في جمهوریة الیمن)) سەموود ژ مللەتێ صالح پەیخەمبەر

گەهـ دیـار نـازك ژ گـور جـان دیـێم پـەری گـەردەن ژ مـەرجـان

دەڤ ل کـەن دل فلفلیـنم بـۆ تـەمـە قـەنـج ل مـن ب نـەر[۱]

ئـەو خشـیم گرتـی ب ملـدا پـەنجـەیـەك ئاڤێتـە هلـدا

دەرزیـەك ژ ژەحـرێ ل دلـدا مـال وێـران ژ ڕوح بـی خـەبـەر[۲]

ژ هـاڕۆت و مـاڕۆتی زێـدە سـحرە بـازو پـۆڕ فـەسـاد

قابیلـە هابیلـە ل پشـتێ کوشـت برایـێ لال و کـەڕ[۳]

---

بـوو. چاخێ دەڤەها صـالح کوشـتن یـێ کوشـتی ژی ناڤێ وی قیدار بـوو. خـودا جـەزادان بایـەك ل وا پەیـدا بـوو ئـەو جهێن وا یـێن ئاسـێ و قـاهیم بـو لات کـولا بـوون کربـوون شـکەفت ژوا وەیـە کـەس نکـارێ ب وان ببـارێ خـودا ئـەو بـرن هـەلاکێ خـودا دبێـژە: [وثمود الذين جابوا الصخر بالواد] (الفجر: ۹) ڤێ فرتینێ و چاوا ئەو برن هەلاکی وەسا فرتینا دونیـایێ ژی ل مـرۆڤ ددێ مـرۆڤ دبـێ هـەلاکی فرتینا بـایێ وێ یـێ نەڕاست ژبـەر گەڤەر تاڤێژێ گەڤەری، بەر گەڤەر ل بوتایە، گەڤەر ژی ل جولەمێرگێیە.

(۱) جارنـا دونیـا ژ مرۆڤـرا دیـار دبـە وەکـە ژنـەکێ نـازك و ژنـەك گـورجی. ژنـێن گورجیـا گەلـەك لاون. ڕوویـێ وەکـە ڕووێ پـەریان پـەری ژنـێن جنانـە) گـەردەنا وێ نـە ژ مـەرجانێ دڤـێ وێ ل کەنـە و دلـێ خـوە ب مـرۆڤ ڕا دکـە دبێـژی بـۆ تەمـە بـاش ل مـن بنێـڕە ئـەڤ ڕەنگـی دئێتە تەمسیلا ویە شاعێر تینە بەر چاڤێ مرۆڤان.

(۲) د مالـکا بـەری ڤێـدە ژ سـێهرەبەندیا دونیـایێ ئاخاڤت گـۆت جارنـا خـوە وەکـە ژنـەك لاو پـەری ڕوویـێ خـوە نیشا مرۆڤا دکی ئـەز بـۆ تـە تنـێ مـە مـرۆڤ خەشـیم بـت و نـەزان بـت وێ بملیـێ وێ بگـرە و دبێژە تـو بـو منی. دونیا پەنجـەکێ لیددێ و ئـەوی دئـاڤێژێ دەرزیـەك یـا ژەحـرێ ل دلـێ وێ ددە کـو دەرزی یـا حەرامیـە مـالا وی وێـران دکـە ئـەو ژ رحـێ خـوە بـێ ئاگەهە کاوارێ وی کو دەرە لێ ئاگرە.

(۳) هارۆت و مارۆت دو مەلەکن د پەرتوکا پیرۆز دا د سورەتێ البقرة دا نـاڤێ وان هاتیـە. کـو مرۆڤـان هینـێ سحرێ دکـەن [وما انزل على الملكين ببابل هاروت وماروت] (البقـرة: ۱۰۲) دبێژێ ژ هـارۆت و مـارۆت زێدەتر دونیـا سـحر بـازە و فەسـادە وەکـە قابیلـە چـاوا برایـێ خـوە هابیل کوشت پشتا خـوە و گـەراند نـەزانی چـاوا ڤەشـێرێ ((ئـەڤ هـەردو کـورێن ئـادەمن،

یێ تە خاپاندی ب سۆزێ تە گەهاندی بەر بەروسی
ئاخر کارەك ژ تە نەدیت ما بێ جهـ و وار و بەلەدەر[١]

دێ ب مالێ تە دنێ دل خوەش نەکت مەرڤێ خودێ
چ فەلاکەت چ هەلاکەت فتنەئێ ئاڤێت سەقەر[٢]

فتنە ڕازیە کەسێ هشیار بکەت لەعنەت ل وی
چاخێ ئاگر گرتە ڕێلێ دێ ب صۆژت هشك و طەر[٣]

دێ چ بێژم ئەز سارۆقێ دونیا ڕووڕەش و عار
ئەو دنە سەیدێ عالەم لەعنەت لێکر دیت ضەڕەر[٤]

---

ئەوی ستەم ل برایێ خوە کر. دونیا ژی وەسایە ل کەسێ نا بووره داویێ هەر کەسی دکوژه و ژناڤ دبە دلێ وێ ب کەسێ ناشەویتە.

(١) ئەوێ سۆز ژێڕا دابێ پلا وی بلندکری وەکە بەر بەروز لێکر داویێ کارەك ژ تە نەدیت مایە بێ جهو بێ وار و بێ بەلەدە. (فخر الدین بربروسی دوو برا بوون ژ قەراصنە تورکان د چەرخێ شازدێدا دەولەتا جەزائیری دامەزراندنە) المجد بربروسی (فردیك) ١١٩٠ ئیمبراتۆڕی ئەلمانی.

(٢) ب مالێ دنێ مرۆڤ خودا پێ کەیفخوەش نابە. چ فتنەیە چ هەلاکەتە دونیا فتنا وێ مرۆڤن تا ڤێژە سەقەرێ، سەقەر جهنەما سارە.

(٣) تێکڤەدان (فتنەیە) بێ دەنگە دڤێت مرۆڤ هشیار نەکێ. قاسدێ خوەدێ نفرین لوی کریە ئەوێ وێ ژ خەوێ ڕاکە (الفتنة نائمة لعن الله لمن ایقظها) خودا فەرمان دکە [والفتنة أشد من القتل] (البقرة: ٩١) فتنە ژ کوشتنێ مەزنترە. فتنە وەکە ئاگرییە چاخێ ئاگر دگرە جهەکی بدار و قەوالیێ تەر و هشك تێکدا دسوژە، فتنە ژی وەسایە چاخێ کەتە ناڤ وەلاتەکی یێن قەنج و نە قەنج پێکڤە دچە.

(٤) دونیا ڕوو ڕەش و بێ عارە فەدی ناکە ئەوا کو سەیدێ عالەمێ کو موحەمەد نەفرەت لێ کریە گۆتیە زیانا وی هەیە (وقال رسول الله صلى الله عليه وسلم ((الدنيا ملعونة ملعون ما فيها إلا ما كان لله منها) رواه الترمذی وحسنه وابن ماجه من حدیپ ابی هریره وقال رسول الله صلى الله عليه وسلم: حب الدنيا رأس كل خطيئه، ابن ابی الدنيا أحياء علوم الدين، ص ١٩٩) هەسکرنا دنێ سەرێ هەمی گونەهارایە.

ذەڕەكی د دیندا تو نینە چلەكێ عەیب و برینن

چاڤ نەدە مالێ فەقیرا ژ بن وی باری نا یی دەر[1]

گونەهێن خۆ هندك نە بینە خێرا ل بەر گونەها بكشینە

دەفتەرێ هەر ڕۆژ بخوینە كەنگی تێنە سەر ب سەر[2]

پاریو زەیت نە تەمیز بت پلیت و دل دێ چكن

چاخێ خامە چەپ خەبات كر ل عالەمێ ڕاهێ گوزەر[3]

د چلێ كا تە زەكاتا شەڕە فاتێن ژ خودێ ڕا

قەرە واشێ خانا ئیبلیس وەزنە دارێ كاڤ و كەر[4]

نە گەهشت دونیێ ب لاوینی ل صەدێ قەت د گەهێ

ناگەهی وێ سەحەر بازێ گەر ببی باز و صەقەر[1]

---

[1] زەڕەكێ خوە مەزنكرن دئاییندا نینە. مرۆڤێ چلەك بت د ئایینێ ویدا دبێ عەیب و برین چاڤێ خوە نەدە مالێ فەقیر و بەلنگازا تو ژ بن وی بارێ گونەها دەرناكەڤێ.

[2] مرۆڤێ زانا و ژ خودێ ترس گونەهێن خوە هندك نابینە چاكی و گونەهێن خوە ددێ بەرهەڤ و هەر ڕۆژ ل دەفتەرا خوە دنێرە كا گونەهێن وی چاكیێن وی سەر ب سەرن وەك هەڤن یان نە.

[3] پاری یانی خارنا مرۆڤ، هەكە ئەو خارن نە حەلال بت خارنا وی حەرام بت دلێ وی دێ ڕەش بت داخوازێن وی كریارێن وی پەسەند نابن. ما دل وێ چ بكەت وەكە وان كەسێن خوە ژ حەرامی ناڤەدن و دبێژن شەڕت دلێ مرۆڤە. ئەو دوهنێ، زەیتا دكن چراییێدا چاخێ نەپاك بت و تشتەكی ناڤدا هەبت ڕۆناهی ژێ ناچت، وی دەمی ما پلید دێ چبكێ هەر بلا پاك ژی بت.

[4] چاخێ مرۆڤ چل سالی بۆ مرۆڤ كامل دبت وێدەمی چاخێ خوە نێزیك كرنا بال خودا ڤەیە. چاخێ تەوبێیە هەر وەكی مرۆڤ چل لیرە هەبن یان چل پەز هەبن دڤێ مرۆڤ زەكاتێ ژێ بدە هەكە تە ئەو زەكاتا چ لێ نەدا ژ خوەدێرا، وێ چاخێ تو قەرواشێ خانا ئیبلیسی بی تو وەزنەدارەك كاڤ و كەڕی تە ڕاستی نە بهستیە.

پیـــرەمێـــر ل عـــەینـــێ بنێـــڕە دا تـــو بیخـــێ خـــۆ ببـــین
بـــەس گـــەدابـــە ژ د نێـــڕا بـــەس ب قـــارە ژی بـــەقـــەر[٢]
یـــێن د شـــیل و پووچـــا پیـــرا قـــەنجتـــرین لاوان ئـــەون
کالێن کوتەك لاو نەقەنجن جان پەرست ل ڕوهـ زوو ڤەگەر[٣]
حکمـــەتـــا بـــاری تعـــالا ڕە و ســـنبێل دانـــە مێـــرا
دا ژ ژنـــا کفشـــی وجـــدابن نـــە ب دیلبـــەر د یـــلاوەر[٤]
ژ هـــەر د وان یـــێ کـــو ژ شـــکل و ڕسـما خـــو دەرکـــەڤـتن
دەزگـەهـــێ خـــالق خـــرا کـــر بـــێ ســـەر و بـــێ جـــل و بـــەر[٥]
مـــوییێ ڕەش قرکـــا ڕەشـــە ئاگـــەهـــ ژ پیـــر بینـــی نـــەهـــن

---

[١] بدە هزرا خوە چاخێ تو لاو تە نەکاری دونیایێ زەڤد بکی، د سەد سالیێ دا تو دێ چاوا بگەهێ دنێ. ئەو سیحرە بازە تو چەند زیرەك ژی بی وەکە بازەهـ و سەقەر ژی بی تو ناگەهییێ ژێ بگەرە.

[٢] پیرەمێر کا جارەکێ تو هەرە بەر نەینکێ تو ل خوە بنێڕە دا تو سەر و روویێ خوە ببینی چ ب سەر تە هاتیە بەس ژ دونیایێ ڕە گەدابە خوە زارۆك ببینە، بەس ژێرە وەکە پێژ بقەرە ئانکو ژێ بگەرە.

[٣] ئەو لاوێن چاك و قەنج ئەون یێن د شوپا پوچاتیا پیرادە نەچن ئەو کالێن کوتەك و زالم، ئەون کو دلاوینیا خوەدە نە قەنج بوون جانێ خوە دڤیان هایێ وان ژ دوهێ وان نینە، زوو ڤەگەر ل روهێ خوە ژبۆ خەلاسکرنا وێ خەبات بکە.

[٤] یەك ژ حکمەتا خودێ یە دە و سمبێل دامە مێرا. ب ڤانا ژ ژنا تێنە جوداکرن بێ دە و سنبێل نە ب ڤیانا دل و حەزکرنا خوەنە.

[٥] ژ هەر دووکا چ مێر و چ ژن بت بکێر نایێ خوە ژ ڕەنگ و بەرگێن خوە دەرکەڤن، مێر وەکە ژنا ل خوە بکێ و ژن وەکە مێرا ل خوە بکێ د ڕێ و ڕەسمێ خوەدا حەرامە نەباشە قاسدێ خوەدێ دبێژە (عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: لعن رسول الله صلى المتشبهين من الرجال بالنساء والمتشبهات من النساء بالرجال) رواه البخاری (عن ابی هریره رچی الله عنه قال: لعن رسول الله الرجل ابلبس لبست المرأه وامرأة تلبس لبست الرجل. رواه ابو داود بإسناد صحیح).

یێ سپی بوو وەکی بوومێ خلوەگاه تەحت و کەڤەر[١]

مویێ ڕەش چاخێ سپیکر تو کری پیر و مەزن

ل بەر سەرایێ هومایونی شیرەتکا ڕوو دەفتەر دەر[٢]

لازمە تو ژی علاقێ ژ نەیاران ببڕی

ریسپیێ دیوانا پادشاهـ زەڕکەشێ پادشاهـ ل بەر[٣]

دەستێ چەپ دێ ل ڕهێ بت دەستێ ڕاستێ لبەر دوعا

ب حۆڕەمەتا ڤێ سونەتێ یا ڕەب ب عەفوێ ل من ب نەر[٤]

ڕۆژ ب ڕۆژ بۆ من ب بێژ (الموت الموت) وەك عومەر

چاخێ مویێ من سپی بوون قاصدێ مرنێ د بەر[٥]

ژین و شینێ بدە عشقێ و شیر و زین جامێ حەبیب

---

[١] چاخێ مو وێ مرۆڤ ڕەش بت قڕکا مرۆڤ ڕاست و دروست بت یانی مرۆڤ خورت لاو بت های ژی پیریتی نینە. نزا ڤێ ڕۆژ وێ بێت مو یێ سپی بوونە قرك چەرمسیە پیربوویە. ئەو سەر و ڕوویێ سپی بوون وەکە پەرەندێ بۆمی خلوەت خانا وێ وەکە بومێ دبێ لات و کەڤر دا قەنە خودا پەرستیێ بکە.

[٢] چاخێ خودا ئەو مویێن تە یێن ڕەش سپیکرن ئەو پەڕوکەکە ل تە دکی و تە دکێ ریسپی و پیر و مەزن، تو ژی دڤێ وێ مەزنیێ گرنگ بزانی تو دبی شیرەتکار چاوا ملوکا و پادشاها شیرەتکار و دەفتەردار هەنە ژ وا ڕە دبێژن رسپی.

[٣] وێ دەمێ پێدڤێیە تو گرێدانێن خوە ژ نەیاراڕا ببری. تو دبی رسپی دیوانا خودا زەڕکەشی خودا ل بەر تەیە، سەر و رهێن تە سپینە، زەڕکەش ئەو پەردا ب تاییێن زێر هاتی نەخشاندن.

[٤] دەستێ تە یێ چەپێ دێ ب رها تەڤە بت و دەستێ تە یێ ڕاستێ وێ بلند بە ژ داخوازان ڕا (دعا) برومەتا ڤێ سونەتێ یا خودا ل من ببووره و ل من بنێڕە ب چاکی دڤێت تو ژ رها خوە فەدی بکی و گونها نەکی و خوە ژێ ڤەدی.

[٥] خەلیفێ دوویێ خودێ ژێ ڕازی بە ژ خوە ڕە گرتبوو هەر ڕۆژ تو وێ بێ ژ من ڕە بێژی مرن مرن هەیە دا ئەز خەلەتاهیا نەکم، چاخێ مووێ من سپی بوون ئێدی بەسە ژخوە قاسدێ مرنێ هات ئەو دبێژێ ڤایە مرن نینن ئەز هەڕو دبینم.

سۆز د ڤێ فەرهاد و مەم بت زندان و لات و کەڤر[1]

جان مەقاماتێن حەبیبی دل حەڕا وەحی و نزول

طۆڕسین نوٚڕ و تەجەلی وەهە چیا زێڕ و زەبەر[2]

ژ خال و نیشانا ب پەیڤم یان ژ هەفت ڕەنگێن د ڕۆژێ

یان ژ ستێرێن دەڤ لکن طاووس و لالێن صوٚڕ و زەر[3]

دەزگاهێ نەقاشێ عالەم سستیەك ما تێ هەیە

ژ ڕۆژ و ستێر و فەرەشینان گول و چیچەك د ب هەر[4]

ژ شەهپەر و زولفێن ڤەدایی چەهڤ و برو نیشان و خال

---

(١) بلا عەشق هەمی ژیانا تە و هێزا تە بت چاوا شرین و زین نەنیکا حەژێکەرێ خوە بو عاشقێ زینێ ل جزیرا بوتان (مم) مەم بوو. و ل کوردستانا ڕۆژهەلات عاشقێ شیرینێ فەرهاد بوو. ڤان هەردو عاشقا سۆزا ڤیانێ دابوون مەعشوقا خوە هەتا مرنێ یەك دزیندانێ دە مر ئەو ژی مەم بوو یەك ژی لات دکولا دابگەهێ مەعشوقا خوە ئەو ژی فەرهاد بوو د وێ لاتێدە مر. هەر دوو ژی خودانێ سۆزا خوە بوون. هێزا خوە و ژیانا خوە گوری عەشقا خوە کرن. مرۆڤێ باوەرمەند ژی د ڤێ وەکە وانبن دعشقا خودێدا.

(٢) ڕحێ مرۆڤ دڤێت جهێ حەژێکەرێ خوە بت و دلێ وی وەکە شکەفتا حیرایێ بت ئەوا کو پەرتووکا پیرۆز ژ قاسدێ خودێ را هاتی دبێژنێ (جبل النور) چەند ڕۆژەك بەری ڤێ نڤیسانێ من زیارەتا وی چیای کر، نورها خوەدێ چاخێ ل چیایێ تورٚ و سەینا دیار بوو چیای خوە ل بەر نەگرت هەرڤی و حەلها.

(٣) مرۆڤ ژ دەزگاهێ خودا ب پەیڤە، گەلو ژ خال و نیشانا ب پەیڤە یان ژ هەفت ڕەنگێ ڕۆژی چاخێ کەسکەسور چێدبن ئەو ڕەنگ تێدا خویا دکن. یان مرۆڤ ژ وان ستێرێن دەڤ لکەن باخڤێ یان ڕەنگێ تاووس و گولێن لالە ئەوێن سور و زەر هەمی نەقشێن خودانە.

(٤) ما د دەزگاهێ نەقشێن خودا دە کێماسیەك هەیە یان سستاهیەك هەبت، نە نینە ژ ڕۆژێ و ستێرا و زۆزانان و فرەشینان و فەرەشین زۆزانەکە دکەڤێ سەر توخوییێ جولەمێرگێ ناڤ بانگە دکوردستانێدا. یان مرۆڤ ل گول چیچەکین بهارێ بنێرە چەند خوە ڕسپەهی کرنە و لاوی تی دایە وا.

عالەمێ صەد طەعن ل ڕۆژێ ژ گور جیێن شەرقا تەتەر[١]
ئەهلێ حال ل سوبحانە تەسبیح ل ئارارات چ صەفا
ژێ نزانێ سامری گولك کرە گۆڤەند و گەر[٢]
ژ قەلەسە مێرا ئەوە لاشێ قەنجە مێرە نا ئیشتن
تا نە ئێشی نابی پیشی وەحشی یێ لات و کەڤەر[٣]
من دی وجدان پۆڕ د گریا شەرم ژی ل مە نە ڤەگەریا
ل سەر مە هەیکەلێ کەرێ کەریا سەرێ بێ هش نەکە سەر[٤]

---

[١] هۆزانڤان ژ دەزگەها خودا ئاخڤێ و پەسنا وا دەستچێکەرێ قودرەتا خودا ددە ژ شەهپەر و زولفا بەژن و بالا و ژ چەهڤ و خال و نیشان ئاخڤێ کو ئەو قاس رندی و دەلالی ل دنێدە هەیە ئەڤێن هە ژ ڕندیا خوە سەد تەعنا ل رندیا ڕۆژی ددن. هەروەسا مرۆڤێن کورد ددێ ل کوردستانێ کو ناڤێ وێ ب ڕۆژهەلات ئینایە دبێژێ د ڕندیا خوە دە وەکە گورجیانە. مرۆڤێن گوڕجستانی ب ڕندی ناڤبانگن دبێژێ لاو و زەریێن مە وەکە وانە د ڕندیا خوەدە.

[٢] ئەوێن ئەهلی حالن یان چاکێن خوەدانە ئەوێن کو ل تشتەکێ دنێرن زمانێ حالێ وێ دزانن. دبێژێ چاخێ ئەهلێ حال ل چیایێ سیپانێ خەلاتێ دنێرن تەسبیحا ژی دبهیزن. (سبحان داغ) چیایێ تەزبیح راسەری گۆلا وانێیە زۆزانە بناڤبانگە و جهێ عاشق و مەعشوق سیا ئەحمدێ سلیڤی و خەجا شەنگ ئەو ژی نە گەهان مرادا خوە بەحسا چیایێ ئاگری دکی (ئارارات) دبێژی چ سەفا تێدا هەیە. د پەسنا کوردستانێ دە مووسا سامری ژ مەزناهیا خودێ نەزانی پەیکەرێ گولکی چێکر و گوڤەند ل دوورێ گرتن و ڕەقسن، مەسەلا وی د پەرتووکا پیرۆز دە هاتیە.

[٣] ژ گۆتنێن پێشیانە دبێژن: ژ قەلسە مێرا وەیە لاشێ خوەشمێرا نا ئیشە، هەتا تو نە ئێشی و زۆر و زەحمەتی نەبینی تو نابی پیشی و سەرۆك یان نەزانێ لات و کەڤەرێ.

[٤] من دیت ڤی زەمانی وژدان پر دگریا دلێ وێ بحالێ وێ دشەوتی کو کەس لێ نابە خودان، شەرم ژی چوو ئێدی نە ڤەگەرا کەس ژ کەسی شەرم ناکە، ل سەر مە پەیکەرێ کەرێ کەریا بوونە مەزن و ڕێبەر، سەرێ بێی هش ژ خوە ڕە نەکە سەر و

دەزگەهێ تە نەدوروست بی دێ نمیچکا ژ تە چێکن
سوج ژ تەیە ل کەس نەکە لومێ ما سەکانی نەکە شەر[١]

من تو شاهد ژ خودێ ڕا مەزهەب من سونەتە
نا کن ئەم تەفکیرا ئەهلێ قبلێ میثقالە ذەڕ[٢]

قەلب و قالب مە ب خالقڤە گرێدا مە بڤین
مە ڤینێ تە دڤێن نەذڕە مە ئەڤ فکر و خەبەر[٣]

جۆڕەئەتا ئەهلێ ئیجتیهادێ وان دەلیل (من سنة سنة)
دێ د سەروا دا بێن ئەم ب تەحن و عەڕن و چێر و بەر[٤]

دین هەمی ئای و حەدیثن سەختەکاری تێ نەهن
ئەو خەباتا وان نە ڕەئیە ژ ڕۆهنیا شارع نەدەر[١]

---

ڕێبەر و سەرۆك، ل کوردستانێ دناڤا کەر و بیرێن پەزی دا کەر هەیە کو کەلوپەلێن شڤانا هلدگرێ و جار جارا شڤان ژی لێ سووار دبن سەروکێ نەزان ئەو ژی وەکە وینە.

[١] د ڤێ دەست کر و دەزگەهێ مرۆڤ چاکبت. هەکە دەزگەهێ مرۆڤ نەباشبت وێ دەمێ هندە وێ (نمچکا) کێماسیا ژ تە چێکن. وێ دەمێ خەلەتاهی و سووج ژ هەیە و لومێ ل کەس نەکە خودا دبێژە [فلا تلوموني ولوموا أنفسكم] (ابراهيم: ٢٢) لومێ ژ خوە بکە. ناڤێ بەرەبابێ شاعێر (قبیل) ماسکایە دبێژە ماسکانی نەکە شەڕ.

[٢] تو ژ منڕا شاهدبە بۆ خوەدێ مەزهەبێ مەزهەبیێ ئەهلێ سونەتە و جەماعەتە ئەم هنگە مسقالا زەڕەڕێ ژ ئەهلێ قهبلێ را کوفرێ نادن بال وانڤە نابێژن کافرن، وە شیعە و خەوارج و زەندیق هندی ژی.

[٣] قەلبێ خوە و قالبێ خوە ب خالق ڤە گرێدایە هەمی هەینا خوە من دایە خودا کو ب ڤایانا خوە و مە ئەو کەسێن ژ تە حەز دکن ئەم ژی ژ وا حەز دکن ئەڤ هزرا مەیە و ئەڤ گۆتنا مەیە مە ل سەر خوە ئەڤا هە نەزرکریە.

[٤] ئەهلێن ئجتهادێ ئەوێن خودانێن مەزهەبانە جورئە تاوا ژ ڤێ حەدیسی بۆ من سونەتە. هەر کەسەکێ ڕێیەك چاك نیشا مرۆڤا بکە ئەو خودان خێرە وەکە ویێ وێ دکە. ئەوێن ڕێکا خڕاب نیشا مرۆڤا بکن ئەمێ ژ وا ب عەنڕین و دوژینا ژ وارە بدەن، و بەرا ل وا وەرکن.

قورئانـــا مـــه ئـــهجـــهزاخانـــه چ حـــهياتـــهك ئـــهبـــهدى

تێـت ژ نـاڤ لێڤـێن حـهبيبـى چ حـهكيمـهك دهسـت ڤـهكـهر[٢]

لازمـــه پـــهيغـــام ديـــار بـــت ڕههبـــهرێ مووســـا ميثالـــه

ئـــالێ فرعـــهون بـــۆ خـــۆڕاكر ئـــاخر بـــوو خـــۆرن و نـــهيـــهر[٣]

ڕههبـــهرێ ڕاهـــێ حـــهقيقـــت ســـونهت و قورئـــان د دهســـت

حـــارثى قاصـــد چ ســـوجبوو غـــهســـانى كوشـــت ب داروبـــهر[٤]

حـــهبيبـــێ بـــۆ يـــههـــودى (يصـــلح و يهـــدى) دعـــا

شـــيوهئـــێ ڕهحمـــهتـــێ عالـــهم بـــهســـه عالـــهم ژ فكـــهر[٥]

جـاهێلێ ديسـا ڤـهگـهر يـا مـه ئـهبـى جـههـل نـه يـهك و دوو

---

[١] ئـايين هـهمى ژى هـات (ئايـهت) گـۆتنێن قاسـدێ خـودێ نـه (حـهديس) خهلـهتاهى و نـه دوروسـتى تێدا نينـه، ئـهو خـهباتا ڕێڤـهبـهرێن دانيـارێن شـهڕيعهتێ نه بريـارا وايـه بـهلكـى ژ ڕۆناهيا دانهرى يانى خودايى دهردكهڤێ.

[٢] پـهرتووكا (قۆڕئـان) مـه يـا پيـرۆز وهكـه دهرمـان خانێيـه ژبـۆ ژيانـا تـم تـم (ئهبـهدى) هـهمى دهرمـان و نـوژدار تێـدا ههيـه، ژنـاڤ لێڤـێن حهژێكـهرى تێتـهدهر چ زانايـهك دهسـتێ وى ڤهكريه، ههر تشتهكێ د جهێ وى داتينه.

[٣] پێدڤيه (پيغام) داخواز ژ ڕێبهرى ديار دبت، نهبى مووسا وهكه نمونهيه، فيرعهون و مالباتا خوه ژ خوه ڕه مووسا خودان كرن و ڕاكرن د داوييێدا ژ وارا بۆ دژمن و نهيار و حوزن.

[٤] ڕێبهرێ ڕێيا ڕاست ئهوه كو قۆڕئان سونهت ددهستێ ويدا به و بۆ وێ بريـار بده و ژ قورئـان و سنهتێ دهرنهكهڤێ حـارس بـاپيرێ ئوسـامه كـوڕێ زهيده ب قاسـدى ڕێكـر بـوون لايـێ مهلكێ غهسانى مـهلكـى ژى ئـهو كوشت سووج و سـهبـهب نـهبوون ئـهڤ قاسد بۆ قاسـدا نائێته كوشتن ئهڤ مالك پێ تهمامكريه.

[٥] حهژێ كهرێ منى يانى قاسدێ خوهدى. ژبۆ يهكى جهۆ ڕا داخواز ژ خودا كـر كـو خـودا وى بينێ سهر ڕێكا ڕاست و وى چاك بكێ. يانى ژبۆ مسلمان و نـه مسلمانا ڕه وهكـهڤ داخواز دكر. ئهڤهيه كو خودا كريه دلوڤان ژبۆ عالـهمێ ژ هـهر كـهسـى را ڕهحمـهت بـوو ئهڤه بۆ بهرزاهيا قاسدێ خودا.

مونەكرات كرنە شەريعەت موبتەدا ما بى خەبەر[١]

دێ تەوەكل پوڕ قەوى بت چاق ل مال دارى نەبت

ڕانەبە كورسيێ وەعظێ بێ قەناعەت چاڤ ل دەر[٢]

گەر دڤێ ژ عالەم ببى ڕۆژ ژ عالەمێ ڕا نوٚڕ و تيرۆژ

بچنە ژ بوخچێ دنێ عيلم هەم ببى نامە گوذەر[٣]

كوڕێ بێ چەهڤ وەكى كێزێ ب گول و دوردانە چ حاجەت

عيلم ل دەرێ حومق و سەفاهەت و لەو و لەيتێن بێ ثەمەر[٤]

---

[١] نەزانين و جەهالەت ديسا ڤەگەها پشتى كو خودا ب ئايينا ئيسلامێ نەزانين ژناڤ بربو و ڕۆناهيا مسلمانيێ بەلاڤى ناڤ عالەمێ ب بوو. د چاخێ قاسدێ خوەدێ دا يەك بناڤ بانگ د نەزانيندا هەبوو ژ هۆزا قورەيشيا بۆ زێدە ناڤێ وى ئەبو جەهل بو وێ چاخێ يەك بو نها (ئەبو جەهل) زۆر بوونە نە يەكو دونە. تشتێن نە ڕاست و نە مەشروع كرنا شەڕيعەت و چاك ديتنە. وەكە تو بێژى زەيد و نەبێژى قائيم مەبتەدا هەبێ خەبەر نەبت، يانى نە چاكيێ بكێ چاكى.

[٢] دڤێت مرۆڤێ مسلمان ب خودا ڤە گەلەك گرێدايبە و تەوەكولا وى گەلەك قايم بت چاڤێ خوە نەدە مالێ و مالدارى، ڕسقێ خوە ژخودا را بخوازە، ئەوێ دلێ وى نەتێر بە و چاڤێ وى ل خەلكێ بە دڤێ ئەو نە ڕابە سەر كورسيێ و وەعزێ و شيرەتا.

[٣] شيرەتێ دكێ دبێژێ هەكە تە دڤێت ژناڤا عالەمێ تو ببى وەكە ڕۆژێ و ژ عالەمێ را ببى ڕۆناهى تيرۆژ، ژ باخچە و بوستانێ دونيايێ ژخوە ڕە زانين و علم ژێ بچنە دا ناڤێ تە دەركەڤێ مرۆڤ ب زانست و عيلم دگەهێ پلەيێن بلند و بالا.

[٤] يێ كور بت بێ چاڤ بت چ حاجەتا وى ب دوورى و ئەو تشتا دوورى تێخن تێدا هەيە ژبەر كو نابينە ژ وێرە فەيدا وى نينە كێزكا گوگەرێن ئەوێ ژ چ حاجەتا وى ب گولى و بێهنا وێ نينە. ژبەر كو ژويرا نە تەبايە حەز ژ بێهنا پيس دكە مرۆڤێ نەزان و جاهل وەكە يێ كورە كێزێيە، فەيدى ژ ڕۆناهيا زانينێ وەرناگرە زانست (عيلم) ل دەڕێب بێ هش و ئەحمەق وەكە لووليتێن بێ فەيدە بە دبێژن (لو كان كذا لو كان كذا) هەكە وەها بوويا وێ وەها بوويا. ئەو فايدە نادە.

ژ ئـــێش و ژانـــێن تـــه دنـــێ یـــەك ب ســـەلامـــەت قـــەهیـــە

یـێ ژ دەسـت تـە ڤـەڕەسـا بـت ژ نـو ڤـەژیـن دێ لـێ ڤـەگـەر[١]

یـــێ د دیبســـــتانا ئیبلـــیس دەرس تـــە دایـــێ ژ خـــودێ کـــر

یـێ تـە شاشـی کـر وەك خـولێکر دێ ببـت طـۆڤێ خـوەخـوەر[٢]

یـێ ل بـەر مـەمکـا قـەلـەو کـر ب کـەیـف و ڕەقصـا سـامڕی

پاشـەهیـك دێ لـێ نـەیـار بـی وەك پسـیکا چێلـی خـوەر[٣]

بـــێ دەواق دونیـــا گولســـتان مـــەســـت بلبـــل جـــەز بـــۆ نـــال

فـــەڕەشـــینە نێرگـــز و گولـــدا لـــێ بـــەلـــێ دووما چـــەڤـــەر[٤]

---

(١) شکایەتێ ژ دنێ دکە و دبێژە: ما گەلو یەك هەیە ژ ئێش و ژانێن دنێ مایە پارستی و سەلامەت نەمایە، ئەوێ ژ دەستێ دنێ ڤە هەرە سابت ژ نوڤە ژیان لێ ڤەدگەرهێ.

(٢) ئـەو کەسـێ د دبسـتانا شـەیتانی دا دەرسـێ خوەنـدنێ ئـەو ژ خـودا بوویـە و ژ خـودا دوور دکەڤە، ئەوێ تە شاش کر وەك خوە لێ کر چاکی د وێدە نامینە دبە توڤێ خوەخور دبێ نەیارێ ڕحێ خوە وەها ژ دنێ ڕە دبێژە.

(٣) ئەوێ دونیا وی ل بەر مەمکێ خوە قەلەو کر و ب کـەیف ڕەقسـی وەکـە مووسا سامری چاخێ گولك چێکر و گۆتە کورێن ئیسرائیل ئەڤ خودایێ وەیە و نەبی مووسا ژبیر کربوو، ئەو ژی ژێ ڕا ڕەقسین، پشتی تە ئەو قاس کەیف ژێ دیت، ئەوا ببە نەیارێ تە وەکە پشیکا چێلێکا خوە دخوێ.

(٤) دەواق پەیڤـەك کوردیـا کەڤنـە ل دەڤـەرا مـە یـا بوتـان تێتـە بکارئینـان. چـاخێ ڕۆژێـن جەژنان هێك بەرهەڤ دکرن بو وا دلەیستن. دگۆتن کا ئەز هێکا خوە ب دەوقینم ل ددنانێ خوە ددان کا قاهیمە یان نە پاشی لێکددان کیژان بشکە و ستاند دگەها ئێ دی جەڕیانـدن (دەوقانـدن) مـرۆڤێن دونیـا نـە جەربانـدبێ ژێ نزانبـە دبێژیـێ وەکـە گولستانێن باخچەیێ گولایە ژێرا سەرخوەش دبە وەکە بلبلی ژ گولێرا مەستە و نالە نالا ویە دونیا وەکە زۆزانێ فەڕەشینە نێرگز و گول تێدا شین دبن. لێ خوە ناگر دبێ دومە. دوما وێ وەکە دوما گیایێ چەڤەرێمیە، چەڤەر گیایەك زۆزانیە زوو د بەیێ دونیا ژی وەسایە.

بــەس ب ڕەقصــە تــە نــە نێــڕی ڕەقصــا گــولکێ ســامڕی

وەرە ئیمــانێ بــدە عــەینــێ وەهــ چ عــەیــب و چ دەڤــەر[1]

هــا پیریتــی ب هــزار عــەیــب ل تــە دەرکــەڤــتن

تــە بکــت قوچکــو لاوینــێ بــت ئاهــ و کــەدەر[2]

ضــەعــف و عــەجــەز ئیختیــاری ئــێش و تــاو و ژان و ژاری

ڕەشــەك و طڕســن ژ بــاری حــەوجــەهــی بــین ل مــن ڤــەگــەر[3]

یــێ خــودای نیشــا تــە نــا دت حــال نــەبــت وی نــەکــە هــەڤــەرێ

د مســك فرۆشــدا تــەیــە فــەیــدە د کــورە حــەدا دە ضــەڕەر

ژ هــود هــود و مێرویــێ ئــازادی و حۆڕیــەت تــە چ دەرســن

مێرویــێ هــاوار ل لــەشــکەر ژ ســەبــەئ هــود هــود خــەبــەر[4]

میــروو و پێشــی دێ نــە ئێشــی پــوڕ ژ وان ڕا تــو ب ئێشــی

ئومــەتــا حــەیــوانی نــەفســەك هــەیــە مینــا یــا بــەشــەر[1]

---

[1] بەس ژ دنێرا برەقسە وەکە رەقسا گولکا مووسا ساحریە ئەوا ژ خشرێن فرعەونیا چێکری. گۆتە: بەنی ئیسڕائیلیا ئەڤ خودایێ هەوەیە ژێ ڕا ب ڕەقسن کا وەرە باوەریا خوە بدە بەر نەینکێ تو دێ بینێ چەند دەڤەر و عەیب تێدا هەنە.

[2] نێزیك پیریتی ل سەر تەدە بێت هزار عەیب لتە دەردکەڤن بەرێ د گۆتن پیریتی و هزار عەیب، پیریتی وێ تە سەر ئێکدا ببت تە بکێ قوپك. لاویتی ژ تەڕا دبت ئاهـ و کەسەر.

[3] زەعیف تی و نە کارین و پیریتی و ئێش و ژان و تا ئەڤ هەمی ڕەشەکن ژلایێ خراڤە ترسن ژبۆ بەندێ دا خوە ڕاست بکێ خودا دبێژە تو حەوجەی منی ل من ڤەگەرە. تە تو رێکێ دی نینن.

[4] هود هود ئەندازیارێ نەبی سلیمان دەچێ پێویستیا وا ب ئاڤێ هەبیا گازی وی پەرەندی دکرن دهات دگۆت ئاڤ هەیە یان نینە، نەبی سلیمان زمانێ حەیوانا دزانی. دبێژە دەرسەك مەزن د ڤا هەر دوو حەیوانا دە هەیە یەکێ ژێرە ئاگەهییەك ئانێ ژ یەمەنێ ئەو بوو گەڕا مسلمان بوونا مللەتەکێ یا دی مێرو بۆ پێشیێ گەلیێ خوە بۆ گۆت مێرویا خوە بپارێزن لەشکەری رێ گۆت: [یا ایها النملة ادخلوا مساکنکم] مەزن ریێ بەردڤێت واهابێ ئەرکێ خوە پێبینن.

ئەم ژ ظولما مویێ زەنگی وەهـ چ حەجاجە نەیار
ژ كوتەك و خوونخور و گورگا مە خودا عەودین فەكەر[٢]

گەر دبێ ئەز مازنم هەر كەس دبن دارێ مەبی
قولیداری عەیب و عاری یەك خۆدا مازن و سەر[٣]

پیرێ پیرانە د دەستە مە پیرێ پارا مە چ حاجەت
ما خودا بەس نینە بۆ مە مە چ پاكی ژ بەتەر[٤]

ژ غیرەتێ ڕا دێ تو سەر دی ژ خودێ ڕا دێ خەبەر دی
دەستێ دز ژێكە نە پڕسە چ چەتو بت چ چەتەر[٥]

---

(١) مێرویێ پێشیێ دی وا نەئێ شین دڤێت تۆ ژ واهرە بئێشێ ژبەر ئومەتا حەیوانا ژی ئەو ژی خودان نەفسن وەكە مرۆڤا نابە مرۆڤ نەخوەشیێ بگەهینە وا.

(٢) ئەم ژ ستەمكارییا موو ڕەشا وەكە چەنگزخان، نەیار وەكە حەجاجێ كوڕێ یووسفێ سەقەفی كو دبێژە حەجاجێ زالم كو كوتەكن و كوچكن، كوپەك، خونخوەرن و گورگن خودا تولا مە ژ وا ڤەكە.

(٣) هەكە تو ل باخوە مەزن و سەروك و ڕێبەر دزانی و دبێژی دڤێت هەر كەس دبن بارێ من و دارێ من و فەرمانا مندا بن. تو دڤێ دیتنا خوەدا، خەلەتی نە وەسایە بەلكی تو كولەی و قولیداری كێماسیێن تە زۆرن هەر یەك خودا هەیە مەزنە و سەروەرە. عەبەد نابێ سەروەر، گەلەكا ئەو داخواز كرنە لێ فەیدا وا نەدا وەكە فرعەون و شەداد و قارۆن.

(٤) پیرێ پیرا وەكە مرۆڤ دبێژە میرێ میرا. ئەڤ پەیڤێن هە بابەتێ خودانە. نە لایقێ كولانە دبێژی پیرێ پیرا ددەست مە دایە مە خوە بخودا ڕاگرتیە چ پیوستیا ب پیر پارا نینە. یێن دنێ پیرێ پارانە، خودا بەسی مە ژ هەمی هەینان ئەم چ پاكیێ ژ بەتەری ناكن و مە منەت ژی نینە.

(٥) تو مرۆڤەك بخیرەت بە سەرێ خوە ژ خیرەتێ ڕا بدە بێخیرەتی قەبوول نەكە ژبۆ خودێ باخڤە و خەبەردە و دەستێ مرۆڤێ دزی دێ ژێ بكی نابێژی كا مرۆڤەك ماقولە و مەزنە یانژی فەقیرە و خێزانە چ چەتو بت. یان تان چەتەر بت، فەرق و جدا دێ نەبت وەكە ئەو ژنكا ژ مالباتا مەزن ئانینە نك قاسدێ خودێ گۆتن دزی كریە خودانێ وێ هاتن

ژ ئوصولێ نەرە هۆلێ ل ڕێزکێ نە ل ڕێچکێ

میرێ بێ پیر نە تو میرە سەرێ بێ خیر نە تو سەر[1]

ما صەفەت عوودێ عیبادەت ب همزم و نال و شکایەت

دلکە پەڕوانەیێ عیشقێ وەهە چ سەر گەشتە تەسەر[2]

مێژ ئەوە مونکەر و ظولمێ جارەکی پێرا نەبن

ژ جەلالەت بکە طاعەت نە ژ نەفع و ضەڕەر[3]

ب یەك ئیش و ب یەك دەربێ ب خودێ ڕا دێ نەکی حەربێ

ب مەرهەما خضر بێ حەیات ئاڤ ڕەشینا مە ب خێر و بەر[4]

چ پوڕوغرام تەلەسکوب و چ پەروانەیە قورئان

وەهە چ ئەو ئابێ حەیاتێ ژ قودرەتێ هاتە بەشەر[1]

---

داخواز کرن کو دەستێ وێ قاسدێ خودێ ژێنەکە، گۆتن ژ مەرە شەڕمە قاسدێ خودێ گۆت هەکە فاتیما کچا من دزیێ بکێ ئەزێ دەستێ وێ ژێ بکم.

[1] ژ بنە توری نەچە وێ یا بێ نیات نە کورێ ڕۆژێبە زەلامێ ڕێزێبە نەیێ ڕێچکێن خرابیە ڕێ هەنە و ڕێچك هەنە، میرێ بێ شیرەت ڤان نە تو میرە. مەزنان دڤێت شیرەت ڤان هەبت. سەرێ خێر تێدا نەبت نە تو سەرییە. یانی سەروکێ بێخێر نەتو سەرۆکە.

[2] سەنگا مرۆڤ وەکە گودا عودێیە دڤێت تم تم زم زم و نالین بزکر ژێ بێتەدەر دل دڤێت وەکە پەڕپەڕوکی بت، پەڕپەڕوك عاشقێ ئاگریە خوە داڤێژێ ناڤدا و دەنگژی ژێ نایێ. سەرێ تە چ سەرگەشتە هەمی تشت تێدایە.

[3] ژبەر مەزناهیا خودێ تاعەت بکە نە ژبەر کو تە ببە بهەشتێ یان ژبەر کو زیان نە گەهت تە، هەکە نەخوەشیەك گەها تە چ د لاشێ تە دابت.

[4] یان مالێ تەبت دڤێت تو بێهن فرەهبی، ب خودێ ڕا نەکەڤی شەڕدا، شەڕێ خودێ ژ تەر نایێ تو نکاری بەر بەریێ پێرە بکی، تو وەکە مەرهەمێ بە. ژبەر کو شیعر پێ تەمام بیت دبێژێ خضر ئاڤا حەیاتێ دگەرها تێنە تا مەژی ئاڤ رشین هەیە ل زۆزانا چاخێ بەرخ برێ دگۆتنێ ئاڤ ڕەشین.



Zakho Centre for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخو بۆ ڤەکولینێن کوردی

ماسەكانی بێ كەمال دەستانەكێ پاك و دەلال

بابەتانێ ئەهلێ حال كر هەدیە بوونا ئەهلێ سەر[٢]

ژ حكمەتێ شعرێ د خازی ژ بەیانێ سیحرە بازی

(ماشاءالله) ئەڤ چ تریاق و ئەڤ چ ئیكسیر و ئەثەر[٣]

بوونا پاكێ عاقلانە ب دۆڕێ دین د كری

نە پەرەستی ژ دنێ سەوس تێ سەرێ ڤالا قاف و جەر [٤]

نە ئەوم سووج یەك تنێ بت ل مەهدەرێ قەنجی هەزار

---

(١) قورئان چ تشتەك مەزنە پرۆگراما كار و بارێ هەردو دونیایە بۆ مرۆڤی وەكی تلسكوپێیە تشتێت دوورترە دیار دكە. تلسكوپ دوور بێنا دیتنا ستێرانە. قورئان پەروانا دونیا و ئاخرەتێیە ل سەر وێ دزڤرن. ئاڤا ژیانێیە (حیات) كەسێ ژێ ڤەخوت ئێدی نامرە ژ قودرەتا خودا بو مرۆڤان هاتییە.

(٢) ماسەكانی بی ئەڤ بەرەبا ڤی شاعێریە. قەبیلەك كەڤنە بەرێ (٢١٠٠) سالا ل دوورا ئەربیلێ دەولەتەك بناڤێ ماسەكا هەبوو ئەڤ بەرمایێن وێ دەولەتێنە، ل دەڤەرا تلكوچەر (ڕەبیعی) گوندەكە دبێژنێ ماسەكان نها میرا تێدانە ئەم ژۆر هاتنە ئەم چونە دەڤەرا تورێ گوندێ خەلیلا خر بەهیێ ماسەكا ل ور هەیە. هندك دەڤەرا بوتان مانە ل ور هندكژی چونە زڤنگا حاجی علیان ل ورمانە هندك ژی ئێزدی مانە ل گوندێ دێرەبوونێ چەند جهێن دیژی هەنە. بنەتورا ئەڤی باڤكی ئێزدی بوون پاشی مسلمان بوونە. ڤێجا دبێژێ ئەڤ ماسكیێ بێ كەمال چونە دەستا نەك پاك و دەلال كو بابەتێن مرۆڤێن ئەهلی حالن ژ وارە كر دیاری ئەوێن كو سەرومرن.

(٣) هەكە تو ژ حكمەتێ شێعرێ بوخوازی ژ بەیانێ سحرە بازێ دبێژن فلان كەس سحرە بازە وەك ڤیانا خودێیە ئەڤ وەكە تریاقێیە و ئێكسیرە چ بەرهەمە.

(٤) ئەڤ ژ وا كەسێن خودان ئەقل ڕا و پاكڕا باشە ئەوێن ب دووریێ دین دكرن مرۆڤ دڤێت نە دونیا پەرست بت، سەرێ ڤالا بت ئەقل تێدا، نەبت وەك قافەك یێ جەرا بت ئەو سەرێ ژێرا بێژن سەرسم ڤالا نەزان ئەڤ شێعرێن من ژبۆ مرۆڤێن عەقلمەند ڕا باشبی ئەو فەیدێ ژێ دبینن.

ژ دەست تەمە من یەك خودا تو ل من نەنیری کی بنەر [1]

دونیا مە ب ئیرۆ صبە پاپیل و کورتانێ دەجیل

پینە قەت هەڤ ناگرن عومرێ وێران چوویە دەر [2]

---

[1] دبێژی خوەزی سوجێ من گونەهێ من یەك تەنێ بوویا لێ گەلەکن. من باوەری هەیە کو مەهدەرچی بە هەزارانە ژ مرۆڤێن چاك. یا خوەدا ئەز یەك ژ وامە کو تە ئافراندی هەکە تو ل من نەنێری و دلوڤانیێ ل من نەکی کی هەیە ل من بنێرە کەس دی من نینە.

[2] دونیا مە نە ب دوومە ئیرو و سبەیە وەکە پاپولێیە وەکە کورتانێ دەجالییە پاپول ژ پاتە و کولاڤا چێدکرن شونا پیلاڤێ وەردگرن زوو د درها و هەر پنیە دکن، د گۆتن کورتانێ کەری و دەجالی ژی وەسایە، دەجال هەر شەڤ کورتانێ خوە پنیە دکە دا سحارێ رابێ و دەرکەڤێ دەما دبی سحار دنێری هەمی ژ هەڤدا کەتیە. دبێژن فلان تشت ما کورتانێ دەجالییە هەڤرا ناگرێ دونیا شبهاندیە ڤان تشتا عەمر وێران دبت دچێ مرۆڤ پێ ناحەست.

# طرسان

مـــودام پـــەيغـــەمبـــەران ئومـــەت د طرسانـدن ژ دەجـــالى
تـــو مـــە حفظكـــە ژ فتنـــا وان تـــوى جـــەبـــار تـــوى ســـەتـــار[١]
فيتنـــە نـــە تـــەڤ ظـــالمن هنـــژى ديـــارن هـــن ڤـــەشـــارن
وەك ئـــەوێ د پوســـتێ مهێـــدا لـــێ بـــەلـــێ ل شـــەرعـــى نـــەيـــار[٢]
نـەبـن ئێمـين ژ خـودايێ خـۆ ب طرسـن گـەر چ سـووج يـەك بـت
بنێـــڕن ل ئـــادەم و ئيبلـــيس ب يـــەك ســـووج چ دەر بـــەك خـــار[٣]
ژ لـــەو قـــەنجـــن ئـــەوێ ژ كـــوفرێ د طرســـان پـــڕ ژ پـــاش ڕۆژێ
نـــە وەك مـــە ڤـــان بـــەلـــەنگـــازێن نـــەزانـــايێن نـــەبـــن گوهـــدار[١]

---

[١] تم تم قاسدێن خودێ گەلێن خوە دترساندن ژ دەجالى. دەجال يەك ژ سالوخێن ڕۆژا ڕابوونێيە (قيامەت) قاسدان پەسنێن وى ژگەلێن خوە ڕە دانە. گەلەك تشت ب دەستێت ويڤە تێن و داخوازا خوداتيێ دكە بحەشت و دوژەها وى هەيە. بحەشتا وى ئاگرە ئاگرێ وى بحەشتە. لێ زانا دبێژن دەجال يانى فتنە نەخوەشى و كوشتن يارەبى تو مە بپارێزە ژ فتنا وان، هەر تو دكارى مە بپارێزى.

[٢] دەجال فتنە تەڤ مرۆڤێن ستەمكارن و كوتەكن هندەك ژ وان ديارن هندەك ژى ڤەشارتينە و نەديارن. وەك ئەوێ خوە چاك نيشا مرۆڤى ددە وكە پەزا مێشن لێ دبنڤە نەيارێ شەڕعا خودێيە. ئەڤێن هە هەرچاخێ هەنە.

[٣] دڤێت مرۆڤ ژ خودا ئێمن نەبێ هەما چ هات بەرێ مرۆڤ بكێ دڤێت مرۆڤ ژ خودا بترسە پلانا وانا مرۆڤ يەك ژى بت سوجێ مرۆڤ نە گەلەك ژى بن. كا وەرن تەماشە ئادەم و ئبليس بكن سوجێ ئيبليسى يەك بۆ خودا گۆت ژ ئادەمڕا هەرە سەجدى ڕوويێ خوە دەينە عەردێ ئەوى بيا خودێ نەكر سەجدە نەبر، ئادەم ژى بيا وى كر ژدارێ خار دارا توبايێ، خودێ گۆتبوو ئادەم ژ دارێ نەخوون، ئەوى ژى ئەڤ گۆتن شكاند، هەر دوو ژى هاتنە سەزادان، سوج يەكبوو كا بنێرن چ دەربەك مەز خارن.

عـــەزازیلـــێ تـــەیـــێ عابـــد ژ غـــەیـــرێ ڕا نـــەبـــوو ســـاجد
ب یـەك سـووجی تـە کـر شـەیطـان ژ وی پیسـتر نـەهـن مـردار[2]

بـــاڤکێ مـــە یـــێ نـــەبـــی دایکـــا حـــەوا نـــاز و پـــەری
ب سـووجەکـی ژ بـاغێ بـەهشـت ئاڤێتـە ئـەرضـێ گـور و مـار[3]

مێـــژووا ســـــەرهاتیـــــا وا قـــــەدچـــــت جلـــــدێ کتـــــاب
ل کوکـەتن ل کـوب هەڤ کـەتن لـێ شـین و وەیشـین و هـەوار[4]

ئایـــا یووســـف ل حـــالێ وان تـــە ڕۆهنـــك خـــوون و مـــەرجـــانن
وەیـا ل حـال مـە و گونـەهـێن د ڤـێ ئـەرضـێ مـەیـێ بـێ عـار[5]

---

[1] ژبەر ڤی بو چاکێن خوە دێ ژ کوفرێ و نەباشی و حەرامی د ترسان ژبەر پاشەڕۆژا خوە نە وەکە مە بوون ئەم نەزان و بەلەنگازن و نەگوهدارن ژ دینێ خوە ڕە سستن.

[2] عەزازیل، شەینان، إبلیس، خەناس، ئەڤ ناڤێن وینە عەزازیل ژ خودا ڕا گەلەك عیبادەت کربوو خودا پەرست بۆ ژبلی خودا سەجدە ژکەسەك دی ڕا نە بر بوو نەبر ژ ئادەم ڕا ژێ. ب ڤێ سوجێ تە کر شەیتان و ژ یێپیستر چوو مرار نینن، مردار یانی تشتێت کوتی.

[3] باڤێ مە ئادەم نەبی بۆ چاکێ خودا بوو خودا ئەو بدەستێ خۆ ئافراند بوو و دایکا مە حەوا ژ پەرەسووا وی یا چەپێ چێکربوو وەکە پەریا بوو ژبەر کو فەرمانا خوەدێ شکاند، خودا گۆتبوو [ولاتقربوا هذه الشجرة] (البقرة: ٣٥) نێزیکی ڤێ دارێ نەبن ژێ نەخون. ئەوا ژێ خارن ژ شەیتان باوەرکرن چاخێ ژوارە سوند دخار و گۆت ئەز ژوەرە چاکیێ دبێژم. ب ڤێ سوجی ژ باغێ بەهشتێ خودا ئەو هاڤێتن ڤی عەردێ گورگ و مارا.

[4] مێژووا سەرهاتیا وا کا چ ب سەرێ وا هاتیە و چەند پووشمان بوونە و گریانە و ژ هەڤ قەتانە هەر یەك لرەخەك یێ دونیایێ کەتنە و ل هەڤ گەرانە. دبێژن سەرێ چیایێ عرفاتێ هەڤ و دوو دیتنە، سەخمەرەتی ڤان سوجا چ ب سەرێ وا هاتیە.

[5] ژ خوە ڕە دبێژە یا یووسف ل سەر حالێ وا ڕۆهنکێن تە بوونە خون و مەرجان شونا ئاڤێ یان ل حالێ مە ئەوێن گونەهکار ل سەر ڤێ عەردێ مە یێ بێ عار ئەم ل سەر خوە بگرین کو ئەم هەر ڕۆژ گونەهان دکن.

## دونیا و ئاخرەت

دێ ئـاخرەتـێ شیلو نـەکـی ب دونیـا گـەنـی ژ دەسـت خـوە نـەکـی

ژەهـرێ د نێـڤ هنگیـڤ نـەکـی ژێ بـێ خـەبـەر دێ تـە بـکـوژی[1]

ئـەحمـەق نـەبـە ب فـکـرە ل دنـی ئـەڤ ئـاخ و ئـاڤ نـە ل تـە تنـێ

مـولکـێ خـودا بـو عالـەمـێ نـە ژبـۆ مـن و نـە ژبـۆ تـەژی[2]

مـن ل تـە قـەویتـی ئـەی بـرا نـانـێ حـەرام گـەر بـدی کـورا

دێ ئـەو بـبن فـەرخـکـێن گـوڕا طـوڤـێ حـەرام مـاڕێ بـەژی[3]

دونیـا فلـیم خـەون و خـەیـال ژێ حـەز نـەکـە دوسـت و هـەڤـال

---

[1] ئاخرەت وەکە ئاڤا زەلالە دڤێت مرۆڤ وێ ب دونیایێ شێلو نەکێ هەکە مرۆڤ شێلوکر مـرۆڤ زەڕەڕا خـوەکـر، ئاڤا زەلاّل چـاخێ شێلو بۆ بـکێـری ڤـەخارنێ و بـاکژاهێـی نـایـێ ئاخرەتێ ژی وەسایە. تەشبیهەك ڕندێ بۆ ئاخرەتێ ئانیە هنگڤ چەند دەرمان بت چاخێ ژەهر تێکل بۆ دەرمانێ وێژێ دچە مرۆڤان دکوژە. حەرام ژی چاخێ تێکلی ئاخرەتێ بۆ ئەو ژی وەکە ژەهرێیە ڕوهێ مرۆڤا دکوژە مرۆڤ پێ ناحەسە لێ ڕۆژەك تێت مـرۆڤ پـێ د حەسە فەیدە ناکە.

[2] مرۆڤ دڤێت هوشمەند بت نە بێ ئەقل بت، هزرێ خوە لڤێ دنێدا ژی بکێ خودا ئەڤ ئاخ و ئەڤ ئاڤ نە ژ بوونا تە تەنێ دانە. ملکێ خودانە، بۆ هەمی عالم دانە نە ژبۆ من و نە ژ بوونا تەژی، مال خودا ددە مرۆڤ دڤێت مرۆڤژی بدت خودان حەقا.

[3] دبێژێ شیرەتا من لتە یا برا نانێ حەرام نەدە کورا و زارۆکێن خوە. هەکـە تـو وا ب حرامـی خـودان بکـی ئـەو دێـبن وەکـە تێـژکێن گـورا ب زۆر و زەڕەڕ بـن. گـور ژی تێشکێت خوە ب حرامی مەزن دکە کەوالێ حەرام ددێ وا. دبن زەڕەڕکەر، مرۆڤ وەسانە خودانکرنا ب حرامـی زارۆك دبـن تـوڤێ خوەخـوەر وەکـە مـاری بـە ژی لـێ تـن مـارێ بـەش ژەهرا وی زۆرە یێ ئاڤێ بێ ژەهرە، زۆێ وێ وەسانە.

بۆ کەس نەبوویە مولك و مال هەژکێ گوهوژ دبن تە د هەژی[1]

ملکێ بوهشتێ ئەبەدە شەهلا و شین ناز و قەدە

قیمەت ب دونیێ قەت نەدە بێ فەیدە و پووچ ڕژی[2]

کەوثەر مە قورئانا حەکیم ژ وێ حەیات مە ژ وێ نەعیم

یێن لێ نەیار زەقۆم کیم زیندان و دۆژە ژ وان تە ژی[3]

پەروانەیا عالەم ئەوە مەرکەز ئەوە دەولەت ئەوە

بۆ ئاقلان سەروەت ئەوە نە ژبۆ سەفیهێ بێ مە ژی[4]

یووسف فرۆکا مە ڤڕە قۆڕئان مە چووخە وەرگرە

وەك ڕەفڕەفێ قودسی فڕە فڕدەوس فڕامە ژ مە تەژی[1]

---

(١) دونیا وەك فلمێ سینەماییێیە وەك خەون ب خیالە هەر چی چووی ئێدی نا ڤەگەرە ئەوا مایژی مرۆڤ نزانە وێ چاوا بت، ئەوا وەسا مابە مرۆڤ هەژی بکە، یا دوستێ من و هەڤالێ من ئەو ژی کەسرەنە بوویە ملکێ ئەبەدی و مالەك دەوامی وەکە هەژکی دارا گوهوژێیە چاخێ مرۆڤ دچێ سەر دبن مرۆڤ دا ژ دهەژێ نە ئەردێ ناگرە دونیا ژی وەسایە.

(٢) لێ خودا دبێژە ژبۆ باوەرمەندا [خالدین فیها أبدا] (النسا: ١٢٢) وارێ بەحەشتێ هەر و هەرە، مرۆڤ چاخێ چوونە بەحەشتێ تم و تم ئەبەدی وێ بمینن تێدا ژێ دەرناکەڤن هەر شینە و پاکە و ڕندە و شیرینە، تو قەدر و قیمەت بدنێ نەدە فەیدا وێ نینە پوچە نە ئازایە رزیە.یانی وەکە زادێ بێ ڕوونە.

(٣) برکا کەوسەرێ ژ مەرە قورئانا ئەوا تە ژی حکمەتە حەیاتا مە یا ئەبەدی بوویە بە حەشتا خوەشی و نەعیم ژی ژ وێ یە. ئەوێ نەیارەتیا قورئانێ بکە خارنا وی یێ زەقوم بت زەقوم دارەکە ژ دۆژەهێ فێقیێ وێ ژی ئاگرە ژبۆ جەهنەمیا ئاڤا وێژی کێم. ئەو روخ و عەدابا ژ بن ئەهلێ دۆژەهی د هەرکە. ئەوە ڤەخارنا وان ژنەیارێ قورئانێ دوژەهـ تەژیە و زیندانە بۆ وا.

(٤) قورئان پەروانا عالەمێیە و مەرکەزا هەمی هەینیایە و دەولەت ژی هەر ئەوە ژبۆ مرۆڤێن عەقلمەندێن سەر و سەروەت و سەمیانە نە ژبۆ مرۆڤێن سەفیە و بێ مێژوویە.

عـەبـدینێ یـەك سـۆز د ڤـێ مـەجنـوونی یـەك لـەیـلا د ڤـێ
ڕێڤـی نـە یـێ بـارێ دەڤـێ گـەرچـی د بنـدا ب قژڤـژی[٢]

---

[١] دبێژە یووسف دونیا کو وەکە فروکێیە نە ڕاوەستایە دزڤرە ئەو ژی درەوە قورئان وەکە جلەك ژ چوخێیە تو وێ وەرگرە. بەرێ قوماش هەبوو د گۆتن چوخێ ئینگلیزی چاك بوو بو وی تو دێ فری بچی فردەوسا بەری ب قورئانێ تو دێ بچی بحەشتێ ئەڤ ڕاهە ژمە مسلمانا تەژیە

[٢] کولەتیێ یەك سۆز دڤێ. چاخێ مرۆڤ زانی کو مرۆڤ کولەیێ خودایە دڤێت مرۆڤ خودانێ سۆزا خوە بت. مەجنوون عاشیقێ لەیلایێ بۆ ژ وێ پێڤە کەس دی نە دحەباند ناڤێ وی قەیس بوو. ڕویڤی نە یێ بارێ دەڤەهێیە چەندی دبندا ب قژ قژە لێ فەیدە ناکە بارێ ڤی دینی هەر کەس نکارە هلگرە.

## حەلال و حەرام

دەولـەمـەنـد هنگـی دبـت شـاكر كومـال گرتبـە حـەلال

نـە ژ نـاڤ حیـل و كـولمێ صـەڕف بكـت د ڕێیـا حـەلال[١]

ل تـەحث و نـەحث و ل ئـاڤ ڕێیـا ل ساغ و مریـا صـەڕف بكـت

وەك زەكـاتێ سـەر تـە فـەرضـن ئـەڤ هـەمـی ئـەی ئـەهلێ مـال[٢]

قــەولــێ ئــەظهــەر دێ زەكـــاتێ تـــو بـــدی دەســـتێ ئیمـــام

وەك چەواد عەصرێ نەبید و گەر چ ئەو صەڕف كت د حەرام[٣]

خـــوذ د تـــەوبـــەتـــدا (تؤخـــذ) د حـــەدیثـــا نـــەبـــەوی

ژ دەســـتێ جاهێـــل دێ تـــۆ دەرخـــی وەك ژ دەســـتێ بـــەدەوی[٤]

---

(١) شەڕتەك یێ دەولەمەندێ شاكر ئەوە كو مالێ خوە ژ حەلالی بەرهەڤ كربا خودا ژ وارە دبێژە: [لئن شكرتم لأزيدنكم] (ابراهيم: ٧) ئەو لبا خوەدێ ب ڕومەتن. شەڕتەك دی ئەوە وی مالی خەرج بكێ نە ژ بوونا ناڤێ خوە و ژ بوونا حیلا و ستەمكارێ بەلكو د ڕێیا حەلال دە خەرج بكە..

(٢) ل كێم و كاسیا و ل ئاڤ و ڕێیا و ل ساخ و مریا د بەرژوەندیا مرۆڤا دا خەرج بكێ ئەڤێن هەژی خەرج كرنا مالی د وادە وەك زەكاتێ ل سەر مالداری فەرزن.

(٣) د گۆتنا ئەهلێ شەڕیعەتێدا یا قاهیم ئەوە كو زەكاتێ مرۆڤ بدە پێشەوای ڕێبەری ئەو بەلاڤ بكە چەوا د دەورا نەبیدا وەسا بوو. عامل هەبوون دچوون زەكات كۆم دكرن تانین ددانە پەیغەمبەری ئەوی بەلاڤ دكرن، هەكە ئیمام خەرج بكە د حەرامیدا ژی دیسا مرۆڤ بدێ وی باشترە.

(٤) د سورەتێ تەوبەدا هاتیە [إنما الصدقات للفقراء والمساكين والعاملين عليها والمؤلفة قلوبهم وفي الرقاب والغارمين وفي سبيل الله وابن السبيل فريضة من الله والله عليم حكيم] (التوبە: ٦٠) [خذ من أموالهم صدقة تطهرهم وتزكيهم بها وصل عليهم إن

صلاتك سكن لهم والله سميع عليم] (التوبە: ١٠٣) خودا دبێژە: ژ دەستێ وان بگرە. یا موحەمەد. ڕێبە وێ زەکاتێ ژ دەستێ یێ جاهل و نەزان دەربینە. چاوا د چاخێ ڕەسول دا ژ دەستێ بەدەویا دەرتانین بەدەوی کوچەرێن چول بەریێ بوون.

## بوڕجەك ب هەیبەت

دنێ ناسکە شبی پزپوڕ چ گێر و دەوس و بووری کوور
چ بوڕجەك ب هەیبەت ژ سەریا ژ خۆنامە مە ئاخ صۆر بی[١]
دروست ناکی چقا پاك بی چقا شیر بی چقا چاك بی
ب میر و سەڵطەنەت طاقبی ب جەمشید بی ب جمهور بی[٢]
گەلەك چوونە بنێ قەبرێ ب دەستێ ڤی دن و زەجرێ
ژ نۆ مال دەرزیا ژەهرێ ل جانێ یێ پز و پۆڕ بی[٣]

---

[١] دبێژە دونیایێ ناس بکە وەکە مرۆڤێ پسپور. پسپور ئەون هەکە کەرییەك پەز هەبێ و ناڤدەبێ شڤانێ وبینێ هەمیێ ناس دکە دزانە کیژ بەرخ یا کیژ مهێیە کیژان هاتیە و کیژان نەهاتیە ژ ویرە دبێژنێ پسپور، دونیا وەکە ئاڤەکا بوشە گێر تێدا هەنە دوس تێدا هەنە مرۆڤ دوادە دخەنقە هەکە مرۆڤ کەتە ناڤ گێرێ مرۆڤ ب سەهلاهی ژێ دەرناکەڤێ ژبەر کو دزڤرە زڤرٍ و نەکە، ژ وێرە دبێژن گێر، دەوس ئەوە ئاڤەك بوش سەر نقون دبێ مرۆڤ دبێژن چوو. جارەکا دی پەیدا دبە مرۆڤ نە هوستا و شەهرەزا بت د وادە دخەنقە دونیا ژی وەسایە مرۆڤ نە شەهرەزایێ وێ بت دێ زەرەرێ بکە. دونیا چ بوڕجەکە ژ سەرێ مرۆڤایە. هەر مرۆڤ کوشتنە چ هەڤالێ وی بت چ نەیار بت ژ خونا مە کوردا ئاخا مە سوڕ بوویە هندی سەر ڤێ ئاخێ بیانیا ئەم کوشتنە.

[٢] تو چەند مێر چاك بی وەکە شێرا بی یان چەند پاك بی تو نکاری وێ دروست بکی تو مێر بی خودان دەستهەلات بی وەکە جەمشید بی خودان تاقبی یان جمهور بی جەمشید پاشایە یێ ساسانیایە ناڤێ جەمشید هەیە.

[٣] گەلەك مرۆڤ چونە بنێ ئاخێ ب دەستێ ڤێ دونیا تەژی زەجر و نەخوەشی. ژن و مالێ مرۆڤان ئەوژی بەلانە وەکە دەرزیا ژەهرێ نە ل جانییێ نە پسپور بت [إنما أموالكم وأولادكم فتنة] (الانفال: ٢٨).

ب جــەهلــێ یــێ برینــدار بــێ برینــا ڕەش نــەهــن دەرمــان

تــو علــم ئاڤــا حــەیــاتێ بــین ب تــۆزێ جــەهــل شــیفا نــابی[۱]

(رسـول اللــه) شــبی جــەنــەت ب ڕەوض و لالــە هــەر نیعمــەت

مــە قورئــان ئــابێ حــەیــوانی ژ وان لێڤــان ڤــەخــوون ئــابێ[۲]

ل کــو ئینســان نــە ئینســانە دمــا بــەیانــا مــە قورئانــە

ژ قــودرەت عــەدل و ئیحســانە ب وێ ڕوونــی ب وێ ڕابــی[۳]

مــە هیڤــی بــۆ مــە ڕۆژەك بــێ ژ خــودایی بــۆ مــە نــۆڕەك بــێ

مــە تــەیغون بــەر بــەروســەك و بــێ حقــوقێ مــە نــە ونــدا بــی[٤]

ب گــر ئینســان ژ قورئــانێ تــو ئــابێ عــەدل و ئیحســانێ

---

(۱) ئــەو کەســێن ب نــەزانینی برینــدار بــت برینــا وی یــا ڕەش دەرمــانێ وێ نینــە وەکــە پەنجەشێرێیە ساخ بوونا وێ چەتنە تو ژ خوە ڕە علم و زانینێ وەکە ئاڤا حەیاتێ ببینە ئەو د کارێ مرۆڤا ساخ بکە بتوزێ نەزانین ساخ نابە و شیفا ژێرا نینە.

(۲) قاسدێ خودێ وەکە بەحشتێ یە چاوا بەحشت هەمی جورێن گول و چیچەك و باغ و بیستان تێدە هەنە وەسا قاسدێ خودێ دبێژی هەمی خوەیێ و ئەخلاقێ چاك تێدە هەنە (انما بعثت لأتم مكارم الأخلاق) هەکە مرۆڤ پەیرەوێ وی بت ژ هەمی چاکیا مرۆڤ بەهرەمەند دبت. قورئان ژ مەرە وەکە ئاڤا حەیاتێ یە قورئان ژ لێڤێن قاسد تێتەدەر و د هەرکە ژ ناڤ وا لێڤا مرۆڤ ڤەدخوە.

(۳) ل کودەرێ ئینسان نابێ ئینسان هەکە ب قورئانێ نە باوەر بت و وەکە وێ نەمەشت ل وێ دەمێ ئەو نە ئنسانە دناڤبەرا مەدە قورئان حەکەمە، ژ قودرەتا خودێ هاتیە ب وەکهەڤی و چاکی (عەدالەت و چاکی ژ ئیحسان) هەکە بۆ وێ مرۆڤ ڕۆنە و ڕابە مرۆڤ دبە مرۆڤ هەکە نە وەسا بە نابە مرۆڤ.

(٤) ژبۆ گەلێ کورد داخوازا وی ئازادییە، دبێژە هیڤیا مە ئەوە ژبۆ مە ڕۆژەك بێت ژلایێ خوداڤە ڕۆناهیەك دەرکەڤێ ژ مەرە ژی دەستهەلاتەك چێبێ (تیفون) بەکی وەکە پاشایێ ترکا بربروسك، ژ مەرە ڕێبەریێ بکی مافی مە بێتە وەرگرتن وندا نەبت، چاوا بربروسك مافێ گەلی پاڕاست.

ژ طـۆبایێ چیچکـا ڕەحمـەت د هـەر دەم بۆ مـە سـەیـدا بـی[١]

نـە پـیس ئینسـان و بـێ شـەرم بـی دبـن بـارێ دنـێ کـەر بـی

ب قـەناعـەت بـە دێ سـەر وە بـی سـەری تـە دێ ل عـەڕشـا بـی[٢]

نـــە بێـــژە مـــال و پـــارێ مـــن شـــەرەف نـــە ب مـــال و پارانـــە

د زوهـدێ دا خـەبـاتێ کـە نـەبـەنـە قـارۆن دێ ونـدا بـی[٣]

ژ حاجاتـــا خـــۆ یـــێ زێـــدە کـــەســـێ مـــالێ دنـــێ گرتـــو

نـــەدا خیـــزان و بـــێ چـــارا ژ عـــەذابـــێ وێ خـــلاص نـــابی[٤]

د هـــەر قـــانوون د هـــەر دینـــا بـــەنـــی ئـــادەم هـــەمـــی یـــەك زك

تێـرێ هیـزان بـدە خیـزان نـە ئـەنصـار بـی تـو چینـا بـی[٥]

---

[١] یا ئینسان بگرە ژخوە ڕە قورئانێ (ئایەتا) [إن الله یأمر بالعدل والحسان] (النحل: ٩٠) [إعدلوأ هو أقرب للتقوی] (المائدە: ٨) ژ توباییێـە قورئـان کولیلکـەك یـا ڕەحمـە و دلوڤانیێ یە داخوازا مە ئەوە کو هەر چاخێ هەر دەمێ بۆ مە سەیدا بت.

[٢] دڤێ مرۆڤ نە مرۆڤەك پیس و بێ فهێت و بێ شەڕم بت. و هەمی دەما دبن بارێ دنێدا بت ژبۆ هلگرتنا بارێ دنێ کەر بت گوهدرێژ بت. چو نەزان بە بێ فەهم بت هەکە تو بو وێ تشتا خوەدێ دای نە ڕازیبی. وێ دەمی سەروەرێ مەزنبی سەرێ تە بلندە ل عەرشایە تو ژ هەر کەسی بێ منەتی.

[٣] خوە ب مال و پەران ناڤ نەدە هەر تو بێژی مال و پەرێن من هەنە شەڕەف نە بمال و پارانە، د زاهدیێ دا د نەبوونا دنێ دا خەباتێ بکە. نەبە وەکە قارۆن تو ژی وەکە وی دێ وندابی، قارۆن ژ مللەتێ مووسا بۆ زەکات نەدا خەسف بۆ د عەردێدا چو خارێ وندا بوو ب خوە و مالێ خوەڤە.

[٤] ئەو کەسێ ژحەوجەهیا خوە زێدەتر مال بەرهەڤکر و نەدا خیزان و ژارا و بێچارا ئەو ژ سەزای رەها نابە، حەساب و کینا وی هەیە.

[٥] د هەمی ئایین و ڤانا دە مرۆڤ یەك زکن و برایێ هەڤن کورێ ئادەمن. نەخوە یێ تێر دڤێ بدە یێ برسی دقانونا خوەدێدا ژی وەسایە دقانونا عەبدادا ژی وەسایە تێری هێژای بدە خێزانێ هەکە تو نەوەکە ئەنصاریا بی تو چێنابی. ئەنصار دانشتوییێن مەدینی بوون

(رســول اللــه) گــۆت ژ دنــێ هلینــه زادێ ڕێــوەنگــی

حــەرامــە بــۆ تــە یــێ زێــدە بــدە خیزانــی ئــەی ئــابێ[1]

ژ ئایـــات و ئـــەحادیثـــا حقـــوق بـــۆ وە د بـــێم دیســـا

زەکــات ســەر ســاڵ و نیصــابە ئــەوا دی حاجــەتــە هــابێ[2]

(رسـول اللـه) مـە سـەیدایـە ل مـە فـەڕضـە کـو وەك وی بـین

کـرە ڕەحمــەت ژبـۆ عالــەم وەکـی وی تـو بـۆ هــەمیـا بـی[3]

د قورئـانێ ئـەگـەر ژ مـن ڕا خـەبـاتێ کـی ئـەز ژی دێ کـم

نـەیـار بـی دێ نـەیـاربم نینـە کـەس ل پشـتـا تـە قـەت ڕابـی[4]

بــەلــەنگــازێ مــە یــێ ظــاڵم هــەرە دەرســێ ل نــك عــالم

---

چاخێ مهاجر هاتن مەدینێ دناڤبەرا وا دە براتی هاتە چێکرن ژلایێ رەسولڤە مالێ خوە لێکڤەکرن. پەنابەرا چو تشت نەبوون، هاریکارا مالێ خوە دانە وا لێکڤەکرن.

(١) قاسدێ خومدێ تـو دونیـایێ ژ خـوە ڕە ژێراکـە وەکـە زادێ رێـوتیێ (رێـوەنگـی) (خـذ مـن الدنیا زاد سفر) یێ زێدە ژحەوجەهیا تە زێدە تو ڕاکی بۆ تە حەرامە یێ زێدە دڤێت تو بدێ خیزان و ژارا و بەلەنگازا هەکە ژار و بەلەنگاز هەبێ و تە هەبێ و تو نەدی وا ئەو زێدە تە هەلگرتی وی حەرامە، براتیا مسلمانی ئەڤە.

(٢) شاعێر دبێژە ئەز بۆ هەوە ژ ئایەت و حەدیسا تاخڤم و دبێژم نەك ژبەر خوە زەکات دڤێت سال ب سەردا بچێ و بەر زکات ببێ هنگی واجب دبت. لێ یا دی حەوجەهیە پێویستیا ڕۆژانەیە دڤێت مرۆ ڤ دهاریکاریا ئێك و دودا بت.

(٣) قاسدێ خودێ سەیدایێ مەیە ل سەر مە پێویستە وەکە وی بن. خودا ئەو کرە ڕەحمەت و دلوڤانی بۆ عالەمێ دڤێت وەکە وی تو ژی بۆ هەمی کەسا بی هەکەر بەس ژ تە مەفایێ تنێینە.

(٤) د پەرتووکا پیرۆز دە هاتیە خودێ دبێژە [إن تنصروا الله ينصركم] (محمد: ٧) هەکە هوون هاریکاریا خودێ بکن خودێ وێ هاریکاریا وە بکێ. هاریکاریا دین واجبە ل سەر باوەرمەندا. هەکە هوون نەیارەتیا خودێ و دینێ وی بکن خودا ژی وێ نەیارەتیا وە بکێ وێ دەمێ کەس نینە پشتا وە بگرێ.

حقوقا ناسی بکە ئەحمەق ببی فرعەون خلاص نابی[1]
ژ هەر کەسرا ب سەلامەتی بی ب ئیحسان و عەدالەت بی
هنك ژی ب علم ڤێ مێژێ سەبەب ئەو بوون کودین ڕابی[2]
توزەك ڕەشبی بژی بەر بی نە نان دەر بی نە دلبەر بی
نە جامێر بی نە پەروەر بی د نێڤ عامێ خۆیا نابی[3]
حەیا و شەرمیی و وجدان نەما ئیرۆ لبەر ئینسان
شبی حەیوان ل هەڤگەر یان مسلمانی ب ناڤ نابی[4]
نەبێژە مازنم ژ پاشا تو یی قەرواش و بەر ئاشا
ب خەباتا خۆ دبی پاشا ب یا کەس کەس مەزن نابی[5]

---

(١) بەلەنگاز، ڕەبەن، ژارو، ژار، بێچارە، قەلەندەر، فەقیر. و یێ دچاڤێن مرۆڤێن چاکدا بەلەنگازە. ژبەر کو ژ کریارێن خوە ڕە ڕۆژا ڕابوونێ بەرپرسە، ماف ل سەر وی زۆرن. دڤێت بدە خودانێ وا دڤێت ستەم کار هەرە لایێ زانایی ژ خوە ڕە مافان ژێ هین ببە. دبێژە یا ئەحمەق. نەزان کو تو ببی وەکە فیرعون ژی تورەها نابی.

(٢) ژ هەر کەسی را دڤێت تو ب سلامەتبی و ب چاکی و وەکهەڤی بی (عەدالەت) هندەك مرۆڤ ب زانینا خوە ڤان بێژن کو دکن بوونە ئەگەرا وێ یەکێ کو ئایین ڕابو. چاکی و وەکهەڤی ژ وارا نە پیویست بوو وە زانی کو دین مێژوو زانینە.

(٣) تو زك ڕەش بی دلێ تە وەکە بەر بت، هشك بت نە مەرد بی نانێ خوە نەدی تو دلبەر بی نە خێر خوازبی و نە جامێر بی. حەش مرۆڤا نەکی نە پەروەر بی دناڤ گەلادە خویا نابی تو دبی مرۆڤەك وندابووی.

(٤) گازندا ژ چاخێ دکێ دبێژێ فهێتی و شەرمی و وژدان نەمایە ئیرو لبەر مرۆڤا وەکە حەیوانا ل هەڤ دگەرن و دانوستاندنێ ب هەڤرا دکن. بناڤ مسلمانی نابە، مسلمانی و ژدانە و چاکیە و وەکهەڤیە و شەرمیە.

(٥) نەبێژە ئەز مەزنم و ئەز پاشامە تو قەرواشیی (خزمەتچی) تو وەکە ئاشێ خارنێ دجوی و دهێری. بخەباتا خوە تو مەزن دبی و دبی پاشا، ب خەباتا کەس مەزن نابە تو بێژی باڤێ

زكـێ برچـی حـەرام خـۆڕ بـی دلـێ طـاڕی نـە بـاوەر بـی

دەڤـێ ب سـوند و دەرەوكـەر بـی غـەبینـەت ئـەو ژ مێـرا بـی[۱]

(اولـی الأمـر) عـالمێ دینـی ژ سـۆڕێ نـوح (أطیعـوني)

نـەزانـایی دێ پڕسـاكی ب سـەیـدا بـە دا زانـا بـی[۲]

غـەوثـێ ئـەعظـەم ژ بـەغـدا بـی بـەهائـەددیـن ژ بوخـارا بـی

عدی ژ عەین سفن و لالەش بێ مە ئەخلاق چێبێ چێنا بی[۳]

ل هێسنێ سار لیڤی قوقی تو بەس لێبدە ب دووق و مووقی

بـەسـە یووسـف نـەهـن فـەیـدە هـەرە تـو بـێ مـرن هـابی[٤]

---

من مەزن بو و زانا بوو و شێخ بو ئەز ژی وەسا بم (قل أنا ذا ولاتقل أنا بن ذا) بێژە ئەز ئەڤم نە كورێ فلان كەسم.

(۱) زكێ پرچی بت و حەرام خوەر بت و دلێ وی تاری بت و باوەریا وی نەبت و دەڤێ وی بسوند بت و دەرەوكەر بت حەیفە ئەو ژمێرا بت، مێر خودان سۆزن و جامێرن و ڕاستگونە. مەردن و تێر بن نە حەرام خوەر بن.

(۲) زانایێ ئایینی ئەو خودانێ بریارێ نە د قورئانێدا هاتیە [أطیعوا الله وأطیعوا الرسول الله واولي ألأمر منكم] (النسا: ٥٩) هەكە تو نەزانبی دێ پرسا كی دا زانا بی دڤێت د ئاییندا نەزان نەمینن یان بخوینن یان سەحبكنێ.

(۳) دبێژە دامەزرێنەرێ تەریقا قادری ژ بەغدا بت و شاهێ نەخشەبەند دامەزرێنەرێ تەریقەتا نەخشەبەندی بت ژ بۆخارا شێخ عودەی كورێ مووسافر ژ عەین سفینێ و لالەشی بێت دامەزرێنن. تەریقەتا عدەوی ژ لالەشێ بێت داقەنە ئەخلاق و خوینێ مە چێكن دیسا چێنابە هند ئەم خڕابوونە.

(٤) دبێژێ خوە یووسف بەشی ل هێسنێ سار بدە هێسنێ سار نەرم نابە و بەس ل ڤی قوقی بدە ب دوو قموقی ب دوقك، بەسە یووسف نینە فەیدە هەرە ژ خوە ڕە تو بكە مرن نێزیكە وەختا بێت.



Zakho Centre for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخو بۆ ڤەكولینێن كوردی

## موحەممەد رسول الله

خودا ئەڤ ئەرض موقەدەس كر ب موحەممەد وحی و قورئانی
موحەممەد مەركەزێ نۆرێ صەلات مە ل سەر (رسول الله)[1]
كی ئەرواحێ موقەدەس د عالەما بەرزەخ شبی ستێرا
ژ موحەممەد ب نۆر و تیرۆژن صەلات مە ل سەر (رسول الله)[2]
زمانی علمێ رەبانی جەمال و جاما سوبحانی
ژ قودرەت سەیدێ عالەم قەلەمداره (رسول الله)[3]
مەدینە مە دەری رەحمەت مە (رەوضەتو عەینەیە) ژ قودرەت
حەیات و كەوثەر جەننەت صەلات مە سەر(رسول الله)[4]

---

(١) خودا ئەڤ ئەرد پاك و پیرۆز كریە ب هاتنا موحەممەدی و ب هاتنا قورئانێ ژبۆ ڤان تشتا خەسف و مەسخ نەمان و رابوون. بەری هاتنا موحەممەدی هندەك ژ وان گەلێن بوورین چاخێ گونەهـ بكرانا ب ئەردێ دچوون خار هند ژی دبوون بەراز و مەیمون. وەكە قارۆن. و گەلێ سالح پەیخەمبەر موحەممەد بوویە مەركەزا رۆناهیێ ژبۆ عالەمێ. صەلات و سەلام ل سەر رسول الله.

(٢) ئەو پاك و رەوانێن پیرۆز د عالەما ناڤبەرا دونیا رۆژا رابوونێ دا كو دبێژنێ چاخێ بەرزەخی (عالما بەرزەخێ) ژ رۆناهیا موحەممەدی ب تیرۆژن وەكە ستێرا رۆناهیێنە، دلوڤانی سەر رسول الله بن.

(٣) موحەممەد زمانێ زانستا خودای یە سپەهیتاهیا جاما خودای یە (سبحانه) ژ قودرەتا خودێ ئەو مەزن و سەروكێ عالەمێ یە قەلەم دارێ خودێیە.

(٤) بازارێ مەدینێ (یەسرب) دەرگەهێ رەحمەت و دلوڤانیا خودێیە نەینكا رەحمەتێیە ژ خودێ ژیان و كەپر بەحشتە بركا كەوسەرێ ل بەحشتێیە مرۆڤ چاخێ ئاڤا وێ ڤەخار ئێدی تو جارا تێن نابە.

د فەلەكدا رۆژ مە عالايە ژ دونيايێ را خودێ دايە
د حەشرێ مە ليوا و لحەمد عالايە د دەست (رسول اللە)[١]

بنێرە ل ژۆر تەڤێ رۆژێ عالا رەنگين و بشكوژێ
ژ هەفت رەنگانە كەسكێ وى نميش نۆرا (رسول اللە)[٢]

جوانە ئەو ل يەك رەنگێ قەپير نابێ ژ وێ بنەگێ
ل مە نەوروزە ل مە پيرۆزەكە ئەو نۆرا (رسول اللە)[٣]

شبى بووكێ ب ڤێ كەونێ ژ هەفت رەنگا ل بەر بەژنێ
پەراڤێ وێ ل سەر عالەم شبى نۆرا (رسول اللە)[٤]

كو عالەم هەب د حەبسێدا شبى كورا د گارپێدا
سەحەرها تو شەفەق پێدا شبى نۆرا (رسول اللە)[١]

---

[١] د فەلەكا ئاسماندا رۆژ وەكە ئالايەكێ خودا چێكريە ژبۆ دونيايێ را گەلەك فەيدێن وێ هەنە ژبۆ ژيانێ يا هەمى جاندا ران، رۆژ مليونەك و سێ سەد هزار جاران مەزنترە ژ ئەردێ د چركەكێ دا رۆناهيا وێ سێ سەد هزار كيلومەترا دبرە هەتا دگەهە ئەردى (زەمين) ٨ دەقيقە و ١٨ سانيە دبوورە، هند دوورە د مەحشەرێدا ئالا سپاس نامێ (حەميدێ ددەست قاسدێ خودێيە رۆناهى ژ وێ ئالايێ دچێ وەكە رۆژێ باوەرمەند ل دوورا وێ كۆم دبن.

[٢] ل ژور بنێرە ڤێ رۆژا وەكە ئالايەكێ وەكە بشكوژەكێ چەند رەنگ تێدە هەنە هەفت رەنگ د رۆژێدە هەنە. ئەو رەنگ تێدا هەمى د كەسك و سورێدا خويا دكن. چاخێ باران تێت و تاڤ دەردكەڤە ئەو رەنگ پەيدا دبن ئەو رەنگێ رۆژێنە، ژێرە دبێژن قوزەقەر يان شەبەنگى خور، بوكا بارانێ. خێلى گور كەسكێ و سور ئەڤ ناڤێن وێنە، رەنگێ كەس يەك ژ حەفت رەنگێ وێيە ئەو ژى نميشەكە ژ نورها قاسدێ خودێ يا رسول اللە.

[٣] تو جاران ژ جوانيا خوە ناكە و ژ رەنگێ خوە دەرناكەڤە پير نابە و ژە بەنگا خوە لاناده ژمەرە وەكە نەورۆزێ يە ژمەرە پيرۆزە ژبەر كو ئەو ژ نۆرا رسول اللە.

[٤] وەكە بوكەكێ يە ب ڤێ كەونا خوە بەر بەژنا وێ ژ هەفت رەنگايە. پەراڤێن وێ ل سەر عالەمێ يە وەكە نورا رسول اللە، [وما أرسلنك الا رحمة للعالمين] (الانبيا: ١٠٧).

د بـــــۆخچێن غــــونج و بشــــــكوژی چ شـــــاهینەت ژبـــــۆ ڕۆژێ
وەكـــی ســـتێرا شـــەفەق دانـــە ڕەونـــەق ژ نـــۆرا (رســـول اللـــە)[2]

ب ملیــــــارا ژ وێ بێهتــــــــر ب ملیونــــــا ژ وێ مـــــــەزهتــــــر
ژ مــــادە و مەركـــــەزێ نـــۆڕێ ژ گــــولزارێن (رســــول اللــــە)[3]

بەرێ بلۆرێ نیشان حكمەت كەسەك و صۆڕ و بۆ مە كر عیبرەت
ژ وان خـــالێن خـــەیـــالێ پەمبـــەی ڕەنگـــێ (رســـول اللـــە)[4]

خـــودایی ئـــەڤ (حبیـــب اللـــە) كـــرە ســـەروەر كـــرە پـــەروەر
كـــی عالـــەم هـــەب ژبـــۆ ویـــدا شـــەفیعێ مـــە (رســـول اللـــە)[5]

ژ قـــەنجـــان ئـــەز نـــە ئینســـانم ئـــەشـــان شـــانلی بـــەلـــێ ئـــەمـــا
ب تەوحیـــــــدم ب قورئـــــــانم دەفتـــــــەردارم (رســـــول اللـــــــە) [1]

---

(١) بـەری هاتنـا رسـول اللـه عالـەم د تاریـا نـەزانین و كوفرێـدا بـوون و مـرۆڤێن زینـدانی تـو ڕۆناهیێ نابینە، ددەمێ سحارێدا كو شەفەق ژ ڕۆناهیێ دەرتێ عالەم ڕۆناهیێ دبێ دچاخێ سەحەرێدا نورا موحەمەد هاتە سەر دنێ و ڕۆناهیە.

(٢) ئەو بەخچێن تەژی غونچە بشكوژێن گولا چ شاهینە تە ژبۆ ڕۆژێ ئەو گول و چیچەك شەفەق ددن ستێركێن ئەزمانا ڕە و نە قاواژی ڕۆناهیا وا ژ نورا موحەمەدێ رسول الله.

(٣) ب ملیـارا ژ ڕۆژێ مـەزنتر و ب ملیونـا ژ وێ زوورتـر ژ مـادە و مەركـەزێن نـورێ هـەمی ژ گولزارێن رسول الله.

(٤) بەرێ بەلورێ بەرەكە شەشی پەرەسووە ڕۆناهییە. ژێرە دبێژن (قووارس) چاخێ مرۆڤ تێدە تەماشە دكە ڕەنگ دیار دكن كەسك و سور دبێژنێ مە ئەڤ كرە حكمەت و مە ژ خوە ڕە عیبرەت ژێ وەرگرت ژ وا خالێن خەیالی پەشبەهێن مە دیت ژ ڕەنگێ رسول الله.

(٥) خودا ئەڤ حەژێكەرێ خوە ژبۆ عالەمێ را كرە سەركێش و كرە ڕێبەر عالەم هەمی ژبۆ ویدا خولقاندن د گۆت: (لولاك لما خلقت الافلاك) هەكە تو نە ببای نە ژبۆ خاترا تە بوویا من ئەڤ عالەم نە ئانینە وجودێ و مەهدەرچیێ مە ڕۆژا مەحشەرێ رسول الله.

ب ڤـان خـەطـان ئـەیـا یووسـف مـورادا تـە رِضـا مـەولا

خـودایێ تـە دلخۆشـی کـت دبـن عـالا (رسـول اللـه)[٢]

مـورادا تـە نـەصـیحەت بـت ژ بوونـا دوسـت و هـەڤـالێن

ل یووسـف نـەژرە قـەرواش بـت ژبـۆ دینـێ (رسـول اللـه)[٣]

ب ملیـارا شـبی یووسـف ب شـیعر و شـاهی نـەوروزا

ل بـەر رەوضـا موقابـل مەرحـەبا بێـتن ژ (رسـول اللـه)[٤]

---

[١] دبێژە ژ چاکان ئەز نە مرۆڤم و شیانێ من قیمەتێ من گەلەك نمزە. لێ بەلێ. من باوەری ب یەکێتیا تە هەیە کو ئەز حەز ژ قورئانێ دکم من ئەڤ هەنە دەفتەردار ژ رسول الله. خودان باوەرنامە مە.

[٢] ب ڤان رێزکان یا یووسف مراد و مەخسەدا تە رازیبوونا خودایە خودایێ تە دلێ تە خوش کت رۆژا حەشرێ دبن ئالا رسول الله دا.

[٣] مرادا تە شیرەت کرن بت ژبۆ دوست و هەڤالا ل سەر یووسفی نەزر بت خزمەتچی و قەوارشیێ دینێ رسول الله.

[٤] ب ملیارا وەکە یووسف ب شعر و هۆزانا د شاهیا نەوروزا دە ب سەر رەوزا موحەمەدێ راوەستن رسول الله ژ وارا بێژە مەرحەبا ژ وە رە یا عاشقێن دینێ من و رێبازا من.



Zakho Centre for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەکۆلینێن کوردی

## نەفس دخازت

نەفسێ دیسا سەر ل مە ڕاکر هاتیە حەدێ بەرێ
دەعو و دۆزێن ئەو دخازت نەیەك و بیست و هەزار[١]
نەفسێ هندك تو نە بینە گەر ببی ڕۆستەم ظالٚ
یان شبی قەندیل و فیل بی یانە گیو دێوێ مغار[٢]

---

[١] شاعێر دبێژە: ئەڤە جارەکا دی نەفسێ سەرێ خوە ل مە ڕاکر وەکە بەرێ دچاخێ لاتیێ دا چاوا سەر ل مە ڕا دکر. دخوازێن وی و دوزا وی نە یەکن و نە بیستن نە هزارن گەلەکن ڤێجا ئەمێ چاوا ژ وێ ڕەها بین

[٢] دژمنەك مەزن ژ مرۆڤا ڕە نەفسە، وەکە شەیتان و دونیایێ، هەکە مرۆڤ هەڤسارێ خوەدا دەست نەفسێ وەکە ئەو ددخوازێ مرۆڤ وەسا بکێ مرۆڤ ئاڤ و ئاڤ دچێ دڤێ مرۆڤ وی نەیارەك بچوك و کێم نەبینێ هەکە مرۆڤ وەکە ڕوستەمێ زالٚ ژی بت یان وەکە زالی بت ئەوێن ناڤ بانگن ب هێزێ و قەوەتێ. ڕوستەم بوویە قارەمان د مێرانیێ دا گەلەك شەڕ ب تورانیا رە کرنە و سەرکەفتن بووی بوویە. ناڤ بانگە ب روستەمێ د شەهناما فردەوسیدا زۆر بەحسا وی تێ. مرۆڤ شبی کوهێ قەندیل ژی بت دیسا دڤێ مرۆڤ نەفسێ کێم نەبینە وەکە فیل ژی بت کو ئاژەلەك پر بهێزە دیسا وی بچوك نەبینە گەلەك جهێ ترِس و گومانێ یە. گوهێ چیایێ قەندیل ل گەلەك دەڤەرێن کوردستانێ هەنە ل کوردستانا باشوور ل ڕەخ چیایێ هندرین ژ رەوندزێ هەتا قەلعە دزێ ژێرە دبێژن قەندیل ل ناڤبەرا ڕۆژهەلات و باشوور دایە قەندیل هەیە دناڤبەرا ئاکرێ و حەریر دا ل سەر ئاڤا زی. قەندیل هەیە دناڤبەرا بوتا و هەکاریا دا ل زۆزانا پشتا هەر وەخ و هوسیانێ. راسەری ماسیر و گێوو گێوی گوهدەز گێو ناڤ بانگە د مێرانیا خوە دا ددەمێ روستەم دایە. دبوو ژی د کەشتنا دە بوون. دچیروکەك یا ڕوستەم دا هاتیە کو ڕوستەم چوویە شەڕێ دێوا دێوی سپی کوشتییە. دێوێ سفید، ئەڤ وێنە د شەهنامێدە هەیە کوهێ قەندیل ل باکورێ کوردستانێ ل خلاسیا تخوبێ هەرێما بوتا و هەکاریا

نـــەفســـێ فرشـــك ژ حـــەرام و گۆنـــەهـــ و بـــێ ڕێزیـــێ

یا خودا گۆت وێ نەڤێ تو وێ نەکە دوست نەکە یار[١]

هـــەر بنێـــڕ ل ئـــایو حـــەدیثـــە دێ بزانـــی ئـــەو چ پیســـە

چ ڕەزیـــل چ خـــەبیثـــە قـــە نـــەهـــن وێ ســـۆز و قـــەڕار[٢]

ئـــەو ژ پیلانـــا لـــەعینـــە پـــوڕ خـــودا ســـەر وی خـــەبـــەر دا

گـــۆت نـــەیـــارە وێ نـــەکـــن پـــۆت قـــەنـــج بزانـــە گۆشـــیدار[٣]

---

دایە. کورد دبێژنێ قەندیل چیایەك پر ئاسێ یە ژلایێ باکوور ڤە بەرامبەر گوندێ کووالێ گوێێ تێدانە. هول. هوسیان. ئەڤ هەرسێ گوند یێن هۆزا گویانە. مالا بەلو ئێزدبرنکا مالا سەیدێ ل ڤان گوندا نیشتەجێنە نە چیایێ جهێ نێچیرا میرێ بوتان بوون ژ جزیرێ موحەمەد بەگ دچو وێدە نێچیرێ چەپەرا وی هەیە من دیتیە دبێژنێ چەپەرا موحەمەد بەگی، چەپەرا کوڕێ پیرێ هەیە، ژلایێ باکور ڤە ماسی رو دهەریکە دناڤبەرا چیایێ کاتو و کور قەندیل دا. تێنە بن هێشەتی تێکل ئاڤابوونا دبە، هێشەتا بەرێ سپی. ژێرتر ئاڤا موکسی تێت ل گوندێ بێدارێ د گەهن هەڤ من ئەڤ هەر سێ چیایێن قەندیل دیتنە.

(١) نەفس فرشکێ وێ ژحەرامیە و بێریزە نەباشە بەرێ مرۆڤ ددە گونەها. ئەوا خودا گۆتی ئەو ژێ دڕەڤە. ئەو نابی مرۆڤ ژ خوە را بکێ دوست پشتا خوە پێ گرێبدە.

(٢) هـەرە تەماشـە ئایـەت و حەدیسا بکـە وێ دەمـێ تـێ بزانـی چەنـد پیسـە، و چ ڕەزیلـە چ خەبیسە ئەوی چ سۆز و قەرار نینن دڤێت مرۆڤ ژێ باوەر نەکە.

(٣) نەفس ژ پیلان گێریا شەیتانی یە ئەو شەیتان هەڤال دوستێ هەڤن ئەو فەرمان دکە و ئەو فـەرمانا وی جیبـەجێ دکـێ. د ئـەمر و فـەرمانا ویدەیـە. خـودا گەلـەك ژ وێ ئاخاڤتیـە گۆتیـە ئـەو نـەیارێ وەیـە. ئـەوی ژ خوە ڕە نـەکێ پـوت و سـەنەم هوون بیاوی بکـن چاوا قابیلی کورێ ئادەم بیا وی کر برایێ خوە هابیل کوشت [فطوعت لە نفسە قتل أخیە فقتلە فأصبح مـن الخاسـرین] (المائـدە: ٣٠) نەفسا وی گـۆت بیـا مـن بکـە برایـێ خوە بکوژە ئەوی ژی بیا وی کر برایێ خوە کوشت د کریارا خوەدە بو یەك ژ وان کەسێن زیان دیتی خوسری.

ئـەو نـەيـارەك پـوڕ ڤـەشـارە وێ صـەفـەت كريـە هـەسـارە

دل كـرە كێلـك و ئامـانج هـەر بنێـڕ ل فكـرا كوفـار[١]

يـێ كــەتــی وی تیــپ و ڕیپــێ قیــر و بــەنــدا ئــەوێ

فــەڕەســت ژێ پــەهلــەوانــە زاهــدەك بــێ عــەیــب و عــار[٢]

یــان ب هیمــەت نــك حــەكیمــەك عــارفێ ب دەر دو دلا

وەك غـەزالـی یـەك ب یـەك دەرمـان بكـت ژ دەردێ غـەدار[٣]

تەوبـەكـە تـەوبـەك ب ئـصـۆل بـت ژ خـودا هـمـەت قـەبـوول بـت

چـەپـەرێ ل نـەفسـا ئـەمـارە ڤـەكـە تـا بـت تـاڕ و مـار[٤]

نــەفســێ بمرینــە ب مرنــێ ب قــەنجــی و طاعــەتــێ زۆڕ

وەكی ئبلیسی ل قوبەیسی ب ئـای و وای ژ دەست تە هەوار[٥]

---

[١] ئەو نەیارەك نەدیارە ڤەشارتیە سەنگا مرۆڤی ژ خوە ڕە كریە هەسار و چەپەر كوزك دل ژ خوە ڕە كریە ئارمانج چاخێ فەرسەتێ ببینێ دەربا خوە لێ ددە. ژناڤ هزرا كوفرێ ژێ وەسایە، ئەو ددلێ وادە پەیدا دكە.

[٢] ئەو كەسێ كەتە تیپو ریپینوێ ناڤ قیرا وێ و ناڤ داڤكێن وێدا ب زەحمەت ئەو ژێ ڤەرەسێ. هەكە ژناڤ پەنجێن وێ ڤەرەسها ئەو پەهلەوانە، مێرخوازە، زاهدە، عابدە، عەیب و عارێت وی نینە.

[٣] یان گەلەك باش وەهمەت لبا مرۆڤەك حەكیم نوژدار كو ئەو ژی ژ دەردێ دلا ڕە پسپور بە وەكە ئیمامێ موحەممەدێ غەزالی وا دەردا یەك ب یەك دەرمان بكە ژ وی دەردی غەدار و زۆر یان نەخوە تو ژ دەست وی ناڤەرەسێ.

[٤] مرۆڤ دڤێت زوو پووشمان ببت سۆز و پەیمانا بدێ جارەكا دی كو وا گونەها نە زڤڕێ هیڤیا وی ژ خوە ڕە پەسەند كرنا وێ توبێ بت و ئەهنیا شەڕ (جەبهە) ل نەفسا ئەمارە بریار دان ڤەكت و شەڕێ وێ بكێ هەتا وێ ژ هەڤ تار و مار بكت بەلاڤ بكت.

[٥] بێژە نەفسێ مرن هەیە حەساب و كیتاب هەیە و قەنجیا و چاكیا تاعەتەك زۆر بكە وەسا بێتە سەرێ وی كو ددەستێ تەدا بێ هەوار هەوارا وی وەكی شەیتانی كو چو سەرێ چیایێ ئەبو قوبەیسی كرە هەوار ژ مسلمانی ژبەر هاتنا موحەممەدی.

یووسـف دیسـا هاتیـه دەرگـاهێ تـه ئـەو ب عـەرِضـێ حـال
هێڤیــداره تــو ب پــارێزی ئــەوی عــەبــدێ نــەكــار[1]
(رب أت نفســـي تقـــوى) ژ گونـــەهـــا (أنـــت الـــولى)
تـۆ بـده نـەفسـا مـه تـەقـوا تـو خـۆیی ل مـن بـه سـتار[2]

[1] یا خودا ئەڤە یووسف جارەكا دی هاتیه دەرگاهێ ته ب داخوازناما خوەڤە هیڤیا وی ئەوە كو تو تەوبا وی پەسەند بكی ئەو كولەك نەكاره.

[2] یارەبی هەواره من ئەوە تو بدێ نەفسا من خودا ترِسێ و تەقواتیێ، ژ گونەهان هەر توی خودانێ مه یێ تو بده نەفسا مه تەقوایێ تو مه ستار بكە، ستار یا تەیه یارەب.

# نەمینە ل هێڤیا دونیایێ

نەمینە ل هێڤیا دونیایێ کو ئەو خۆش بت ل یەك بایێ
صارٍ و گەرمە شبی تایێ دنێ سەکرا تە خۆش نابێ[١]
ژ مرنێ ل تەوبەیێ لەزکە ژ حەرام حەلیان بەسکە
ل قەنجیێ ژی لەز و بەزکە تەجان هەو کر مرن هابێ[٢]
مەلەك هەر ڕۆژ تێ نێرینێ ل تاریخ و نڤیسینێ
مرن بەر مە بەنی ئادەم نەیێ ئیرۆ صبێ دێ بێ[٣]
ل پەێ دونیێ چڤا گەریا عومر هەو کر نە ڤەگەڕیا
خەزام زەر کر خەزام وەریا پسۆلا مرنێ وەریابێ[٤]

---

[١] شیرەتا دکە و دبێژە. خودا پەرستنێ بکە نەمینە ل هیڤیا وێ یەکێ دونیا ژ تەرا ببێ بان و بانگە ڕوو خوش ببە ژ تەرا ل سەر یەك بایی بت دونیا وەکە تایێ یە جارنا سارە جارنا گەرمە دونیا وەکە سەکەراتا مرنێیە جارنا دشدهە مرۆڤ دبێژە خلاس ئێدی مرنە جارنا ژی سەهل دبە، مرۆڤ دبێژە باشە دونیا خوەش نابە.

[٢] ژبەر کو مرن هەیە پێویستە ل توبێ مرۆڤ لەزێ بکە و ژ تشتێت حەرام و حیلە و پیلانا بەس بکە و ل چاکیا و باشیا لەز بکە ژبەر کو تە ژیێ خوە خلاسکر وەختا مرن وەرە ئێدی هەمی ژ دەست تە دچە تو نکاری چو بکی.

[٣] هەر ڕۆژ مەلەك تێت تەماشە دەفتەرا عەمرێ مرۆڤ دکە کا چەند مایە و چەند چووە هەر نەفەس ب هژمارە هەکە بۆ مە کوڕێن ئادەم مرن ئیرو نە یێ سبەهی وێ بێت، چارە نینە هەر مرنە.

[٤] دبێژێ ئەز گەلەك ل پەی دونیایێ گەرهام من عەمرێ خوە خلاس کر ژیان ناڤەگەرە خەزاما عەمرێ من زەر بوو. چەوا بەلگێ دارێ زەر دبە ژ وێرە دبێژن خەزام وێ دەم

د ڤی ئەرضی تو مێهڤانی خۆیی تەڤ چوون تە باڤ کانێ

هـا کوندکێ کور ل سەر خانی بخونت تو کوتوك ڕابێ[١]

ل سەر سینگ مەلەکێ ڕوونێ ڕوهێ شیرین دێ ب کشینێ

ژ نۆ زار و بگری و شینی ل بەروا دی تو وندا بێ[٢]

نە بێژە ئەز بەگ و میرم ب ملیونم ب عەشیرم

ببی شاپۆڕ ببی فەغفور دیسا تو ژێ خلاص نابێ[٣]

هەوایی جانێ جانانی برۆسکە یا نە جەیران

کەفریشك خال و نیشانی ژ وی دەردی شیفا نابێ[٤]

مە ڤین ل دلدا جهەك ئاسێ چ ئەلماسی چ شەهکاسی

مە ئاڤێت ڕەندەشا پاسێ جهێ گرت قە ژێ ڕا نابێ[١]

---

دکەڤە، خەزام وەرها ئێدی چاخێ مرنێیە پسولا وێ دبێژی ڤایە مرن هات. یان پسولا مرنێ دیار بوو ئیشارەت دا.

[١] ل سەر ڤێ ئاخێ لڤێ دنێدا تو مێهڤانی نە وارێ ئەبەدیە کەس و کارێن تە هەمی مرن و چوون وارێ ئەبەدی ما کانێ باڤێ تە و دیا تە. گەلەك کوندێ کور بێتە سەر خانیێ تە بخوینە بێژە توك توك ڕابە دەمێ چونا هات بەرێ دگۆتن کوندێ کور ل سەر مالا فلان کەسێ خوەندییە کەس تێدە نەمایە کاڤل بوویە.

[٢] مەلەکێ مەوتێ (مەلەکولمەوت) وێ بێت ل سەر سنگا تە ڕۆنە ئەو ڕحێ تە یێ شرین بکشینە ژن و زارۆکێن تە وێ بکن زۆرە زۆر و هەوار و گازی ل بەر چاڤێ وا دێ وندا بی بچی وارێ نە ڤەگەرێ، ئەو بلا ل بیرا تەبت.

[٣] ناڤ ل خوە نەدە تو بێژی ئەز خودانا ملیونا مە ئەز بەگم و میرم خودانێ هۆز و عەشیرا مە تو ببێ وەکە پاشایێ فارسێ شاپور و فەغفور ژی لێ وەکی، دیسا ژ دەستێ مرنێ خلاس نابێ.

[٤] مرن وەکە هەوایەکێ یە ژلایێ جانێ جانڤە تێت یان وەکە بروسکیە یان کەهرەبە. فرشکێ مرۆڤ دڤێت پاك بت پاقژ بت خال و نیشان ئەوە ژ وی دەردی شیفا نابێ.

هــەوایــێ خــوون ڕەیــێ جــانی شــبی ئــاگر و جــەیرانــی

مــە لاوینــی چ تــالانی مــە دل ڕەش کــر جــیلا نــابێ[٢]

کەسێ لێ لەیست هەوا نەفسی دێ سەر خۆشی کت د ڤی حەبسێ

حـەتـا مرنـێ لـێ کـت کـەیسـێ شبی جـەیرانـێ بـەر نـا دێ[٣]

یــێ هــەفســار دایــە دەســت کــەرە مــەیمــون ڕاکــر ڕەقصــێ

شــبی دێــوێ ســـحر لــێ کـــر ژ وی دەردی خـــلاص نـــابێ[٤]

خــودا کــارێ ئــەوی چێکــێ ژ نــك خــۆ فــەیظــەکــی ڕێکــێ

وە یــا ب مورڕشــد خــەباتــا ئیبنــو ئــەدهــەم وەرنــە چێنــابێ[٥]

نــە دینــدار مــان نــە نانــدار مــان نــە ســەردارمــان نــە پــەروەرمــان

---

[١] ڤیانا عەشق ددلدایە ئەو ژی جە و وارەك پر ئاسی یە وەکە ئەلماسێ قاهیمە دل وەکە کاسا پادشاهیە. مە ئەو ڤیان ئاڤیە ڕەندەشا پاس ڕاکرنێ لێ ئەو عشق جهێ ژێگرت ئێدی بەردانا وێ نینە ژ دل گرتیە دەرنایێ.

[٢] وەکە هەوایێ دهێ خوونا جانێ مرۆڤە وەکە ئاگریە وەکە بەرقێ و برۆسکێیە لاوینیا مە چو بو تالان دلێ مە ژ گونەها ڕەش بوویە ئێدی جەلا نابی. بەرێ ئامان پاخر و سفر بوون سالێ جارەك دڤیا بمانا تا جیلان کرن سپی کرن سەفار هەبوون دهاتن گوندا سفر سپی دکرن. ژ وێرە د گۆتن جەلاپێ زغورا پاك دکرن ئەو قرێژ ژێ دبرن ژ وێرە دگۆتن جلا پاشی دا تانین سەر ئاگری و سپی دکرن ب قەلایێ.

[٣] چەکە دوڤ هەوایا نەفسا خوە کەت و نەفسا وی دڤێ دونیا وەکە زینـدانێ بێ وی سەرخوەش بکێ، حەتا مرنێ وا کەسێن خوە ژی بینی چاوا کەهرەب یەکی بگرە ئێدی وی بەرنادە نەفس ژی وەسایە.

[٤] ئەو کەسێ هەڤسارێ خوە بدە دەست نەفسێ یێ وەکە مەیمون وی ڕاکە ڕەقسێ. وەکە دێو سێهر لێ کربە، ژ وی دەردی ڕەها نابە.

[٥] ژ خودا پێڤە کەس نکارە وی چێکە، خودا ژلایێ خوەڤە چاکیەکێ ڕێکێ یان خورشیدەکێ چاك کەرەکێ. ئەوێ ڕاست بکە یان خەباتەك وەکە ئیبراهیم ئەدەهم مرۆڤ بکە یان چێنابە.

نــه صـــهد حـــهیفـــا زەمـــانی کـــو جهـــێ شـــێرا ڕیڤـــی ڕابـــێ[١]
مــه پـوردین چـوون ب دلـێ کولڤـه دنـێ کوشـتن وه شـیر ب ملڤـه
ژ بوهشـــتێ بـــێ خــهبــهردار بـــی ب ڤـــێ خـــانێ قایـــل نـــابێ[٢]
وێـران شـــهـهــره بشــین و ئـــاخ و د ڕۆژێ دا صـــهد هــزار بــن ئـــاخ
هــهکـاری خۆشــه بـوون، وان شـاخ مــه ئاسـار بـی خـۆ یـێ مـابێ[٣]
د ڤـــی دەورێ د ڤـــێ ســـهورێ ب ڤـــێ فکـــرێ ب ڤـــێ جـــهورێ
مـــه دۆژه دێ کـــهڤـــت قـــهبـــرێ ژ هـــزاران یـــهك خـــلاص نـــابێ[٤]
دینـــێ مـــه قـــهلـــب و ئـــهخلاقـــی نـــه پـــارلاقی نـــه شـــتلا ڤـــی
مـــه صـــهد حـــهیفـــا زەمـــانێ کـــو ژ وەلیـــان پـــهری پـــهیـــدابێ[١]

---

[١] گازندا ژ مرۆڤێن دەورا خوه دکه، دبێژه نه مرۆڤێن ئایین پەروەر مانه نه مـرۆڤێن مـهرد و نـان دەر مانـه نـه سـهروك و سـهردارێن چـاك مانـه نـه سـهد حـهیفا وێ دەوارا کـو دجهـێ شێراده ڕێڤی ڕابێ فەرمان دار بێ.

[٢] مه گەلەك مرۆڤ دیتن چون و مـرن ب دلـێ کولڤـه دونیـایێ ئـهو کوشـتن شـویرێ وی ب ملێ وێڤەیە. ئەو کەسێ ژ بەحشتێ ئاگەهدار بت ب ڤێ دونیایا هە وەکە قایل نابە.

[٣] ئەڤ دونیا وەکە باژارەك وێرانە هەر تێدا شینە و ئاخ و کووڤانە د ڕۆژێدا سەد هەزارا بـن ئاخ دکە، کا تەماشە شونووارێن باژارێ هەکاری، جولەمێرگ، شونوارێ باژارێ خوشەبێ و شونوارێن شاخێ بکە ئـەو شونوار هـەمی بـێ خـودان مانـه هـەمی مـرن و چـون دو شاخ هەنـە. یـەك ل ڕۆژ هـەلاتا بـاکورێ جزیـرا بوتانـە شـونەوار تێـدا زۆرن وەکـە کـەلها پەیکەرێن پاشایێ عاشورا. سالا (١٩٩٧) ئـەز و بـرام عەبدولڕەقیب یووسف شوونەوار نـاس چونە وێرێ شەش پەیکەرێن عاشورا مە دیتن شاخەکاهەکار یا هەیە سەر ب وانێ یە ئەو ژی ئاسار تێدە زۆرن وەکە پرا و کەلها وێران بوونە.

[٤] د ڤێ دەورێدا د ڤێ دونیا هەر تێدا سەورەیە و شەڕە و قیرە ب ڤێ هزر و فکـرا ئـەم تێدەنە ئـەڤ جور و ستەم کـو ئـەم دکـن ب ڤـان کریـاران دۆژەهـ دێ کـەڤت گـوڕا مـه ژ هـەزار کەسان یەك رەها دبێ یان نابێ.

(وأما السائل أمره فلا تنهر) ژ هەر كەسرە

ژ تە یووسف نە بی بەهرە مە كودك دێ نە ڤالا بێ[2]

تە ڕەحمەت ما كی دەر یابێ چقا بدی ذەڕە كێم نابی

ژ تە مە یا ڕەب ژ تەیە جەننەت ب دی كی بێژە ئەڤ نابێ[3]

ژ خودێ ڕا دێ ب سەیدا بی دەڤ و دل تە ل یەك بابی

شبی پەروانەیو بابی ب كەیفێ كولەیی نابێ[4]

---

(1) ئایینێ مە دڤێت ژ دلەك ساف بت و بخوە یەك چاك هەبت، ئایین قەلب و ئەخلاق نەكە شخەتیە و نە ئەزمانا هلوتیە. سەد حەیفا من كو وی زەمانێ كو ژ وەلیا خاسێ خودا پەری پەیدا دبوون ژ چاك چاك پەیدا دبوون.

(2) د پەرتووكا پیرۆز دا فەرمانا خودا هەیە دبێژە [وأما السائل فلا تنهر] (الضحی: ١٠) ئەڤە فەرمان ژ هەر كەسی ڕا هەیە. یارەب یووسف ژی داخواز ژتە دكە لێ ب هورتنێ ئەم ژ ڤێ داخوازێ نە بێ بەهرن كودكا مە وێ نە ڤالا بت. كودك ژ داری د هاتە سازكرن د كولان وەكە ئامانەكێ چێدكرن كودكا شڤانا هەبوو شیر تێدا ددوهتن مالێن ژارو فەقیرا هەبوون ژ خوە ڕە ل ناڤ گوند دگەران زاد كۆم دكرن.

(3) دلوڤانیاتە ما وەكە دەریایێ یە هێژ مەزنترە چەند ڕەحمێ بكی ژێ كێم نابە ژتەمە یارەب ژ تەیە ڕەحمەت و جەنەت بدی كێ بێژە نابە، ملكێ تەیە كەس نكارە.

(4) ژبۆ خودێ تە سەیدایەك هەبت رێ نیشا تە بكت، دەڤ و دلێ تە وەكهەڤ بت دڤێت تو وەكە پەروانێ بی ژ دینێ خودێ ڕا چاوا پەروانە. عاشقێ ئاگر بە خوە تاڤێژە ناڤدە دشەوتە دەنگ ژێ ناهێ تو ژ دینێ خوەدێرا دڤێ وەسابی.

# د بن باری پەریشانم

پـــــەریشـــــانم پـــــەریشـــــانم د بـــــن بـــــاری پـــــەریشـــــانم
ژ دنــێ ب ئێشـــم ژ دینـــی ب ژانـــم بچـــم بمـــنم پـەریشـــانم[١]
دزانـــم پـــوڕ گونـــەهكـــارم ژ فـــێعلا پـــیس عـــەذاب خـــارم
ژ خـــودایی بوومـــە ئـــازادی وەگـــەر نـــە پـــوڕ پـــەریشـــانم[٢]
مـە سـەكـرات غـەرگـەمـان زۆڕە خـەنیقوكـە نـەفـەس كـورە
چ كـەفـت و لـەفـت و عـۆڕ عـۆڕە ژ ڤـێ مرنـێ پـەریشـانم[٣]
د دینـدا پـوڕ نـە دینـدار بـی ژ خـودێ ڕا پـوڕ نـە گوهـدار بـی
د بـەر مرنـێ ب فكـرەك پـیس لـەعـین دێ بـێ پـەریشـانم[٤]
ژ ڤـی قـەبـری ژ ڤـێ طرسـێ ژ نـەكیـر و مونكـەر و پرسـی
دبـــت شـــاش بـــم د جـــەوابێـــدا ژ ڤـــێ ژی پـــوڕ پیشـــانم[١]

---

[١] پەریشانی، نەكاری و بێزاری بێ هێزبوون هەمی یەك واتەنە (مەعنا وان یەكن) دبێژێ ئەز گەلەگ بێچارەمە بارێ من یێ گونەها گرانە دبن وی باریدا ئەز پەریشانم ژانا من ژبەر دونیایێیە ژبەر وێ دئێشم ئەز و بمینم هەر پەریشانم.

[٢] ئەز دزانم پڕ گونەهكارم ژبەر كریارێن پیس و حەرام سەزا دخۆم هێڤیا من ژ خودا ئازادیا ژ سەزادانێیە هەكە نە خوە ئەز پڕ پەریشان دبم.

[٣] سەكەرات د چاخێ مرنێدایە مرۆڤ د خەنقە و د فەتسە نەفەس ژ كوراتی تێتە كێشان ژ خرا مرۆڤ گەلەك زۆرە و نەخوەشە، چ كەفت و لەفتە و چ عۆڕ عۆڕە، وەكە دەوارا دەنگ ژ مرۆڤاتێت كو دبێژن عۆڕعۆڕ ژ وێ مرنێ ژی ئەز پەریشانم.

[٤] هەكە تو د ئایینیدا توپور نە گوهدار بی و دینداربی و گوهێ خوە نە دی خودا د بەر مرنێدا شەیتان وێ بێت فكرەك پیس مرۆڤێت نە گوهدار ژ خودا ڕا شەیتان وی ژڕێ دەرتینێ ئەز ژ ڤێژی پڕ پەریشانم.

ژ قەبرێ ڤەڕسم حەشرە ل سەر دین یێ نە کر صەبرە

خرڕ و جر و ڕەش و غەدرە ژ وێ حەشرێ ب ئێشانم[(٢)]

د بن باردا تەڤن ل بەژنێ نەهن یێ ژێ بدم پەسنێ

ژ بل یێ ڕوونەدا دونیێ ژ ڤێ دونیێ ب ئێشانم[(٣)]

شهین و دۆژە ڤێ گاڤێ مە دەفتەر ژی ل بەر چاڤێ

نەهن کەس قوەتا ڕاڤێ د حسابێدا پەریشانم[(٤)]

مە ژن زارۆك دێیو باڤ بەری هەر کەس مە کن طەنگاڤ

ڕهانا بی ژبەر وا براڤ ژ وێ ژی پوڕ پەریشانم[(٥)]

حسابا هندکا ب دومە ب هزار سالا نو ملیونە

---

(١) دبێژێ ژبەر ڤێ گوڕێ و ژ ترِسا وێ و ژبەر پرسا هەر دوو مەلەکا مونکەر و نەکیر، چاخێ پرس دکن دبێژن خودایێ تەکیە تو ل سەر چ ئایینی و پێغەمبەرێ تەکیە و پەرتووکا تە کیژکە و فەرزا تە چیە و مسلمان چیێ تەنە و بەرێ تەل کویە، دبت ئەز شاش بم نکارم بەرسڤا وا بدەم ژ ڤێ ژی ئەز پڕ پەریشانم ئەڤ ژی نەخلاسە.

(٢) هەکە ئەز ژ گوڕێ ڤەڕەسم ڤێجا مەحشەرە ژ خوە یا کوتێدا خرڕ و جرڕ و ڤەکیشکانی تێدا هەیە ئەوە ئەوێ ل سەر ئایینێ خوە نەکر صەبرە دۆز وێ لێبێنە ڤەکرن. ژ وێ مەحشەرێ ژی پڕ ب ئێشم.

(٣) ل بەر مەحشەرێ دبن وێ بارێ گراندا کو گونەهن خوەدان و تەڤن ژی بەژنەکە مرۆڤ ژی نکارە پەسنێ وێ بدە وەسا نەخوەشە. ژبلی وی کەسی ڕوونەدا بایێ دنی ئەو ژێ بێ منەتە. لێ ئەز ژ ڤێ دونیێ ب ئێشانم.

(٤) وێ گاڤێ شهین مێزین و دۆژەهـ وێ گاڤێ و دەفتەرا خێر و گونەها ژی ل بەرچاڤێ مرۆڤە چو کەسی ژی ئەو هێز نینە کو ب ڕەڤێ ژبەر وێ حەسابێ ئەز پڕ پەریشانم.

(٥) ئەو ڕۆژ ڕۆژەکا وەسایە کو دلێ چ کەسی نە ب چو کەسیڤەیە نەفسی نەفسیە. بەری هەر کەسێ ئەوێن لێزم دوزێ ل مرۆڤ ڤەدکن وەکە ژنێ و زارۆکا و دیو باڤا بەری هەر کەسێ ئەو تەنگاڤیێ ژ مرۆڤ را چێدکن تو نکاری ژبەر وا ژی ب ڕەڤی و خلاس نابی ئەز ژبەر وێ ڕۆژێ پڕ پەریشانم.

ژ حقــوق و ئیشــا مــەظلومــە نــە بێــژە نــە ب ئێشــانم[١]

ژ یووســـف ڕۆهنكـــێ خـــوونێ ژ ڕۆژا شـــین وەی شـــینی

نـە دی كـەس كـو بچووك پیـر بـن د ڕۆژێـدا پـەریشـانم[٢]

ژ بـــێ ڕەســـم و ژ بـــێ ڕێـــزی ژ ئیبلـــیس و ژ خـــۆنڕیزی

خـــودا عـــەبـدێ ب پـــارێزی وە گـــەر نـــە پـورِ پـــەریشـانم[٣]

ل مە شەڤەك پوڕ پوڕ درێژ هات ب پێنجی یێن ڕۆژێن مەسیحی

ل (الـــم نشـــرح) د فكـــری پشـــتی طـــەنگـــی فـــرەهـــی[٤]

پیـــر و بســـت لـــێ هاتنـــە قـــایێ ســـتێرا صـــبحێ چوویـــە ڕایـــێ

شـــەفـــەقـــێ پـــەردە هلانـــی ســـەلامـــەت ل صـــوبەهـــێ[٥]

---

[١] حەسابا هندەكا بدومە بهەزارا سالا و ملیون سالا نە ژبەر كوستەم كاری كرنە و ماف ل سەر وان هەنە و نەخوەشیا وا دایە مرۆڤا نەبێژە ئەز نا ئێشم پر ئێشا تە هەیە.

[٢] ژ یووسف ڕۆندك دبارن ژ خوینێ ژ ترسا وێ ڕۆژا كو شین و وەشین تێدا هەیە كەسەكی نەدیە كو زارۆك د ڕۆژێدە پیر ببن ژبلی ڕۆژا قیامەتێ (یوم تثبت الولدان فیها) پڕ پەریشانم.

[٣] دوعا ژ خودێ دكە دبێژە: ژ بێ ڕەسمیێ و ژ بێ ڕێزی و ژ ئیبلیسی و ژ خوون ڕێژیێ خودا كولەیێ خوە بپارێزە هەكە نە وەسانە بەر پر پەریشانیە.

[٤] بەحسا نەخوەشیێن زەمان دكێ دبێژێ شەڤەك درێژ ب سەر مەدە هاتیە وەكە ڕۆژێن دەجالی ڕۆژێن وێ درێژ بوون، قاسدێ خوەدێ سلاڤ لێ بن دبێژێ د بەرسڤا هەڤالینی دا چل ڕۆژان دەجال ل سەر عەدرێ دمینە ڕۆژەك قاسی سالەكێیە یەك قاسی مانگەكێیە یەك قاسی هەفتیەكێیە یێن دی وەكە ڕۆژانە. دەجال ژێ عەلامەتێ قیا مەتێنە چاخێ مرۆڤ لسورەتێ [الم نشرح لك صدرك] (الشرح: ١) دبێژێ پشتی تەنگیێ دبە بەرفرەهی [ان مع العسر یسرا] (الشرح: ٦) مرۆڤ كەیفخوەش دبە.

[٥] بست و پیرو پاییزاتێن بست سیێ سێێن ڕێزن پیر و كۆمكەك یا ستێ ڕایە دگەل هەوتێن چاخێ سپێدە نێزیك دبە عەلامەتێ ڕۆناهێیە ستێرا سپێدێ دووڤ وارە هێلت پەردە كەو تارێ تیە ڕادبە دبە سحار سەلامەتی چێدبە، نەخوەشی و بەلا ژێ وەسانە.



Zakho Centre
for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەكولینێن كوردی

دیـــن مـــــه بالایـــــه ژ بـــــانی چ جــــهمــــــالی چ جومــــــانی

دین مه گولزارێ موحەممەد ژ دەست شەهی ئەم سەر شەهێ[1]

سـەر کـەلا ئاڤـا حــەیـاتێ کـەوثــەره بـۆ موصـطەفـا تـێ

دین مە کەوثەر نەصره مه مزگین نۆڕ ل مە دیسا دەرکەڤێ[2]

ئاهــ ئــەی عاشــقێ ئیمـــان و دیـــن وەر تلفزیـــون و فلـــیم

سـیرەتــێ صـەحبـێن گـوزین ژ هــەمیـان بـۆ تــە بـەسـین[3]

(ماشـــاءالله) ژ صــــەحابـــان هیمـــەتـــا بـــەرقـــێن بهـــارا

دیــن شـبێ ڕۆژێ شـەفـەقـدا سـەعـد ژ عـەرەب ئاڤێتـە دارا[4]

---

[1] ئـایین بلنـده ژ بـانیێ ژۆرده هاتیـه خـارێ چەنـد ڕنـده و وەکـه دۆڕێیـه. ئـایین ژ مـه ڕە ژ گـولزارێن موحەممەدیـه بـاخچێ گولایـه. چـاخێ هـەر شـەهدکن ژ هنـدەك ڕا دبێـژن سەرشەهـ ئەوا هەرێ ڕنده ئەم مسلمان ژ دەست شەهیێ ئەو سەرشەهین، ژ ناڤا ئومەتان ئەم پێن چاکن.

[2] سـەرکەلا سـەرکەهنیا ئاڤـا حـەیاتێ کـو پاشـی ڤـەخارنا وێ ئێـدی مـرن نینـە ئـەو ئاڤـا کەوسـەرێیه [انـا أعطینـاك الكـوثر] (الکـوثر: ١) خـودا ئـەڤ بـرك دایـه موحەمـەد یـێ ئاییێ مه ئەو کەوسەره مرۆڤێ مسلمان چاخێ ل سەر چو و ئەو ژ خوه ڕە قەبوولکر، سـەرکەفتن بۆ مەیـه مزگینیـه کـو جارەکا دی ڕۆنـاهی ل مـه دەرکەڤـە، ئـەم بکـەڤن دخوەشییێدا.

[3] ئاهـ، ئاخ پەیڤێن هێڤیانه دبێژێ: یا ئـەو کەسێ عاشقێ چ باوەریێ و ئایینـه وەره ژ نێرینـا تـەلفزیون و فلمـان سـەرهاتێن هـەڤالێن قاسدێ خودێ یێن چووین ژ هـەمی تشتا بۆ تـه بەسن، ئەخلاق و ڕاستی و فەداکاریا وا.

[4] ماشائەڵلاهـ ئەوا خـودا بڤێت، ژ هـەڤالا ڕە وەکـه بروسـکا ئـەورێ بهـارا بهێـزن د چاخێ وا دە ئـایین وەکـه ڕۆژێ ڕۆناهیـدا سـەعد بـن ئبـی وەقـاس ژ وەڵاتـی عـەرەبی وەکـه برۆسـك ئاڤێته دارا، دارا مێردینێ. داراڤ پاشایێ ساسانیا ژ ڤەگرت.

## ماشاءالله ژ خەباتێ

(ماشـاءالله) ژ خـەبـاتێ يـان ژ وێ صـەحـب و جڤـاتێ
فەڕضە وان ئـەرزان نـەبينى ئـەم بـو وان چوونـە حـەيـاتێ[1]
فـەتجا مصرێ ژ دەيـنى وان ژى صـەد هـزار لـەشـكـەر ڕۆم
صەحب هەمى دوازدە هزار بوون (ماشـاءالله) چ خـەبـاتێ[2]

---

[1] ماشائەڵلاهـ ژ خـەباتا وارە ئـەو هاڤالـەتيا وا و جڤاتـا وا ڕە دگـەل ڕەسـول، واجبـە تـو وان ئـەرزان نـەبينێ و وا كێم حەسێب نـەكێ ژ دەولا خـەباتا سـەرێ وا ئـەم مسلمان بوونـە و گەهشتنە ژيانەك تم تم ئەبەدى كو بەحەشتە.

[2] پاقژكرنا مصرێ ژ كوفرێ ژبلى خـەلكێ مصرێ سـەد هـەزار لەشـكەرێ ڕومـێ تێـدا هەبوون، هەڤال هەمى دوازدە هەزار بوون ماشائەڵلاهـ چ خەباتەك مەزنە.

# خومیێ سۆزێ

سـەر و مـال دان ب بهشـتێ ئـەو خـوەیـێ سـۆزا خـۆ بـوون

ل ورِ ژی ئـەو ل دۆرا نـەبینـە وەك دنـێ ژێ دۆرِ نـەبـوون[١]

دێ چ بێـژم ژ صـەحابـان غـالبێ وا ژی شـەهیـد چـوون

صاغ وا بوو وە نیشان کم دەڤ و ڕووی و جان تەڤ برین بوون[٢]

شـەڤ د مێـژێ ڕۆژ ب ڕۆژیـی ب شـیر و ڕم تیـر و کڤـان

د ئوحـۆدێ زیـدە ژ بیسـتا حـەمـزەیـی کوشـتن ژ وان[٣]

ئـەنصـاری پێشـمەرگـە بـوون د عـەصـرێ نـەبیـدا بـەرزەبـوون

غـالبێ وان ژی شـەهیـد چـوون ب مـال و جـان فدیـە بـوون[٤]

د ئوحـۆدێ هـەفتـی ژ وان شـەش ژی موهـاجر بـوون شـەهیـد

---

[١] فەدائی بوون ب سەرێ خوە و مالێ خوەدان ب بەهشتێ ئەو سۆزا وا بۆ خودا داین دبرن سەرخوەیێ وێ سۆزێ بوون. ل بەهشتێ ژی ئەوێ ل دورا نەبی بن وەکە ل دونیایێ ژی دوور نەبوون د ئەمر و فەرمانا ویدابوون.

[٢] ما ئەز چ بێژم ژ هەڤالان زارۆکێ وان دچاخێ شەڕ و جەنگادە شەهید بوون و چوون و یێ ژ وان ساخ ماین ژی دەڤرویێ وا و لاشێ وا تەڤدا جهێ برینا بوون.

[٣] ب شـەڤ د نڤێـژێ دا و ڕۆژ ب ڕۆژی بـوون و شـوور و تیـر و کـەڤان ددەسـت وا دە بـوون و شەڕێ کافرا دکرن. د شەرێ چیایێ ئوحودێدا. حەمزەیێ مامێ ڕەسول حەمزیێ پەهلەوان بەری شەهید ببێ ژلاێ وەحشی ڤە بیست ژ کافرا کوشتن. ئەڤ شەڕێ هە د سالا سیێ کوچیدا ڕوودا.

[٤] ژ دانیشتوویێ مەدینێ را دگۆتن هاریکار(ئەنصار) ئەو ژبۆ دینێ خودێ پێشمەرگە بوون د چاخێ نەبیدا شەهیدبوون و چوون. زۆریێ وا شەهید و بەرزەبوون. ب حال و جانێ خوە فەدائی بوون.

هـەر ل پـێش بـوون شـیر ب خـوون د نـەعـرەیـێ (هـل مـن مزیـد)[١]
ذەڕێ جــان و ڕۆحــێ یووسـف گــش فیـدائێ یـەك ژ مــویێ وان
هــەر دوعــا و صــەلــەوات و فــاتحێن مــە بــۆ ڕوهــێ وان[٢]

---

[١] د شەرێ ئوحودێدا هەفتێ ژ هاریکارا(ئەنصار) شەهیدبوون و شەش ژ کوچکریا (مهاجر) بوون، هەر ل پێش بوون شوورێ بخوون بوون هەر دگۆت بلا بێن

[٢] ڕح و جانێ یووسف هەمی ببێ فەدایێ یەك مویێ لاشێ وان، هەر داخواز(دوعا) و دلوڤانی (صلاوات) و سورەتێ فاتیحە ژبۆ گیانی وان بت.

# ماشاءالله ژ خەلیلی

(ماشاءالله) ژ خەلیلی دا خودا وی سەر و كور
تەڤەرێ چوو صەنەمێن وان ژ ئاگری وا نە رەڤی[(١)] ب
یێ بەرێ وی ل تە دی طەلبێ ئاگرێ نمرۆد ل سەر بی
دێ ببت باغێ ب گول وەك جەنەتێ تێ بنڤی[(٢)]
ئەو خودایێ پوڕ عەزیز نك خۆ بەهشتەك پوڕ تەمیز
چێكریە بۆ یێ ب رەسم و رێز ژ ئەمرێ خودا دەر ناكەڤی[(٣)]
ئەو جەننەتا ب شەرط و شروط پوڕ دورەبێ پەرگال و قۆت
بێ دەرەجە و بێ بەرگ و رۆت حەتا ئەبەد ب سەر ناكەڤی[(٤)]

---

(١) ماشائەڵلاهـ ژبۆ ئیبراهیم خلیلی ڕا سەرێ خوە و كورێ خوە ئیسماعیل دانە خودا چاخێ پوت و سەنەمێ نەمرود ڕۆژا جەژنا وا شكاندن و تەڤەردانی بەردەستێ پوتێ مەزن، ئەوا ژی ژبەر شكاندنا واڤە ئیبراهیم هاڤێتن ناڤ ئاگردا خودا ئاگر سارکر ئیبراهیم ما د ناڤ وی ئاگریدا و مەلەك هاتە جەم وی دا بێهنا وی پێ بێت [قلنا یانار كوني بردا وسلاما على ابراهیم] (الانبیاء: ٦٩) كورێ خوە ژی كرە بوراق (قربان) ژبۆ خوەدێ خودا، بەدەل رێكر ژ بەهشتێ بەرانەك بوو.

(٢) ئەوێ بەرێ وی لخودابە خودا ژی دگەل وی یە. خودا دبێژە [ان تنصروا الله ینصركم] (محمد: ٧) ئاگرێ نەمرود ژی ل سەر بت چو زیانێ ناگەهێن وی، ئەو ئاگرە دبێ وەكە باغەك یێ گولا وەكە جنەتێ د ناڤدە وێ بنڤێ.

(٣) ئەو خودایێ پڕ بهێز لبا خوە بەهشتەك پڕ پاك و تەمیز ئامادەكریە ژبۆ وی كەسێ ب رەحم و رێز بت ئەوێ ژ فەرمانا خودا دەرنەكەڤت.

(٤) ئەو بەهەشتا كو شەرت و شرۆت هەنە ژ وان كەسێت كو رووتن ژ خێرا و زادێ وا یێ ئاخرەتێ كۆم نەكرنە ئەو بەهشت ژ وا دوورە. مرۆڤێت دەرەجێن وی نەبن و رووت بت و بێ خێرات بت تا ئەبەد ئەو ب سەر ناكەڤت.

پوڕ ژ قورئانا وی حەزکە هش جڤین ب دوستانی سەحکە

ئەمری وی گۆتی ب لەزکە عیشێ شەیطانی نەڤێ[١]

ئەڤ چ حرس و چ خیالە دونیا کر پشت و چەمالە

د بندا نالو و کالە ڕیڤی و بارێ دەڤێ[٢]

یێ وەلی هینگێ وەلی بی د طاعەت و ڕێیا نەبی بێ

ب ڕاستی دێ لێ خوەیی بی بەرهەڤی دی وی نەڤێ[٣]

موتەقی و ئەهلێ خودا چوون ژ ڤانێ مایی ئەز نزانم

ژ چەند هزاران یەك ب بێژێ ئەو حەرامە من نەڤێ[٤]

سەیدێ مە گۆت کەسێ غەدرێ بکت ئەو نە ژ مەیە

دارێ ظولمێ یان دێ باڤێ یان خودا دێ ئەو نەڤێ[٥]

جل کو پیس بو نە دورستە پێڤە میژکی ل وی ب نێڕ

---

[١] گەلەك ژ پەرتووکا پیرۆز یا خودا حەز بکە هشێ خوە ژێڕا کۆم بکە ب دوستانی لێ سەحبکە فەرمانا وی کری لەزێ لێبکە، شول و کارێ شەیتانی نەڤێت.

[٢] ئەڤ چ ڤیانا تەیە یا دونیایێ و هەر د هزرا تە دایە و تە دونیا دایە پشتا خوە دبندا تو تەوایێ و نالە نالا تەیە دبن دونیایێدا. ڕویڤی ما دکارە بارێ دەڤەهێ هلگرە تو ژی بێ هێزی تو نکاری ڤی باری هلگری.

[٣] وەلی چاکێن ئومەتێنە پشتی پێغەمبەرا ژ وا ڕە کەرامەت هەنە، کەرامەت ئەو کریارێن کو هەر کەس نکارە بکە، هنگی وەلی دگەهێ وەلیێ کو د فەرمانا خودا دابە و د ڕێیا نەبی دا بت ب ڕاستی لێ خودان دەرکەڤت بەرهەڤکرنا مالێ دنێ وی نەڤێت ئەڤ شەرتێ وەلیە.

[٤] (موتەقی) ژ خودا ترس و ئەهلێ خودا چوون و مرن نها نەمانە، ژ ڤایێن مایی ئەز نزانم کینە، ژ چەند هەزار مرۆڤان یەك هەبت بێژت ئەڤ حەرامە من نەڤێ، یێن ژ خودێ ترس دڤێت وەسابن ژ حەرامی دوور بن.

[٥] سەرۆکێ مە(سەید) کو موحەمەدە دگۆت ئەو کەسێ زەرەرێ ( غەدرێ) ل مە بدە ئەو نە ژ مەیە. نە ژ ئومەتێیە(لیس منا من غشنا) دارێ کوتەکی ( زولمێ) یان تو وێ باڤێژێ و کوتەکیێ ل کەسێ نەکێ یان خودا دی تو نقیبی.

خوون و گوشتێ مە ژ حەرام بت طاعەتێ مە وی نەڤێ[١]

طاعەتێ مە پوڕ ب قصورە ژ قەبوولێ دۆڕە دۆڕە

نە دوعایە نە حضوورە وەك جلا پیسە نەڤێ[٢]

زکێ تێر ئاگەهـ ژ یێ برچی نەبت خیزانێ ژار

دێ نەبێ بۆ من بەسسە ئەو طاعەتێ ڕۆژ و شەڤێ[٣]

دین گرێ ب کولب و کولاڤ وەهـ چ نێچیرە چ ڕاڤ

یان دێ بازەهـ بی د طەبعەت یا نە دی ژ دەست دەرکەڤێ[٤]

یووسف فرا پەڕوانەیە پێشمەرگەیێ دینێ خۆیە

ژ هندی نەیار بێ پەڕوەیە سەر ژی ددت بەر ناکەڤێ[٥]

---

[١] جلێ مرۆڤ چاخێ پیس ببت نە دورستە پی ڤە نڤێژ لێبکی ل ڤێ بنێڕە هەکە خوون و گۆشتێ مرۆڤ ژی ژ حەرامی بت تاعەتێ مرۆڤ ژی قەبوول نابە و خودانە ڤێ تاعەت دڤێت ژ جهەك پاك دەرکەڤێ، ئەڤە د حەدیسێدا هەیە.

[٢] تاعەتێ مە کێماسیێن پڕن ژ پەسەندکرنا خودا دوورە (قبوول) نە داخوازە نە ئامادە بوون ژ نڤێژ، وەکە جلکێت پیسین خودا ئەو ناڤن

[٣] ئەو کەسێ کو زکێ وی تێر بت، و هایێ وی ژێ برچی و خێزانێ ژارا نەبت دڤێت ئەو نە بێژێ ئەڤ تاعەتێ من یێ شەڤ و ڕۆژێ بەسن

[٤] ئەو کەسێ ئایینێ خوە ب کولاڤ و کلبێن خوە بگرە و بەرنەدە ئەو نێچیرەك و ڕاڤەك پڕ باشە ئەوێ وەسا بت ژ هەمی نەیارا بێ پەروەبە و پاکیە هەکە نە وەسا بێ وێ ژ دەستێ تە دەرکەڤێ. تەبعەتێ خوەدادێ وەکە بازەهـ بی. بازەهـ چاخێ ڕاڤێ دکە زۆر باش دگرە بەرنادە. مرۆڤ ژی دڤێت ئایینێ خوە باش بگرە.

[٥] دبێژێ خوە یووسف وەکە پەروانی، پەر پەروکن، یان پەرستانك. فراوی هندە، پەر پەرستانك ئەڤینداری ئاگرە خوەدا ڤێ ژێ ناڤدا و د شەویتە و دەنگ ژێنایێ دبێژی ئەز ژی پێشمەرگەیێ ئایینێ خوەمە ژ هەمی نەیاران ئەز یێ پەروەمە یێ پاکیمە سەر ژی ددم بەرناکەڤم.

## دین عەزیزە

دیــن عــەزیــزە ژ عــەزیــزی ڤــە ذەلیــل نــا بــت تــۆ جــار

عــەبــدێ ســەر ڕەش دێ ذەلیــل بــت فــەلاقــێ بــار گــران[١]

ب خوونێ شینە دین و دەولەت ل پشتا دینە هەر ژی دەولەتە

دەولــەتــا بــێ دیــن و زەحمــەت مــە ب پــارێزە ژ وان[٢]

سەر مە دین سەیوان ڤەدا بۆ چاخێ قەدر ژێڕا نە مابوو

وەك بــازەهـ فــردا ڕابــوو چــوو گــەهــا دەســتێ خــودان[٣]

ئـەهلێ دونیـایێ چ دینـە کێزکـا گوگـەر مسـك نـەڤینـە

کوڕ ب دووری حەوجە تۆ نینە شەڤ ڕەڤك ب ڕۆژێ وەسان[٤]

دیــن نــەیــێ دیــن ســەفیهــا پــاك و عاقــل نــەبیــتن

عەقلە کاپك یێ نەبت گورگی هلاند و بۆ خوە ڕەڤان[١]

---

(١) ئـایین پاکـە و بهێزە ژ وی خودایێ هاتیـە کـو ناڤـەك یـێ وی عزیـزە و (٩٩) نـاڤێ خـودا هەنە توجارا ژار و زەلیل نابە کولەیێ سەر ڕەش دێ زەلیل بت، فلاق فلاقی بێ هێزیە بارێ وی گرانە ژ گونەها.

(٢) دارا دیـن و دەولـەتێ ب خـوونێ شـین د بـت شـەهادەت پێویسـتە، ل پشـتا ئایینـە دەولـەت دەولەتا بێ ئایین گەلەك زۆرە و زحمەتە خودا مە ژ وا نەیارێن ئایین بپارێزە.

(٣) ئایین وەکە سهوانەکیە ل سەر مە هاتبوو ڤەدان چاخێ قەدرێ وێ نەما د ڤی چاخێ مە دە وەك بازەهـ فردا و ڕابوو و چوو گەها دەستێ خودا.

(٤) ئەو کەسێن دونیا پەرستن ئەو شێتن و دینن. وەکە کێزا گوگەرێنن، ئەو کێز هەژ بێهنا مسکێ ناکە بێهنا پیس لێ خوەش تێت. مرۆڤێت کور ژی ب ڕۆژین نە حەوجەیە ڕۆناهیا وێ نابینە شەڤ شەڤوك. چلێ چلێ، چەك چەکیلە، شەڤ ڕەڤووك، ئەو ژی ژ ڕۆژێ حەزناکە چاڤێت وێ زەعیفن ب شەڤ دەر دکەڤێت، مرۆڤێت بێ ئایین ژی هەروەسایە وەکە ڤان تشتایە.

مــه نــەيــارێ ديــن ژ دينــه يــێ نــەيــار ژی بــێ گومــان
دين ژ دەست ل يێ ل پێش ب ئيشه نه ژ گاڤان و شڤان[٢]

پۆرس ژ گورگ گورگێ چيامه خەتا یووسف ژ بن برانه
تــەشــقەلــه پــورِ ژی وەســانه نــه ژ كــەراخ و ئاشــڤان[٣]

(يــوم يــدعی كــل نــاس مــع أمــام) ئــەڤ مــەئــال
يــێ ب نێــرِ دێ دز ببينــه بــاقێ نيســكا نيــك نــەزان[٤]

ژ كوپەكو ئيشا نەقەنجان یووسف قەنجێن مه چ دين
هــن ب ئــاگر هــن ب پــاخر خــوونی يــەحيــا مــه نيشــان[٥]

---

[١] ئايين نه ژبۆ مرۆڤێن شێت (دين) و مرۆڤێت كێم هوش وا هاتيه. د شەريعەتێدا شێت و سەفيهـ ژ ئايين نه بەرپرسن. بەلكی ژبۆ وا كەسايه ئەوێن پاك و عەقلمەند بت. عەقل كاپكه و هەفساره ژبۆ مرۆڤی يێ عەقل نەبت. وەكه وێ ئاژەلێيه كو نەهاتيه گرێدان گورگ وێ ژ خوه رە د رەڤينه و دبه. شەيتان ژی مرۆڤێ بێ عەقل ژ خومرە درەڤينه و دبه.

[٢] نەيارێ ئايێنی ژ ئاييندارايه يێن نەيارێ ئايينی كو كافرن ژی بێ ئاگانه. ئايين ژ دەستێن يێ ل پێشه ژسووارێن گەلی باوەرمەندا ژ وا دئێشەهە نه ژ شڤان و گاڤانايه.

[٣] چاخێ يەعقووب پێغەمبەر (س) پرسيار ژ گورگ كر گۆت: چ گورگی گۆت: ئەز گورگێ چيامه گۆت: ته یووسف خاريه گورگ گۆت: ئەگەرا یووسف ژ برايه من هايی ژێ نينه و مه نەخواريه، تەشقەله هەمی ژی وەسانه نه ژ كەرا خۆ ئاشەڤانا.

[٤] رۆژا هەر كەس تێته گازيكرن دگەل رێبەرێ خوه. كال دنێ مرۆڤێ دگەل كيه حەشرا وی دگەل ويه. يێ باش بەرێ خوه بدێ وێ دزببنه لێ يێ نەزان دبێژه باقی نيسكايه. گۆتنەك يا مەزنايه دبێژن: زەلامەك هات مالێ ديت ڤايه پياوەك، زەلامەك ل باژنا ويه يارێ ژنێ رەڤی زەلامێ ژنێ دووڤكەت. ئەو رەڤی چوو ناڤ زەڤيەك يا نيسكا باقەك نسكچنی زەلامەك راست وا هات گۆت: هەوە خێره يارێ ژنێ گۆت: سەرا ڤێ باقا نسكا ئەڤێ هه دڤێت من بكوژه زەلامی گۆت: كورو تو دێ چاوا سەر باقەك نيسك زەلامەكێ بكوژێ زەلاميی گۆت: هەچی زانێ ژ خوه دازانه هەچی نەزانبێ ژ خوه باقێ نيسكايه.

[٥] ژبەر ئيشا كوپەكا و كوتەكا و نەباشا با یووسف چاكێن مه چ ديتن هن ب ئاگر هاتن سوتن هن ژی ب پاخر هاتن ئازاردان و داخ كرن. خوونێ يەحيا مەنيشانه. يحيا پيغەمبەر بۆ ب دەستێ نەچاكا هاته كوشتن و خوونا وی رژا

# حقوق پێشی بەلایە

ژ پوڕ حقوق پێشی بەلایە یێ کو پێك بینی نەمایە
پێشیا عێلێ تلیێ ڕاکە وەر حیسابێ ژ فەقەڕات[1]
مەزنێ ئەحمەق تە چ چاندی ئەو هشین بۆ تە هلاندی
چ بچینی دێ هلینی ل وڕ تە بێندەر ل ڤڕ خەبات[2]
ل تە زڤنگی ماسکانی توبەکە سەرمایەکانی
ب دوینا خایین قە نزانی دەڤ شرین ب پەیڤ بەطاط[3]
تە ژ هەوایێ دل پلۆخە تە خەرام زەر دار خلۆخە

---

(1) مرۆڤێت پێشیڤان، سەروك و ڕێبەر ژبەر کو ماف ل سەر ڕێبەری زۆرن ئەو ڕێبەرتی بەلایە ئەوێن وا مافا پێك بینت نەمانە. دڤێت ڕێبەر وەکە جهنشینێ پێغەمبەری عمر بن یان لاوازە ئەو ڕێبەرێ، ڕۆژا ڕابوونێ (قیامەت) دێ بێیە گازیکرن ڕێبەرێ عێلێ تلیا خوە ڕاکە وەرە حیسابا فەقیر بدە.

(2) ڕێبەرێ نەزان تەلڤر چ چاندبە ئەو شین دبە ئو تو هلینێ، چ بچینێ بەرهەمێ تە ئەوە هلینێ بێدەراتە ل وڕە و ل ڤڕ تە خەباتە.

(3) ل تەیا زڤنگی، زڤنگی دکەڤە ناڤەڕێ چیایێ بوتان زڤنگا حاجی علیا ناڤ بانگە ب کوردیا کەڤن ژ شکەڤتا ڕە دبێژن زڤنگ، نها ژی ل تورێ تورعابدین دبێژن زڤنگ، بەرێ خەلکێ گوند د شکەفتا دە بوون نها ژی زڤنگا ژیری هەیە هەمی شکەفتن، دخانیێ مەدە ژی دوو شکەفت هەنە دوو قاتە سەر و بن. د گوندێ نو دە ژی شکەفت هەنە گوند نەما وێران بوویە ژبەر شەرێ پەکەکێ، ژێ ڕا دبێژن هۆزا حاجی علیان زڤنگە و خورسە هرارشە. ماسەکی باڤکێ مەیە(قەبیلە) دبێژە خوە ماسکانی توبە بکە ماکا سەرمایێ تە، نە ب دونیا فانی ڤە نەزانی و تە ژ خوەڕە دوست زانی و تو خەلەت چوویێ دونیا دەڤێ وێ شیرینە و ب پەیڤە و بتاتە.

جان و جاهـ ژێ ڕا تە دەر دا هێژی ژی تێت تە شطاط[١]

بەس مژول بە تو ب بورچان یان ب زولفان یا ب گورجا

یان د مینت ئەو ژ قەنجان یان ژنا مالا خەرات[٢]

تە ژ دنێ خانی و ئودە هەیکەلێ عود پشت تە کودە

نە ڕوکۆعە نە سجۆدە بۆ بوهشتێ کا خەبات[٣]

---

(١) تە ژ هەوایێ دبێژن: هەوایێ نەفسێ دلێ تە پلوخە، پلوخ دبێژن: ئەڤ سیف پلوخە یانی خوە ژ هەڤ بەردایە گەهشتیە تەشبیها دلێ خوە کریە ب فێقی گەهشتبیەڤە، پرچا سەرێ خوە شبهاندیە ب خەزامێ دارێڤە چاخێ بەلگ زەر دبە دبێژن: خەزام زەربوو؟ لاشێ خوە شبهاندیە ب دارا خلوخەڤە ئەوا ناڤا وێ کون بوویە و ڤالایە، ڕۆهێ خوە جان و شەرەف و قەدرێ خوە تە ژێرا دەردا هێژی ژبێستین تەشتات گازندە. یانی دونیا پووچە نە ڕاستە دەرەوینە تو چ ژێرە بکێ ژ تە قایل نابە وێ گازنا ژ تە بکە.

(٢) دبێژیت: تو بەس مژوول ببە ب چێکرنا ئاڤاهیێ بلند وەکە برجا بەلەك یان تو مژوول ببی ب زولفان زولفێ ژنا بسکێ وا یان ب وا ژنێن کوك ڕندن وەکە گورجیانە. دبێژن: ژنێ گورجستانێ پڕ بەدەون و ڕندن. ب ڤاڤە مژوول نەبە، ئەڤێن دمینن ژ مرۆڤێن چاکرا هەتا دمرێ و دچی تو پاش خوەڤە دهێلێ یان ژنا مالا خەرات شونتەڤە دمینی.

(٣) ژ دونیایێ خانی و هودە لێ کال هەیکەلێ خوە بنێڕە وەکە عودێیە توقوف دبی پشتا تە دبێ وەکە کودا وێ تەنە ڕۆکوعە ژ خودێ ڕا تو خوە نا تەوینێ و سەرێ خوە دانانێ عەدرێ کا تە ژ بەحشتێڕا چ خەبات کریە.

# توبەکە نە دەرەوین بە

ژ بورجێ ڕابە هش جڤێن بە توبەکە نە دەرەوین بە
ببە دەرویش دل حەزین بە نابی قارۆن شەداد[1]
ئایا ئیبراهیمی ئەدهەم بەردا مال سەڵطەنەت
ژ هەمیێ کەشۆل هلانی ب دنێ کەت بێ نان و زاد[2]
قوطبێ قورئانا سەماوی سورەتێ زیلزال بز
چوون ل سەر مثقالە ذەرە فرو گەر و ئیعتیماد[3]

---

[1] ژ ڤێ خانیێ وەکە بورجێ را بەهشتێ خوە بەرهەڤ بکە ب دەسرێ خوە پوشمام ببە نە دەرەنگە و نە توبەك دەرەوین بت ببە دەرویش و ی دلێ تە بلا ب حوزن بت ل سەر بوورینا خوە تو نابی قارۆن و شەداد.

[2] تەماشە ئیبراهیم ئەدهەم بکە مرۆڤ دەولەمەند بۆ پاشا و مالك بۆ دەست ژ هەمی بەردا و کەشکول ژ خوە ڕە هلانی ب چولێ کەت نە نان بر و نە زێڕ و زیڤ ب خوە ڕە بر.

[3] عیال و کوفلەتی خودا ژار و بێ چارە و فەقیرو نەکار. دڤێت مرۆڤێ بهێز و دەولەمەند دلوڤان بن و دلسۆز بن بۆ وەلات و کەسێن د وێدا بن قوتب د دونە قوتبێ باشوور و باکوور ژ دنێرە. قوتب ژ وی ڕە دبێژن: ئەوێ فەر و هێز ل سەر ملێ وی بت و قوتب د سوفی تییدا. قوتبێ پەرتووکا ئەزمانی کو قورئانە سورەتێ (الزلزلة) ئەڤ سورەت ( فمن یعمل مثقال ذرة خیرا یره ومن یعمل مثقال ذرة شرا یره] (الزلزلة: ٧- ٨) هەمی کریارێن ئینسانا ل سەر وێیە فەرە و گەر و باوەری کرن.

# حەبیب

ئەبی لەهەب مامێ حەبیبی ژ لێزمی فەیدەك نەبر
بێ خوەیی چو دۆژێ هەڤالێ وی شەیطانێ لەعین[١]
صوهەیبێ رۆمی و سەلەمان دینێ وان ئەو برنە عەرشی
دێ کورێ دین بی ب تەقوا نەسەبا خۆ پشت نەبین[٢]
کەسێ من دەستێ منو ل من ب تنێ یووسفێ دین
بەردەرێ بۆرجا ئازادی چەرم و هەستی تا هەبین[٣]
دەست مە کەشکول ل بەر دوعایێ قەنجترێ قەنجا توی
بدە ئیذنا مەهدەرێ کت بۆ مە (خیر المرسلین)[٤]

---

[١] کەسی وەجا کەسی نادە ژبلی کریارێن مرۆڤ یێن چاك (ولاینفع ذا الجد منك الجد) ئەبی لەهەب مامێ پێغەمبەر و لێزمێ وی بوو چو فەیدە ژێ نەکر ئەڤێ هە چوو دوژەهێ و بێ کەس بوو و بوویە هەڤالێ شەیتانێ لەعین.

[٢] صوهیبێ رۆمی و سەلمان فارسی ئەڤە هەڤالێن رەسول بوون دینێ وان ئەو برنە عەرش، دڤێت تو کورێ ئایینی بی و ژ خودا ب ترسیی نەسەبا مرۆڤ فەیدا مرۆڤ نادە.

[٣] یێ فەیدا مرۆڤ ددە کەدا مرۆڤە کەدا دەستێ مرۆڤە وەجا مرۆڤ یا یووسفێ دین ژ خوەرە دبێژە. ئەز بتەنێ مە ل بەر دەرێ بورجا ئازادیێ تا هەبم و ببم چەرم و هەستیێ مەر ئەزێ ژ خودا دخوازا ئازادیێ بکم (عفو) ژ خودا.

[٤] دەستێ من وەکە کەشکولا دەروێشایە هەر دێ بلند بت ل بەر داخوازا (دعا) چاکترێ چاکان تووی. یا خودا ب دەستوورا مەهدەرێ ژ مە رە بکت ئەوێ چاك تیری رەسولایە کو موحەمەدە.

دل كـەمـەر بـەسـتێ دنـێ بـت تـە چ لـەقلـەق ب زمـان

مـەركـەزی ذكـری تـە قـەلبـە تـە زمانـە تـەرجومـان[١]

---

[١] دلێ تە وەختێ ژ دنیێ را كەمەر بەست بت (كەمەر بەستە) چاخێ هەمبەر یەكی یەك د ڕاوەستێ و هەر دوو دەستێ خوە دانێن سەر هەڤ ژێڕا دبێژن كەمەربەست چاخێ دل ژ دنێ را وەسا بت زمان چەند ورد و زكر ژی بكە فەیدە نادە دبیژن وێ لە قەلەقە جهێ وردا و زكری قەلبە زمان وەرگێرێ ویە.

## موحەممەد بۆ مە ئان

د حەدیثێ نابی مۆئمن گەر نەبن ئەم پەیرەوی
یێ موحەممەد بۆ مە ئانی ب دلەکی خۆش ل پەی ب مەشی[۱]
لەذەتا قەنجان ژ مێژێ وەك تیێ نۆشێ جەمەد
(ماشاءالله) یەك حضوورِ ژ وا وەك گولێ ب ئاڤێ گەشی[۲]
نە قسیس کوند و کونوژ بی و وەکی هەستیێ سطۆ گوهشك
نەکە عەنبار و خەزینە نەبە میر و نەبە مشك[۳]

---

[۱] د حەدیسێدا مرۆڤ نابە باوەرمەند هەکە باوەریێ ب ڕەسول نەینێ ئەوا موحەممەد بۆ مە ئایین بدلەکی پاك و خوەش ئەم ل پەی بمە شن و بچن.

[۲] لەززەتا چاکان ژ نڤێژێ وەکە ئەو کەسێ پڕ تێهن بوویی و ئاڤا سارا وەك قەشلیێ ڤەخوێ چەند ڕەهەت دبت چاك ژی ب نڤێژێ وەسانە. ڤیانا خودا یەك ئامادەبوونا وا ژ خودێ ڕا کو نڤێژە وەکە گولی گەش دبت، چاوا گول ب ئاڤێ گەش دبت.

[۳] مرۆڤ دڤێت نەقەسیس و کوند کنوژ بت وەکە هەستی ستو و هشك گونە گوشیت پێڤە هەبە و گوهشك ژی وەسایە چو خێر تێدا نینە. تو هەر مال بەرهەڤ بکی و بکی خەزینە و عمبار بکی و نە بخوی نەبدێ تو دبی وەکە مێهرو وی و وەکە مشکی لێتی، میهر و ژی تێر نابێ هەر بەر هەڤدکێ و ناخوێ عەمبار دکێ یەك لب زاد تێرا وێ هەیە لێ تەماکاریا وێ ناهێلێ لبەکی ببێ و بەسن.

# ئێش و بەلا

ئـاری ژار کـەژ قولیـداری ب قـەضـا و ئـێش و بـەلا
(ان الانســـــان لیطغـــی أن رآ منــــك الغنـــــي) [١]
دەرب ل سەر دەر بێ ل پشتێ دا سەرێ خۆ ڕانەکت
زێڕوییـێ خۆنـا خزانـی ڕیڤییـێ حیـل و فـەنـا[٢]

---

[١] دبێژێ هاریکاریا مرۆڤێت ژار بکە، مرۆڤیت ژار و بێ چارە ژ ددەستێ زۆردار ئـێش و ژان و قـەزا دیتنـە و دبیـنن دڤێت تـو هاریکاریـا وی بکـێ خـودا دبێـژە مرۆڤـێ چـاخێ خـورت و دەولەمەندبە. سەرێ خوە د چەولنگێ خوە ژ بەرکا خوە زیدە د ئاڤێژە.

[٢] داقەنە مرۆڤێ ژار سەرێ خوە بلند نەکە مرۆڤێت یان بهێز دەربێ ل سەر دەربێ ل پشتا وی ددە. مرۆڤێت کاربدەست وەکە کورمێ زێڕ و ویە چاوا زێڕ و خوونیێ دمژە وەسا ئـەو ژی خوونا مرۆڤێت خیزان دمژە وەکە ڕوێڤیێ حیل و پیلایە و فێلبازە.

# كوفر و ئيمان

كوفر و ئيمان فكر و جەيران شەرق و غەربی وا نەهن
مە خيالات پێلێ ئاڤێ ب يەك طرفەيێ د بينی كو هات[1]
ئيمان ئينان مە ب قورئان ژ خودايی بۆ مە هات
هەر چ تشتێ كو موحەممەد بۆ مە گۆتی مە ئينان[2]
فكرا كوفرێ نە ديار ب چاڤ گوهـ يان ژی نە پەيڤ
ژ هەفتی تۆڕا يەك ئيمان بت موئمنە نا بێ ئيرتيداد[3]
شاهدێ ڕدەتێ عادل سێ ڕۆژا تەوبە و حەبس
شوبها خۆ بێژە دێ ڕاكم گەر نەكر پاشی جەلاد[4]

---

(1) كوفور و باوەری و هزر (فكر) برق و برۆسك، ڕۆژهەلات و ڕۆژئاڤای وانینە كوردی دبێژن: فلان تشت بەر و پشتێ وێ نينە. هزر و بيرێ مە وەكە پێلێ ئاڤێ نە يەك تێ يەك دچێ بەلەز دبينی هات و چوو.

(2) مە باوەری ب قورئانێ ئانيە كو ژ با خودا بۆ مە هاتيە. مە باوەری ب هەر تشتەكی كو موحەممەد بۆ مە گۆتی هەيە نەبێ باوەرن.

(3) هزرا كوفرێ نەديارە تو ب چاڤێ خوە نەبينی ژ يەكی يان بگوهێ خوە نەبهيزی دڤێت ژێ نە پەيڤی نەبێژە: فلان كەس كافرە، ژ هەفتێ تورا قسما يەك تەنێ ژێ باوەرمەند بێت ئەو دبێ باوەرمەند نابێ ژێ دەركەتی، مورتەد ئەو كەسێ بۆ كريارەك نەباش يان گونەهەك مەزن ژی كربت ديسا نابێ مرۆڤ ژ ويرا بێژە كافر.

(4) ئەو ببێ شاهد ل سەر دەركەتنا يەكی ژ ئايين (مورتەد) دڤێت عادل و دروست بت د گۆتنا خوە دە و نێ ڕۆژان ژی وێ بێژنێ پووشمان ببە (توبە) بەكە و پاشی زيندان ژی هەيە وێ ژێرە بێژن كا شبهاتە چيە ژ ئايين بۆ مە بێژە دا ئەم شوبها تە ڕاكن هەكە توبە نەكر و ماسەر فكرا خوە يا شاش پاشی شەريعەت وی دكوژە.

## عەمەل

یێ ب عەمەل ژ حەشرێ بوهشتە بێ عەمەل ژ دۆژێ بوهشتە

یـان ژ فـەضلـێ یـان ژ تـەوبـێ یـان عـەذاب و یـان خـەبـات[1]

ژێ نەقەنج باوەر نەکە بێ پۆرس خڕابیێ ب کەس نەکە

دێ پـەشیمان بـی ژ وێ دێ هـن دە تـو سـوڕێ حۆجـۆڕات[2]

---

(1) مرۆڤێت خودانێ کریارێن چاك بت ژ مەحشەرێ وێ هەرە بەهەشتێ مرۆڤێ بێ کریار بت چاکی نەکربن لێ باوەرمەند بت ژ دوژەهێ وێ هەرە بەحەشتێ. یان ژی ژ فەزل و چاکیا خودێ یا ب تەوبێ یان ژی سەزایێ خوە دەرباس کر بەیان ژی خەباتەك یا و ویا چاك هەبت دیسا وێ ڕەها ببە بچە بەهشتێ.

(2) ژ مرۆڤێ نە باش و نە قەنج باوەرنەکە هەکە تشتەك بۆ تە گۆت و بێ پرسیار نەباشیێ بکەسێ نەکە خودا دبێژە: [ان جاءکم فاسق بنبأ فتبینوا] (الحجرات: ٦) هەکە تە بێکر و ئەو مرۆڤەك ئیشاند تودێ پەشیمان ببی ژ وێ کریارا خوە، تو تەماشەی ئایەتا [ان جاءکم فاسق] د پەرتووکا پیرۆزدا بکە، دبێژە: هەکە یەکێ نە باش دەربارەیێ یەکێدا تشتەك بۆ تە گۆت تو لێکولینێ لێ بکە ل دەم و دەست ژێ باوەر نەکە.

## خەبات بۆ تە تنێ

پـــورێ ژ دلخـــازا مـــە دەردا و هـــەمیـــا مـــن تـــو تنـــێ
لەوا ژ دەست تە مە حەیاتە مە خەبات بۆ تە تنێ[(١)]
شـــبی عـــوودێ نالـــە نـــال و همهـــێ بـــۆ تـــە تنـــێ
ل بەندە بندەر ل یووسف ئەو دەر نەذرە حەتا مرنێ[(٢)]
دیـــن دورا دەســـتێ خـــوادیی ڕۆهنیـــێ دا هـــەر جیهـــان
دۆڕێ دە دۆڕ ناسـی وەر نـەبـی قـەدەر دێ تـو نـە دێ[(٣)]
دا نەبێ ئاگەهـ ژ دین بی یان ب دین دونیێ ب خۆ
صەد ئەمانەت دا نەبی تو مشکی عەنبار ڕا خودێ[(٤)]
دز و مالخۆ ل هەڤ شریکن دین فروشن دوو جریقن
دین مە عەنقایە میثالە ل دۆر هەزار و چار صەدێ[(٥)]

---

(١) پڕ تشتێت دلێ مە دخوە بت مە دەردان ژ هەمیێ تو دێ دخوازا من تو تنێ هەلبژارتی ژبەر کو ژیانامە ژ دەستێ تەیە خەبات و کریارێن مە ژی بو تە تنیە.

(٢) وەکە عودێ دەستێ عودڤاندا هم هم و گوم گوما وێیە ئەم ژی زکری ب هم هم و گوم گوم بۆ تە تنێ دکن. جهێ بەندە بەندە را سەروکێ ویە ل سەر یووسف ژی نەزر بت ئەو ژی ل بەردەریێ تەیە حەتا مرنێ.

(٣) ئایین دوورەکە دەستێ خودا دایە ڕۆناهیا وی دایە هەمی جهـ و وارا دوور بابەتێ دوورناسیە هەکە بدێ دەستێ یەکێ کو چ ژی نەزانبت وێ دەمی قەدرێ وێ نامینە.دمینێ بێ بها.

(٤) شیرەتامن لتە ئەوە تو نەبێ ئاگەهبێ ژ ئایین یان تو ب ئایین دونیایێ ب خۆ سەد ئەمانەت دانە بی مشکیێ عەنبارا خودێ. وێ دەمێ تو دێ زەرڕەرکەربی وەکە مشکی دکەڤێ عەنبارا دەخلی.

(٥) گۆتنا پێشیایە دبێژن: دز و مالخوێ لهەڤ بوونە شەریك گا د کولەکێ دا دەرانین دز شەیتانە مالخوێ مرۆڤێت نەباشە هەر دوو هەکە ببت شیریکێ هەڤ ئایین بفروشن دێ بفروشن بدوو جریقا دوو قۆڕواشا، ئایین د ڤێ دەورامەدا بوویە وەکە پەڕندێ عنقا ناڤ هەیە ئەو بخوە نینە د ڤی قەرنیدا ژی وەسایە (١٤٠٠هـ) کو یێدا.

# مزگین

دینــێ فیــدا ژ صــەد هــەزار ســالا د هنــدێ هــێ هــەیــە
دیـن مـە کـەوثـەر نـەصـرِ مـە مـزگین ها شـەفـەق دیسا ڤـەدا[١]
مــە مــرن ڕوح لــەطیفــە ژ کــەســێ ڤــی بــت جــودا
دایکێ دل بۆش ژ هەر بەلا و ئیش مە خەلاص کت بال خودا[٢]
(ماشــاءالله) هــەر ژبــۆ ڕوهــ دۆڕێ نــۆڕێ کــەوکــەبــێ کوهــ
ئــەو گــولێ طوبــایێ عالــەم مــەرکــەزی ذکــرێ خــودا[٣]

---

[١] ئایینی ل هندێ ئەڤ سەد هەزار سالە هێژ تا هەیە وندا نەبوویە. ئایینێ مە وەکە ئاڤا کەوسەرێیە هەر کەسی ڤەخو توجارا تێهن نابە و نامرە، مزگینیا سەرکەفتنێ نێزیکە وەختا ڕۆناهی ل مە دەرڤێ ئەم دیسا ب ئایین شاد ببن.

[٢] مرن دەرکەتنا گیانی ڕۆهە (ڕوحە) ژڤی قالبێ نەدیار و ستوور دەردکەڤە دایکا مرۆڤ یا دل بوش (دل بیش) (ڕەحم) ژ هەمی نەخوەشیا مرۆڤ د پارێزە مرۆڤ خەلاس دکە دگهینە خودا، ئایین وەکە دایکا دل بیشە.

[٣] ماشائەڵلاهـ ژبۆ گیانێ (ڕوحی) وەکە دوڕێیە وەکە ستێرکا چیایە وەکە گولێیە دارا توبائیە ژبۆ عالەم ڕا مەرکەزێ بیر ئانینا (زکرێ) خودایە ڕۆهێ چاك وەسایە لێ پیس و خەبیس بت ڕەشە وەکە ڤێرێیە سفویە مرارە.

# سەرکەشی

ژ سەرکەشی دێ خۆ ب کێشی بەندە یێ لیەك ئاوەیی
شبی فەرهاد ب زەند و بازا گەر چ دونیا دۆژە بی[١]
دێ نە نانخۆر جل قەتین بی نیعمەتێ دێ دەرنەدی
بەندێ مەهدێ هەتا لەهدێ د فەرمانا تە بی[٢]
گەر ببی ئینسانێ کامل شاهنشین حۆر و پەری
صوحبەتا صالح و قەنجان د بوهشتێ بۆ مە بی[٣]
لازمە ئیمانێ خوەیکی ب قەنجیێ دا زێدە بی
می و مێوێ دێهن نەدی دێ شیر و شیرانی نەبی[٤]

---

(١) ژ سەرکێشیی سەرۆکاتیێ و ڕێبەری خوە دوور بکە بەندەیێ خودا دڤێت لیەك ئاواییبت ژفەرمانا خودا دەرنەکەڤت، د سۆزا خوە دە وەکە فەرهاد بت بزەند و بازا چاوا ژبۆ مە مەعشوقا خوە لات د کولا. بەندەیێ خودا ژی هەکە دونیا ببە وەکە دوژەهێ دڤێت هەر بەندە بت.

(٢) دێ نە نان خوەر و جل قەتین بت ژ تاعەت خودا پەرستیێ دوبی و چاکێن خودا باڤێ ژی بەندەتی ژ لاندکێ هەتا تربێ دڤێت تو د فەرمانا خودێ دابی.

(٣) هەکە تو بوویی مرۆڤەك تەمام و کامل شاهنەشین و حوریێن بەهەشتێ و پەرینێ وێ و هەڤالەتیا چاکان و باشان دبوهشتێ وێ بۆ مە بت وێ گاڤێ.

(٤) پێویستە تو باوەریێ ب خودان بکی ب تاعەت و چاکیا دا زێدە ببت میێ پەزا مێشن، مە، و دارا مێوێ هەکە تو باش گوهێ خوە نەدیێ و خودان نەکێ شیر و شیرانی تو ژێ پەیدا ناکی ب دەست نائێخی، بەهەشت و خوەشی ژی وەسایە.

هنگڤی کیمیاوی ژ حەر بت وەك ئەوێ خایین و خوەهر بت

نـە ژ بـری ڕا خـوون جـەگـەر بـت دێ توجـا تێـكـل نـەبـی[١]

[١] هنگڤـین، هەنگـەبین، هنگـوڤ، دەمـوش دەرمـانێ گەلـەك دەردایـە. خـودا كـریـە شـەفا [یخرج من بطونها شراب مختلف الوانه فیه شفاء للناس] (النحل: ٦٩) چاخێ كمیا وێ ژەهر بت وێ چاخی نابێ دەرمان وەكە ئەو مرۆڤێت ژ ئایین ڕا خایین و خوەهر بت ژبۆ برایێ خوە نە دل ب ئێش بت نە فەدائی بت توجا هەڤالەتیێ پیرە نەكە. بەحسا پرانیا گەلا دكە وەكە گەلێ كورد.

## بوڕجێ پوڕ هەیبەت نەما

مـا تـە فـەیض دیجلـە فـوڕاتن پاسـافیك نوقطـەیـێ سـر
یـا نـە تـو ئـابێ حـەیـاتێ بـوڕجێ پـوڕ هـەیبـەت نـەمـا[١]
صەد وەکی یووسف د شیعرێ خوەندەڤان ل پێش شاهیێ
دەستێ دوستا ل بەر دوعایێ فوڕس و فوڕسەت ژ سەما[٢]

(١) دبێژی مابەرەکەتا تە دیجلە و فوڕاتن دەریا باسفیك یەك نوقتەیە ژ سرا تە یان تو ئاڤا ژیانێ یێ بوڕجەك پڕ ب هەیبەتی و برسی، تو هێ مەستری.

(٢) سەد وەك یووسف شاعیر و خوەندەڤان ل پێش شاهیا تە ڕاوەستن و دەستێ وان یێ بلند کریین لبەر دوعایێت فەرسەت و فوڕسەت ژ ئەزمانا بێنە خاری.

# عەيد و نەورۆز

ب شـاهى هنـدى رۆژ تـە بێـتن عـەيـد و نـەورۆز ل مـە تێـتن
ژ بـورجێ ئـازادى ب دۆزێ صـەد هـەزار ب دەسـتوورى بـى[١]
تـە صـەفـەت قولّزەمـى عيلمـێ دەڤ ژى چـەشمـێ دو ڕو كلمـێ
ب مـەردى و جـامێرى يـا خـۆ د دنـێ مـەشـهوورى بـى[٢]
فريـێ فـەيـز و نـۆڕێ جـورێ ژ غونجـەيـا مـە هـەر ب فـورێ
يەك نەفەس دە ژێ مە عالـەم صەد صەباح مەخمـوورى بى[٣]
شـێوەئـێ بولبـول د بـاغێ گولسـتان لـەرزا مـەيـە
حـالێ عـۆدێ د دەسـت عۆدڤـان وەك مـە نـالێن كـوورە بـى[٤]
مـا شـبى بولبـول و فـەرهـاد گـول و شـيرين مـە وەلات

---

[١] هندى ڕۆژێن تە تەڤ شاهى بن جەژن و نەوروز بۆ مەبێن ئەم د خوەشيا دەبن ژ بوچڕا ئازاديێ بۆ مە بێن ب دوز و داخوازێن مە سەد هەزار جارا بدە سورى بن يارەبى تو دەستوورا مە بدى ئەم ئازاد بين.

[٢] تە سەفەت سنگا تە وەكە دەريا قولەزەمێ بت ژ زانستێ تەژى بت دەڤێ تە ژ كانيا حەياتێ بت ئاخڤتنا تە دوڕ بن ب مەردى و جاميريا خوە ددنێ ناڤ بانگ بێ.

[٣] فەيدەك زۆر مەوجابدێ ڕۆناهيەك ڕەنگاڕەنگ ژ پشكوژا مە هەر بێهنا خوەش ب فورهێ يەك نەفەسا تە عالم هەمى د چاخێ سحارێدە سەد سحرا سەر خوەش ببن، ژ ڤێ بمن لەزەتێ.

[٤] ئەم وەكە بلبل د باخێ گولا دە دلەرزن، چوا ئەو خوە ناڕاگرە ئەم ژى وەسانە، حالێ وى شبى حالێ عودێ يە عود دەستێ عودڤاندە وەكە نالە نالا كورەبيە ئەم ژى وەسا د نالن و دكالن. مرۆڤێ عاشق وەسانە، حالەتێ وا يێ تايبەت هەيە هەر هەم هما سنگا واى، عاشقێ وەلاتيە ئايين و وەلاتيە

مه چ حاجەت ب گولێ گەر د دەست مە لولو و حۆری بی[1]

ما شبی طۆبا ب پەیڤی یا نە وەك سەلوا و بەیڤی

یا نە وەك ڤێ ڕۆژ و هەیڤێ ژ عالمێ ڕا نۆڕی بی[2]

ما تو صۆڕگۆل بولبولم ئەز یانە شیرین ببم فەرهاد

یانە لەیلا ببمە مەجنوون یووسف هەر دێ گوری بی[3]

---

[1] دبێژی: ما ئەز وەکە بلبلم کو عاشقێ گولێیە یان ئەز وەکە فرهادم کو عاشقێ شرینێ بوو یا مە وەلاتە ژ گولێ ژی و شیرینێ ژی لبا مە شیرینترە. ماچ پێدڤیا مە ب گولێ هەیە هەکە وەلاتێ هور و لولو وا دەست مەدەبت هوری و لولو دوو دەولەتێن کوردانە د مێژوویێدا هەنە زۆر ژ واتێنە ئاخاڤتن.

[2] دبێژن ما تو شبی توبایی هەکە تو باخڤی یانژی وەکە توتیێ د ئاخڤتندا. یان تو وەك دارا سەلوایێ سەلوا دارەك گەلەك ڕندە و بەژنا وێ لاوە ژ جورێ کاژێیە. یان تو وەك دارا بەیفێ یی، بەهیڤ یان تو وەك ڤێ ڕۆژ و هەیڤا هەیا ب ڕۆناهی یێ ژبۆ عالەم ڕا بەلکی تو ژ وا هەمیا زێدەتری.

[3] ما تو سەر گولی ئەز ژی تەرەببم بلبل یاتو شیرینی ئەز تەرەببم فرهاد یان تو لەیلا یی ئەز ژ تەڕا ببم مەجنوون یووسف هەردێ گوری وەلاتێ خوەبت، کو کوردستانە.

# خەزینەك خەفی بووم

خودا گۆت خەزینەك خەفی بووم وەلی

مە حەز كر تو ناس بم دناڤ عالمین[1]

ژ بوونا عیبادەت وی ئەم چێكرین

هەبت ئەم هەین نەبت ئەم نە یین[2]

---

[1] خودا د حەدیسك قودسی دا د بێژە: (كنت كنزا مخفیا فخلقت الخلق فیە عرفوني)

خودا گۆت: ئەز دەفینەك ڤەشارتی بووم من عالەم چێكر دا من ناس بكن.

[2] ژ عیبادەت ڕە وی ئەم چێكرنە هەكە خودا پەرستیا مە هەبت ئەم وێ هەبن هەكە ئەو نەبت ئەم نینن خودا دبێژە: [وما خلقت الجن و الانس الا لیعبدوني] (الزمر: ٦٧).

## ژ پیلانێن تە دونیایێ

ژ پیلانـێن تـە دونیـایێ گـەلـەك چـوو نـە ب دلـێ كولڤـە

ژ برینــا ڕەش نهــا ژی ئــەو د نــالینن ژ تــە دونیــایێ[1]

نـزانم ئـەز خـەبـەر دم ژ یـێن مـە ئـەڤ ئـاخ صـۆر ب خوونـا وان

و یــا ژ حــالێ ئــەڤــان ســاخێن ژ وان مــایی د دونیــایێ[2]

ب ملیونـان ژ مـە چـوون یـێن ب دەسـتێ كوپـەكـا ژ وان ڕا

مـە ڕۆهنـك خـوون و مـەرجـانن دەمـا دەم لـەرزەیـا تـایێ[3]

فەسـادێ ژ تـە خوەشی كـانێ نـە قـەنجان دی نـە نـەقـەنجان

هـەمـین چوونـە ب وان پـەنجـان شـبی وا یـێن د هـەوا دایـێ[4]

---

[1] فێـل فێلبـاز، فـرت حیلـە و پیلـە. پـیلان پەیڤـەك توركیـە، دبێـژێ: ژبـەر فێلبازیـا دونیـایێ گەلەك مرۆڤ ژ دونیایێ چوونە بدلەكی كولڤە دلخوەش نە بوونە ژ دونیایێ، ژبەر برینا ڕەش كو ژ دەستێ تە دیتنە نوهو ژی دنالینن ل تە دونیایێ.

[2] ئەز نـزانم ئـەز ژ كـی بـاخڤم ژ وا یێن كو ئـاڤ و ئاخامـە ب خوونا وا سور بو وە كو ب دەستێ نەیاران هاتنە كوشتن یان ئەز ژ وا یێن كۆمایین ساخ كا ڕەوشا وا دێ چاوا بت ددونیایێدا.

[3] كوشـتیێن مـە كـوردا ب ملیونانـە ئـەوێن ب دەسـتێ كوپـەكا هاتنـە كوشـتن ژ وارە ئـەز ڕۆنـدكا ژ خـوینێ درێـژم كـو ڕۆهنـك بوونـە وەكـە مـەرجانان سـۆر بوونـە. دەمـا دەم ئـەم دلەرزەیا تاییێدانە ژبەر ڤایێن ما یێن كا وێ چ ب سەرێ وابێت.

[4] فەسادێ ژ دنێرا دبێژە: ما كا كی خوەشی ژ تە دیتیە. نەچاكادیتیە ونە نەباشا هەر دوو كا ژی ژتەنە دیتیە. هەمی چونە ب وان پەنجێن تە وەكە پەنجێن شێرو پلنگ و هرچا. وەكە وایێن هاتینە هلاویستن دارڤەكرن، وەكە شێخ سەعید و شێخ عەبدولقادر نەهری و سەید عەلی و سەید شەهابەدین و قازی موحەمەد و شێخ عەبدولسەلام بارزانی.

نەصیحەت دین مە ئیسلامەکی ئەم ژ هەڤڕا ب سەلامەتبی

وەلی ئەما ژ پەنجێن ڤالمێن دەورێ قەدەر نایێ[(١)]

ژ تە ڕا یووسف نەهن دەرمان کەسێ دەردێ وی ئەڤ ژان بن

یێ دایی یان دێ دەرمان کت ب حەکیما ئەڤ قەپەینایێ[(٢)]

ژ هەوایێ ئەز بریندارم نە عیشێ عەینە و ڕۆندکان

برینا من قە کفش ناکە حەبوو دەرزی قە لێ نایێ[(٣)]

---

(١) شیرەتامن ل تە ئایین مە ئیسلامە دا قەنە ئەم ژ هەڤرا بسەلامەتبن. هەکە وەسا نەبن ئەمێ ئەم ژ پەنجێن ستەمکارێن ڤێ دەورێ ڕەها نابن.

(٢) دبێژێ: خوە، ژ تەرا یووسف دەرمان نینە، ئەو کەسێ دەردێ وی ئەڤ ژانا هەبت یێ دای کو خودایە یان یێ دەرمان بکە هەکە دەرمان نەکە بتو نوژداران ئەڤ دەرد ساخ نابە دەرمان کرن.

(٣) ژ هەوایا نەفسێ ئەز بریندارم ئەڤ شولێ روت کەتایە و فیلمایە ژبەر کو ئەڤ برین دیار ناکە. کفش نابە حەب و دەرزی، شرنقە لێ نایی.

## بەنی ئادە

پورس ژ مە بەنی ئادەم چیە تەڤ یەك گیای و شینیە

یەك پارچەیە یەك چینیە ئینسان نە قالب هەیکەلە[١]

ئینسان عەقل قەلب هەواس قەنج و نە قەنج ب ڤان تێنە ناس

تو گوهـ نەدە زمان و كراس كر یار و نژیار سەر كەلە[٢]

شەركەت د ناڤ عەقل هەوەس تیرەك ژ دەستی وی فەرەس

هەنگاڤتە لاشێ بێ غەرەس كوشت یووسفی بێ تەشقەلە[٣]

ژ گوشتێ كەسێ نا عنرم ژ لاشێ مری بێ قرم قرم

ژ فیعلا تە یا پیس د هلفرم تەحلی تو هنگە حەنظەلە[٤]

---

(١) هەر تو ژ من پرس بكی بێژی: كورێ ئادەمی چ تشتە ئەز دبێژم: هەمی یەك شینیە و یەك پارچە نە یەك چینینە بنیاتا وان یەكە هەمی ژ ئادەم و حەوایێنە مرۆڤ نە ئەڤ قالبێ هەیە و نە ئەڤ پوتە ئەڤێ مرۆڤ ل بینە.

(٢) مرۆڤ هشە عقلە، قلبە دلە و هەوەسە ب ڤان مرۆڤێ چاك و نە باش ژ هەڤدوو تێنە ڤە قەتاندن، ناسكرن هەیكەلێ هەمیا یەكن، تو تەماشە زمان و وەرگرتنا وا چنە زمان و پوشینا وان چبە بلا ئەو بە، یا ئەساس كریارێن مرۆڤن، نژیار ئەویە سەركەل ئەڤە.

(٣) شەركەت دناڤبەرا هشی و هەوەسا مرۆڤی دا تیرەك ژ دەستێ وێ ڤەرسا. كو هەوەسە، ئەو لاشێ بێ خەبەرە ژبۆ ئەو نەخودانێ وی شەری بوو هنگاڤت كوشت یووسف ئەو بێ بەلا بۆ بەلا نەخوەستبوو. بەحسا خوە دكە دبێژە عەقلێ ڕاست چو هەوەسی ما ئەز ژ ڕێ دەرانیم.

(٤) دبێژە: ئەز ژ گۆشتێ كەسێ نا عەنریم ژ لاشێ مری بی قرقرم گۆشت لاشێ هەر كەسی وەكە هەڤ چ چاك چ نە چاك بت. دبێژە: ئەز ژ وێ كریارا تە یا پیس هلدڤرم و

پارچێ دزکەدا چار مەهی نەگها تە دەورا گونەهی
فعلا خڕاب پیس دەرگەهی ڕوهـ کر شەقی گوشت د قلقله[۱]

ظالم تو بەس خوونێ ب ڕێژ ئەحمەق قە نانێر ل پاش و پێش
مالدار و خیزان قوڕێژ یەك کەفەن و یەك قەلەقە[۲]

ئەم مانە شاش دەور غەیری ژ سنگێ سەروکا ڕەحم فڕی
مە صەد خۆزی ب حالی میری مە ژی ڤێ دنێ حەولەوەلە[۳]

دین مە جلە ژ هەڤ پەططی جیلا خەشیم ژ هەڤ شەتتی
گایێ ژ گێرێ فەلتی ب هەڤ نا کەڤن بێ وەلوەلە[٤]

چاڤ دە بهشتێ ئەی گەدە تەڤ شاهنشین ناز و قەدە

---

ژێ نەڕازیمە. تو تەحلێ لبا من وەکە حەنزلی یێ تو حەنزلە گیایەك پڕ تەحلە. وەکە وەکە شەماموکا پێڤە تیت تەحلن دبیژن: وا شومامۆك ئەبو جەهلی.

(۱) مرۆڤ چار مەها د زکێ دەیکا خوە دە دمینە ئەو پارچەیێ گۆشت ژ هەڤ ڤەدبە زارۆك ژێ دەردکەڤە مەلائیکەت ڕزقێ وی و ژیانا وی و چاکەیان و گونەهکارە ڤا هەر چارا دنڤێسە. هێ نەگەهایە دەورا گونەها لبا خوەدا هاتیە نڤێساندن، کریارێن وی پیسن ڕۆهێ وی کریە گونەهکار و شەقی ئەو گۆشتە کە دزکێ دایکا خوە دە دقلقلە.

(۲) یا ستەمکار تو بەس خوونا مرۆڤا ب ڕێژە یا نەزان ما تو نانێری ل پاش و پێشا خوە. حەساب گور و ڕابوون و مێزین هەیە. مرۆڤ چ مالدار و خێران و قەڕواش بت ئەڤ هەمی وەك هەڤن یەك کە فەنە و یەك قەلقەلەنە.

(۳) ئەم مانە شاش ژ ڤێدەورا هەر چەند غەیریە وەکە بەرێ نەمایە دلوڤانی ژ سنگا سەرۆکا فڕیە ڕەحم بوارە نەمایە مەسەد خوەزی ب حالێ یێ مری ئەم ژ ڤێ دونیایێ ڕا دبێژن: (لاحول ولا قوة الا بالله العلي العظيم).

(٤) ئایینێ مە دینێ مە وەکە جلەك کەڤن بت ژ هەڤ پەتیت بت ئەڤ دەستێت نو ئەڤ جیلا هە خەشیمە ژ هەڤ شەتتیە. چاوا گولوکا ریس ژهەڤ دشەتتە گایێ ژ گێرێ د فەلتێ مرۆڤ ب ساناهی نکارە بگهینە هەڤ بێ ڤیژ و ڤیژی و وەلوەلە، مرۆڤێت نها ژی وەسا نە کۆمکرنا وا زۆرە.



Zakho Centre
for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخو بۆ ڤەکۆلینێن کوردی

دونیــا فــیلم قیمــەت نــەدە ژەهرینــە ســێڤ و زەردەلــە[1]

نـەختـێ ئـەوی ئـەڤ طاعـەتـە تـو ژی نـە طـرس پـوڕ ڕاحـەتـە

یەك مێژ ل وێ حەفت صەد قەتە یەك دەندكە بەر خەردەلە[2]

عشـقا خـودا چقـا زێـدە بـێ قـەلبـێ بلـور دێ شـوعلە بـێ

عاشـق د ڤـێ مـەسـتا نـەبـێ بولبـول كـی مـەسـتی صۆڕگولە[3]

سـەیـدا بگـر نـك وی ب خـوین دیـن نـاس بكـە جاهیـل نـەمـین

تفكــە تــو جــەهــەلا دەرەویــن ئــەو ئافــەتــە ئــەو زەلــزەلــە[4]

دێ مێـر بـی یـان نـابی عـەلـی پـوڕ قـەنـج نـەبـی یـان نـابی وەلـی

عـیلم تـە نـەبـت نـاگهی مـەلـی عـیش نـە زمـان و پـەلپـەلـە[5]

---

[1] چاڤێ خوە ڤەكە تەماشەی بەهشتێ بكە. یا گەدە پەیڤەك یا سەر هەدێ یە ژ خورتارە و زارۆكارە دبێژن: گەدە. هەمی شانشینە و وارێن خوەشن و شیرینن دونیا وەكە فلمەك یێ سینە مائێیە قەدر و قیمەت پێ نەدە نەهێژایە. سێڤ و زەردەلێن وێ ژەهرینە، نە وەكە فێقیێ بهەشتێیە. یێ وێ شیفایە.

[2] نەختێ بەهشتێ ئەڤ كریارێن چاكن (تاعەت) تو ژێ نەترسە پڕ سەهلە. یەك نڤێژ ب حەفت سەت قاتایە خودا ژ بەندەیێ خوە ڕا زێدە دكە وەكە خەردەلێیە یەك دەندكە بەرێ وێ زۆرە. خەردەل گیایەك بەرێ وێ زۆرە.

[3] حەژێكرنا عشقا خودا لبا بەندەیێ وی چەند زێدە بت قەلبێ وەكە بەرێ بلورێ وێ ب ڕۆناهی بت. عاشق پێویستە ژ عشقا خودێ دڤێت مەستا نەبت. سەرخوەش بلبل ژ و عشقا سورگولێ مەستە سەر خوەشە، عاشقێ خودا ژی دڤێت وەسا بت.

[4] ژبۆ خوە سـەیدایەكێ بگـرە لبـا وی ب خوونـە و ئـایینێ خـوە ناسبكە نـەزان نەمینـە، تفبكە نەزانینا دەرەوێن ئەو ئافە تە ئەو زەلزەلیە.

[5] دڤێت تو گەلەك مێر بی یان تو گەهی علی كورێ ئەبی تالب، عەلی گەلەك مێر بوو د گۆتنێ شیرێ خوەدا، شیرێ عـەلی نـاڤ بانـگ بـوو (شـەڕێ خەیبـەرێ دا چاخێ ئـەو مەرحەب هـاتن بارا بەرهـەڤ. شیرێ عـەلی نـاڤ ل خـوە دا گـرت (انـا الـذي سمتنی امي

دەست و برا دوستێ بەڕێز وەر صوحبەتێ ب قەلبەك تەمیز
گوهدە تو ئەڤێ بەندا عەزیز یووسف تە شیعر شەكرێ كەلە[1]

---

حیدری)، ناڤ ل خوە دا ب حەیدر شێر. تو نەپڕ زانا بی تو ناگەهێ مەلی، ملاو زانا شول عیش نەزمانە و پەلپەلە.

[1] یا دەستە برا برایێ دبێژنێ دەستە برا، ب ڕێز وەرە هەڤالێ سوهبەتێ ب دلەك پاك گوهـ بدە تووڤێ شیرەتا چاك یووسف تە شیعر شەكرێ كەلەیە.

## دلێ زاهد

دلـــێ زاهـــد بـــەلـــور ڕەنگـــە شـــبی ڕۆژێ د عالـــەمـــدە
دلـێ یـێ دی ڕەش و زەنگـە ل تـەڤـی قـەلبـی ل تـە قـەرۆاشـی[(١)]
ب نێـڕ ل تـەوبـە نـەبـە ئاسـێ نـەکـە خـەزنـە پـەری کاسـێ
پـــەرەداغ و دوڕوفـــن ل ڕو طـــەنشـــتێن ڤـــی دەبـــر ماشـــی[(٢)]
ژ ظوڵمـا مللـەتـی ئـەی پـیس وەرە تـەوبـێ نـەمـین بـێ ڕیـز
ڤەکە چاڤا ب نێڕ ل بەر صیص د ڤی عومرێ خۆیێ پاشی[(٣)]
ببـــە دەروێـــش تـــو یـــەك دلبـــی ب ســـیما و صـــۆڕەت جلبـــی
نـە صـەد حـەیفـا زەمـانی کـو ڕهـێن سـپی بـدەنـە تـەڕاشـی[(١)]

---

[(١)] دلێ زاهدێ دنێ ڕەنگێ وی وەکە ڕەنگێ بەرێ بەڕوریێیە ڕۆهنە زەلیلە وەکە ڕۆژێیە د عالەمێدا چاوا عالەم ب ڕۆژێ ڕۆناهیێ دبینێ. دلێ حەژێکەرێ دنێ ڕەش و ژنگاریە تو بنێڕە ڤی قەلبی و ل ڤی قەڕواشی، قەڕواش و خزمەتکار

[(٢)] تەماشەی سورەتێ تەوبە بکە و خوە ئاسی نەکە، نەکە خەزینە و پەرا د کاسێدا نەڤە شێرە خودا دبێژە: [والذين يكنزون الذهب والفضة ولاينفقونها في سبيل الله فبشرهم بعذاب اليم] (التوبە: ٣٤) پەرە ڕۆژا ڕابوونێ داخن دووروفن ل ڕوویێ و تەنشتا وی مرۆڤی ئەوێ مافێ خودا ژێدەر نەخستیە وەکە زەکاتێ ب وا پەران تێنە دخێرن ئەو دەبر ملشە، موچە خوەرە.

[(٣)] ژ ستەم کاریا کول گەل تێنە کرن یا مرۆڤێت پیس وەرە ژ ڤان ببە توبە بکە نەمینە بێ ڕێز. چاڤێ خوە ڤەکە بنێڕە ل بەرسیس کا چ هاتیە سەری و کو گەلەك تاعەت کری د ڤێ ژیانا خوەیا داویدا.

ژ خودێ ڕا بی دێ وەك وی بی موسلمان دێ حقوق چی بی
یێ دل گور دێ نە پیشی بی شڤان گورگە ل سەر لاشی[۲]

مە ئینسان فەلەك و لاشن فەلەك ژی بێ قوطب نابی
فر و گەر مە هەمی قەلبە مە دل ژی ببندەڤا ئاشی[۳]

نە لەیزە تو ب ڤێ گورجێ مەکە کەیفێ د ڤێ بۆڕجێ
نزانی بۆ تە نا مینن خەشیم بنێڕە ل سەرا پاشێ[٤]

ژ ظولم زوو ڤەگەر ئەی کال و جاتە ناگرت ئەو حال
حیساب ڕوژە ب قیر و ڤیژە دێ تو بمینی ل بنێ کاشی[٥]

خڕ و جڕ دەعوە و دۆزە ل تە ئەو ڕۆژ نە پیرۆزە
ژ کێما ڕا چ نەوروزە ل تە ڕەسوایی ل تە حاشی[۱]

---

(۱) ببە دەرویش نەبە مالدارێ حەرام خوەر، بلا تەیەك دل هەبت سیما و ڕۆنگ و وەرگرتن چ دبت بلا بت نەحەیف بۆ ڤی زامانی کورهێ سپی ددەنە تراش دبێژێ: نە بابەتە کو مرۆڤێت ریسپی بتراشن و ڕهێ بەرنەدن.

(۲) هەکە تو بێژی ئەز ژ خودا ڕا مە دڤێت فەرمانا وی تو پێك بینی هەکە تو بێژی ئەز مسلمانم دڤێت تو مافا بپارێزێ ئەو دلێ وەکە یێ گورگی بت و نە دل نەرم بت دڤێت ئەو ەبت پێشی هەکە شڤان ژ پەز ڕا بۆ گورگ وێ ل سەر کەلەخی بت

(۳) مرۆڤ و فەلەك وەکە لاشن وەکە لاشێ مرۆڤایە فەلەك قوتباوێ هەیە یا باشوور و یا باکوور، ئینسانا ژی قوبەك هەیە ئەو ژی قەلبە فەروگە ل سەر ویە دل ژی وەکە بندەڤا ئاشیە ئاش ل سەر بنداڤێیە.

(٤) دبێژە تو بڤێ دونیا یا شیرین وەکە ژنەك گورجیێ یێ نە لەیزە کەیفێ ب ڤێ بوڕجێ نە کە. ما تو نزانی ئەڤ کەیف و لەزەت بۆ تە نامینن یا خەشیم و نەزان بنێڕە ل سرا پاشی مرۆڤ چو سەرا ما ڤالا.

(٥) ژ ستەمکارێ ڤەگەرە یا پیرەمێر ئەو حالێ ستەمکار وەجا تە ناگرێ حساب ڕۆژا ڕابوونێ (قیامەت) ب قیر و قەرەبالخ و قیژە تو دمنی لبنێ کا شیی ناگەهێ هەڤالان.

مەلك دل د دەستێ مالك دە ب طاعەت بە دێ ڕەحمەت بی

وە گەر نە ئەو عەذابە ل سەر تەڤی عەبدی نە پڕ باشی[٢]

---

[١] وێ ڕۆژێ ل سەما فان خڕ و جرە دەعوەنە و دوزن ئەو ڕۆژ ژیێ ستەمكار ڕا نە پیرۆزە ژبەر كو گەلەك دوزێ لێ ڤە دكن ڕەها بوونا وی نینە و نكارە ب ڕەڤە لێ ئەو ڕۆژ ژیێ كیم ڕە پیرۆزە وەكە ڕۆژا نەوروزێیە ژێڕا جەژ نە ژبەر كو وێ مافێ خوە وەرگرێ. یێ زۆردار ڕوو ڕەشی ڕسوایی ژێ ڕە هەیە.

[٢] پادشا، سەرۆك و ڕێبەر دلێ وی ددەستێ خودا دایە هەكە بتائەتبە خودا وی دلوڤانیێ لێبكە هەكە نە وەسابە ئەو هەمی مەزناهی ژێڕا سەزایە (عەزاب) وێ دەمێ تو كوێلەك نەباشی بەندێ نەباش.

## ئەجەل

مە مرن بەریا مرادێ داڤ مە زۆلفێن یارێ دین
دەست لێ ئالاند لێ نەزانی دەست خەتێن پەنجێن ئەجەل[١]
هن د بێژن و بال و زولفا کەیف لەذات دنێ
ژ حیلە بازێ ڤە نزانی بێ گومانن ژ ئەجەل[٢]
هندەکان ژ دونیایێ ریاسەت حیلە و پچ و سیاسەت
چوونە گورێ وان نەزانین ژ پیچ و پیلانێ ئەجەل[٣]
گەر نزانی تو ژ بەند و شیش و شونقارێ ئەجەل
تو ب کێشە ڕەسم و جامێ دێ دیار بن ژ ئەجەل[٤]
عالەما چوویی ب کولاب و پەنجەیێن هرچا ئەجەل

---

[١] مراد و مەخسەدێ ئینسانی زۆرن لێ مرن بەری مرادێ تێت مە هندەك داڤ دیتن ژ من وەیە زولفێن یارا منن من دەستێ خوە لێ ئالاند کو ئەز کەیفێ پێ بکم لێ من نەزانی کو نە زولفن بەلکو دەست خەتێن بەنجێ ئەجەلن، ل بەر من ڤەدابوون. کەسێن کەتە ناڤ وا دا ڤان ڤەڕەسانا وی نینە، وەکە کەوێ ب کەڤی ناڤ داڤا دە ناڤەڕەسێ.

[٢] هزر و بیرا هندەك مرۆڤان بەژن و بالا وایە و کەیف و لەزەتێن د نێ نە، لێ ئەو ژ وێ دونیا فیلباز نزانن بێ ئاگەهن ژ ئەجەل، نزانن ئەو لەزەت بۆ وا نامینە.

[٣] هندەك مرۆڤ هەنە نە مەخسەدا وا ڕێڤەبەریە ب خاپا بت یان ب سیاسەت بت یان ژی بڤر و پیچ و پیلان بت دڤێت ببە سەرۆك، ب ڤێ ڤیانا خوە ڤە چوونە گورێ ئاگەها وا ژ پیچ و پیلانێن ئەجل نەبوون.

[٤] دبێژێ: هەکە تو ژ بەندك کرنا ئەجەل و شیشا وی و چەلاکێ وێ نە ئاگەهی پەیڤا ئەجەل بنڤێسینە وێ ژ تەرا دیاربیە. ئەلیف وەکە شیشێیە جیما وێ (ج) وەکە بەندێیە، لاماوێ ل وەکە چنگالیە، مرۆڤ چاخێ کەت ناڤا ڤادە ڕەها بوون نینە.

مـه نـه دی یـەك بـێ تـه ڤـه ئـەم ژێ بكـن پرسـا ئـەجـەل[1]
ئـەو كـەسـێ دورا وی هـات و نـه ب حـەكـێم و نـه ب دوعـا
چـاره نینـه كـو خـلاص بـت ئـەو ژ نـاڤ پـەنجـێن ئـەجـەل[2]
هــەر ب نێــڕه ل قورئانــا عوپمــان ل ئایــەتــا (یكفــیكهم)
وەهـ چ صـۆڕ بـۆ ئـەو ب خوونـا وی نـەكـر مـەنعـا ئـەجـەل[3]
نــه ژ نــەبیــی و ئــەولیائــا نــه ژ ملــووك و خانــەدانــان
نـه ژ بـەطـەڵ و پـەهلـەوانـان كـەس نـەكـر شـەڕێ ئـەجـەل[4]
وەقتـا بێـتن یـا ل ڕاسـتێ یـا ل چـەپ یـا ل پـێش و یـا ل پـاش
موهلــەتــێ نــا دت ببیـــنم دوســـت و ئــەحبابــان ئــەجــەل[5]
نــه ب یــاری نــه ب نــەیــاری نــه ب جــوانی و ئیختیــاری
یــێ ب نــەفســا چــل نــەكــاری ئــەو نكـاره ب ئــەجــەل[1]

---

[1] ئـەڤ عالـەما چووین ب كـولاڤ و پـەنجێن ئەجـەلا وەكـه هرچێیـه مرنـه و چوونـه مـه نەدیتیـه یـەك ژ چوویـان ڤەگـەڕا بت و هاتبـت كـو ئـەم ژێ بپرسـن كـا ئەجـەل چ ب وا كریه و چ هاتیه سەرێ وا.

[2] چ كەسێ دوورا وی هات بۆ مرنێ تو چاره نینه نه ب نوژدارا نه ب دوعا چاره نینه كو ئەو خلاس بت ژ ناڤ پەنجێن ئەجەل.

[3] هەره تەماشه قورئانا ئیمام عوسمان كورێ عەفان خـەلیفێ سسا (٣) یـێ مسلمانا ل سـەر قورئانێدا سەرێ وی هاته ژێڤەكرن و خوینا وی ڕژها سـەر ئایـەتا (یكفیكهم) قورئـان ب خوینا وی سوڕ بوو. قورئانێ ئەجەلێ وی پاش نەكەت و پاش نەخست.

[4] تو كەس نكاره شەرێ ئەجەل بكەت نه ژ نەبیا و ئەولیائا و نه ژ ملوكا و پادشاهـ و نه ژ خانەدانا و نه ژ بەتل و بەهلەوانان كەسێ شەرێ وێ ناكر.

[5] چـاخێ مـن هـات ل ڕاسـتێ بێـت یـان ل چـەپ بێـت یـان ل پـێش یـان ژ پاشـڤە چـاوا بێـت موهلەتێ نادەێ مرۆڤ كو مرۆڤ خاتر بخوازێ و یان وەسیەتا بێژێ یـان دوسـت و هـەڤالا ببینم ئەجـەل، خـودا دبێـژه: [مـا تسبق مـن امـة أجلهـا ومـا یسـتأخرون] (المؤمنـون: ٤٣) [ولن یؤخر الله نفسا اذا جاء أجلها] [المنافقون: ١١).

عاشـــقێن ذاتـــی موقـــەدەس قیمـــەتـــێ نـــادن دنـــێ

دوســت و یــارێ وان خودایــە بــێ مــەجــال دمینــت ئــەجــەل[٢]

گـــەر برینـــداری ژ دەردێ کـــەیـــف و لـــذاتێن دنـــێ

ل دوو هــەبــا دێ تــو دەوام کــی یــەك حســاب و یــەك ئــەجــەل[٣]

نـــە دوروســـتی ژ بـــرارا دل پـــەرەســـتی ژ پـــەرارا چ قـــژك

نــەوروز و ســەر ســاڵ خــەلاســکر عــومرێ ویــران چوویــە دەر[٤]

کــیش و مــاطێ نــەدە قــەنجــان نــەبــە تــو لــە ل دەرێ ئبلــیس

دێ بی تو ژ مووچەیا وی گەر بخۆی دێ بت بیگانێ ئەجەل[٥]

---

[١] نەبیاری نە بنە یاری نە دلاوینیا خوە دە و نە پیریتیا خوە دە هەمی دەما دە تە کاری نەفسا خوە ئەو چلەك ئەوێ وەسا بت ئەو نکارە ئەجەلێ ژی.

[٢] لێ ئەوێن عاشقێ زاتێن پیرۆز بن ئەو تو بهایی و قیمەتی نادنە دونیایێ دوستێ وا و یارێ وا هەر خودایە ژ وێ پێڤە کەس دی نا حەبینن وێ دەمێ ئەجەل دمێ نێ بێ هێز و بێ کار، ژێ ناترسن کەنگی بێت بلا بێت.

[٣] هەکە تو برینداری ژبەر خاترا کەیفخوەشیا دونیایێ و تە دڤێت تو ژی وی دەردی ڕەها ببی و خلاس ببی ژ تەرا پێویستە تو ل دو حەبکا دەوام بکی حەسابە هەر شولەکێ تو بکێ دڤێت تو بزانبی حەساب ل دووڤ هەیە و یەك ژی مرنە یەك ئەجەلە. هەکە ئەڤ هەر دوو لبیرا تەبن تو دێ بدنێ نەیێ خاپاندن.

[٤] هەکە تو ژ برایێ خوە ڕە نە ڕاست و درستبی دلێ تە ژ پەران ب پەرێسێ پاقژك. چەند جورێ وا هەنە. قژکا وی توڤ مساسی. قژکا بەر و خورە. قرر. قاقیژك. قیژك. بەرەندەك نەچاکە گۆشتێ وی نایێ خارن (غوراب) نەوروز جەژنا کوردایە (٢١) ئاداری. سەرساڵ (١) یەکی کانوونا یەکی سەرساڵا خودێ دانا عیسایە. تە ئەو هەمی خەلاس کرن عەمرێ تە وێران بوو چو ئەجەل.

[٥] نەیارەتیا چاکان نەکە نەبێژە وا کش و مات. چاوا دلەیستوکا شاترەنجێ دا دبێژن، کش و مات بۆ شاهی. نەبە وەکە تولەکێ ل دەرێ شەبتینێ هەکە تو وەسا لێو مانی تە ژموچکا وێ خار هنگی تو مری چووی ئەجەل دێ کاربەتە.

ما بعەوفیت و فرۆزی بەر دەرێ کۆخێ لەعین
هەستی کوژ و پا تو خۆڕ بی ب ئەوەد ولەب و ئەجەل[1]

صەد ئەمانەت ببە کولە ل دەرێ یێ ژین تە ژ وی
ژ ئەمر و فەرمانێ نەمینی ڕۆژەکێ حەتا ئەجەل[2]

طفریا یا فرعەون قاڕۆن ئاخ و ئاڤ و خەز نەبوون
یەك ب ئاڤێ یەك ب ئاخێ سەرنگۆن چوونە ئەجەل[3]

ژ کوفر و ظولمێ دۆرە دۆر ب قەت توجا نێزیك نەبە
سەلبا ئیمان ب ظولم چێدبت چاخێ ئەجەل[4]

دێ نەزان د دیندا نە مینن یان ببهن یان بخوونن
ئەحمەقا دەرمان تو نینن سەر خۆشن حەتا ئەجەل[1]

---

[1] ما باشە عەو عەوا تە ل بەردەریێ کوخێ لەعنەتی و فیت فروزیا بدەتە ل بەر دەرێ وی هەستکا بکوژی وپاتوکا بخوی. کوت پاتوك، ئەو هەڤیرێ دکەڤە تەنورێدا د شەوتە ژ سارەتینن وێ دەمێ چ بێژە تە تو دێ بێژێ بەلێ کوردیە ئەوت ب ترکیە و ئەجەل ب عربیە.

[2] دبێژە: سەد ئەمانەتا من ل تە بت ببە کولەدەرێ یێ ئافەراندی و چێکری کو خودایە ژ ئەمر و فەرمانا وی دەرنەکەڤە ڕۆژەکێ ژی حەتا مرنێ و ئەجەل نەبێت.

[3] تفرِی یانی سەرخوە چوون. خوە مەزن کرن. ئەو فیرعەونێ مصرێ خوە پێ مەزن دکر ئاڤ بوو. قارۆن ژی ژ گەلێ مووسا بو زەکات نەدا ئەوی ژی خوە ب ئاخێ مەزن دکر فیرعونی دگۆت: [الیس لي ملك مصر وهذه الأنهار تجري من تحتي] (الزخرف: ٥١) قارۆن ژی دگۆت: [انما اوتیته على علم عندي] (القصص: ٧٨) ئەڤە خودا د قورئانێدا دگۆت: فیرعون ب ئاڤێ هاتە ژ ناڤبرن و قارۆن ژی د ئەردێدا چوو خارێ خەسف بوو چوونە ئەجل.

[4] دڤێت مرۆڤ ژ کوفرێ ستەمکاریێ دوورە دوور بت خوە بپارێزە توجا خۆ نیزیك نەکە ستەمکاری ل بەر مرنێ چێد بت چاخێ ئەجەل تێت.

دنێ موهمەل ژ هیجائێ (همزه الوصل) صیفەت

نوقطەیا فائا فەنائێ دبن سهو سەهوا ئەجەل[2]

گەر مریدی لازمە لێڤا بشو ژ دەستێ حەرام

ژ ئایەتا (لاترکنوا) غافل نەبی حەتا ئەجەل[3]

ما سەکانی گەر چ پیسە لێ ژبل یێ ژ وی

بۆ تو دی ئەقرار نەدارەد نەذرە لێ حەتا ئەجەل[4]

---

[1] دڤێت د ئایین دا نەزان نەمینن یان دڤێت و بخوینن یان ببهیسن لێ مرۆڤێت نەزان ئەحمەق گێل گێژ، دەرمانێ وان نینە سەرخوەشن هەتا مرنێ چێنا بن. دبێژن عیسا پێغەمبەر (س) مری و نەساخ و کور و کەچەل سا خ دکرن. رۆژەکێ یەك ئانین با عیسا، عیسا گۆت: ئەڤی چ هەیە گۆتن بێ عەقلە عیسا گۆت دەرمانێ وی نینە لبا من ببن.

[2] دراستی دا دونیا بێ وانەیە وەکە پیتا بێ نوقتەیە لێ ژبۆ مرۆڤ تێدا چاکیا بکێ دا مرۆڤ بگەهێ راستیێ کو ئەو دونیا دیکەیە ئاخرەتە و هەمزا گەهاندنێ نوقتا وێ یا نون وەکە نوقتا فائا فەنائتبە فانیە دبن سهو سەوا ئەجەل دایە.

[3] هەکە تو بێژێ: ئەز توبەدارم و مریدم و سوفی مە دڤێت دڤێت تو لێڤێن خوە بشوێ ژ ماچکرنا دەستێ حەرام و ستەمکار ژ ڤێ ئایەتا هە بێ ئاگەهـ نەبی حەتا مرنێ تا ئەجەلێ. کو خودا دبێژە: [ولاترکنوا الی الذین ظلموا فتمسکم النار] (هود: ١١٣).

[4] ژ خوە ڕە دبێژە: قەبیلاوی ماسەکیە ماسەکانی گەرچ پیسە و نە باشە لێ ژبلی ئەو خودایێ کو ژینا وی ژ ویە بتو کەسێ دی باوەری ناینە ئەڤاهە ل سەر من نەزر بت هەتا ئەجەل ئەز خوەدانێ ڤێ باوەریێ مە.

# سەحەر

بۆ خودا ئەحمەدی یوفی ب هەر زمان و هەر زەمان

هەم صەلاتان سەر موحەممەد ژ هندی عالەم هەر سەحەر[١]

هندی ذەرێن عالەمی یەك یەك ب زمانێ هەمیا

بین سەلام بین سەنا نورا موحەممەد هەر سەحەر[٢]

هندی ئەرواحێن موقەدەس ب صەلات و ب سەلام

تێن طەواف و تێن ثەنائێ نورا موحەممەد هەر سەحەر[٣]

ما مەجەرا ئاسیمانی یا نە شعرا مەعبەدی

موطەلەعێ شەمسا ئەحەد بۆ عالەمێ دەرکەت سەحەر[٤]

چیچەکا نورا خودایی نورێ عالەم ژێ بەلاڤ

پادشاهـ پاشی هەمیان تێ ژ لەو هاتە دیوانێ سەحەر[١]

---

[١] ژ خودا ڕە بت ب هەر زمانەك بت و د هەر چاخ و زەماندا بت ستایش و شوکر و پەسن ئەوێن بابەتێن زاتی وی یێ پاك و پیرۆز بن هەروەسا دلوڤانی و ژ خودا سەر موحەمەد بن ژ هەمی عالەم د هەر سحارا دە.

[٢] هنگە زەرڕێن د عالەمێدا هەبن یەك ب یەك ب زمانێ هەمیان، سەلام ئێمن بوونا ژ تشتێت نەخوەش ببن پەسن دارێ نورا موحەمەد هەر سحارەکیدا.

[٣] هەمی ڕەوانن پیرۆز ب دلوڤانی و ب سەلام تێنە تەوافا وی زاتی و سپاس بۆ نورا موحەمەد د هەر سحاریا دە.

[٤] ماتو وەکە ڕێکا کا دزا ئەز مانایی یان وەکە وێ ستێرکا تێتە پەرستن ما تو ژ وا مەزنتری تو جهێ هلاتنا ڕۆژا (ئەحمەدی) ژبۆ عالەمی دەرکەتی د چاخێ سحاریدە هاتی سەر ڕووێ دونیایێ.

د عــيلم و حوســن و ئــەدەبێــدا ئــەوەل و ئاخــەر ئــەوە

دەستێ قودرەت نەقشێ ئەڵماس بەرقێ لامع دا سەحەر[٢]

دل مــەقامــاتێن خــودایی جهــ حــەڕا وەحــی و نــزول

طــۆرسین نــوڕو تــەجــەلــی وەهــ چیــا زێــڕ و زەبــەر[٣]

جهــ مــەدینــە و ڕەوضــە نــوڕە قورئــان ســەر د بــاری

عــەینــە یــا صــەحێ حــەیــاتێ وەرە پــێش بــەر د ســەحــەر[٤]

بولبــولێن بــاغێ گولســتان شــەفــەقــان لــەرزە و تــایین

عاشــقێن نــوڕ موحــەممــەد د هــەیهــەیــا ڕەقسا ســەحــەر[٥]

ئــەی ســەحــەر مــزگین ل تــە بــەر تــە ل شــەمــالا ئــەحمــەدی

ئــەو شــەڤێن گــاڕی نــە ئێتن صــەد شــوکر ژ نوڕا ســەحــەر[١]

---

[١] تــو چیچــەلکا ڕۆناهیــا (نورهــا) خــودایی. ڕۆناهیــا عالــەمێ ژ وێ بەلاڤبوویــە تــو پادشــاهێ ڕوسولایی عەدەتا پادشاها ئەو چاخێ دیوان تەمام ببێ پاشی پادشا تێتە دیوانخانێ تو ژی د چاخێ سحارێدا هاتی.

[٢] د زانست و ڕندی بوو ئەدەبیدا یێ تەکیێ و یێ داویێ ژی هەر تووی دەستێ قودرەتا خودێ وەکە نەقشێ سەر ئەلماسی وەکە بروسکا ڕۆناهیێ دچاخێ سحاردا هاتی.

[٣] دلێ مروڤێ ئیماندار جهێ خودایە جهێ ڕەسول شکەفتا حرایێیە وەحی و قورئان ل وێرێ هاتیە خارێ، چیایێ توڕ و سینا جهێ تەجەلا خودایە، مووسا نورها خودا ل وی چیایی د دارا زەیتونێدا د پشت چاخێ مووسا گۆت: خودا من دڤێت تو خوە نیشا من بکی خودا گۆت: تو نکاری من ببینی تەماشەی چیا بکە هەکە د جهێ خوەدا کاربیێ بمینێ تو دێ من ببینی چاخێ جەمالا خودێ کەت سەر چیا حەلها و نەما.

[٤] جهێ تە مەدینەیە (یەسرب) ژ ڕەوزا تە نوڕ دبارە و قورئان دهات خارێ بۆ موحەمەدی تو وەکە عەینا ڕوکیتێ (فیلم) یا حەیاتا مرۆڤایی وەرە پێشبەر د سحارێدا.

[٥] بلبــل ســەودایێ گولێیــە د چــاخێ ســحاراندا بلبــل د ڕۆناهیــدا تێــت نــاڤ بــاغێ گــولان، گولستان دلەرزە و ژبەر عەشقێ نا گرە سەودایی عاشقێن نوڕا موحەمەد ژی د هەیبی هەیێدا نە چاخێ سحاری. وەکە وان کەسێ داوەتچی.

دەرگەهێ لوطفا خودایی وەصلێ ئەڕواحێن ئەزەل

ئەوە سەر کەهنیا حەمدێ دەست ل دوعا وەقتێ سەحەر[٢]

یێ ب وی شەهدە نەدت دێ ب چە کوفڕا ئەبەدی

جهـ دوژەهـ و ئاگر چ لەظاء و چ سەقەر[٣]

ل ما سەکانی نەذرە ئیقڕار بۆ خودا هەم بۆ ڕەسول

ل تە من شەهدە ئەمانەت تا هەبن بۆ من سەحەر[٤]

ڕەبێ من من دوور نەکی ژ فەیض و حوضووڕ و مەعریفەت

چاڤ نەکن مەیلێ ب جاهێ نەبیێ (ما زاغ البصر) [٥]

---

[١] یا سحارێ بۆ تە مزگینی بت بەرێ تە ل شەمالا ڕۆناهیا موحەمەدە و یا ئەحمەدە، ئەو شەڤا تاڕی و زلومات جارەکا دی نەئێتن کو ڕۆژێن کو فرێنە و نەزانینە سەد شکر ژبۆ نوڕا موحەمەد ڕا کو بیە ڕۆناهی.

[٢] ئەو دەرگەهێ چاکیا خودایە ب تە دگەهین روهێن ئەزەلێ، هەر ئەوە سەرکەهنیا حەمدێ چاخێ خودێ ڕادەستی وی بلند بۆ دوعا ژ خودێ کر بۆ ئومەتا خوە د چاخێ سحارێدا د گۆت ئومەتی ئومەتی.

[٣] ئەو کەسێ ب موحەمەد شەهدە نەدت (اشهد ان محمدا رسول الله) ئەو حەتا ئەبەد ئەو کافرە جهێ وی دۆژەهە و ئاگرە چ دژوارە و چ سڕ و سەقەمە.

[٤] ژ خوە ڕە دبێژە لسەر ماسەکی نەزر بت ئیقراری ب خودا و موحەمەدی بینم لتە من شەهدە ئانیە و ئەمانەت بت تا بۆ من  هەبن سحاری و دژیانێدابم.

[٥] یاڕەبی من من دوورنەکە ژ بەرەکەتا و حوزوڕ و ناسکرنا وی، چاڤێ خوە ژێ نە وەرگێڕن ب جاهێ وی نەبیێ کو چاڤێن خوە توجارا نەدشکاند ل هەڤالێن خوە.

## حەج و مێژ

دل گورێ د پوستێ مەهێدا ب حەرام سەرخوش و گێژ
ئەحمەق گەر تو ب بێژی دینێ مە یەك حەج و مێژ[١]
طاعەت و حەج ئەكبرێن خوە ل بەر حەقوقا قەت نەبین
یەك قورِوش ژ مالێ عیبادا هەشت هەزار چار صەد نمێژ[٢]

---

(١) مروڤێت دلرِەق بت وەكە دلێ گورگی بت و خوە دكی پوستێ مهێدا وەسا خوە نیشا ددە كو مرۆڤەك نەرمە و رِەحەتە لێ ب مالێ حەرام سەرخوەش و گێژە نەزان، نەبێژە ئایین یەك حج و مێژە ئایین نە ژ ڤا تە نێنە.

(٢) تاعەت حەج ئەكبەرا خوە لبەر مافێ مروڤا نەبینە كێمە یەك قورِوش مالێ مرۆڤان رِۆژا رِابوونێ بەدەلی وێ هەشت هەزار و چار سەد نڤێژە.

## جەننەت

نـەفـس و مـالێ موئمنـان خـالق کـری ژ وان ب جـەننـەتـێ
د جـەنـنـەتـێ دیسـا ڕەفـیقن دێ دەوام کـن د صـوحبەتـێ[١]
وان د حـــەڕ بێــدا د گــۆتن ڕوحـــێ شـــیرین مـــن نـــەڤـــێ
مـن دڤـێ ئـەز زوو شـەهیـدبم ب گـەهـیم وانـێن مـن د ڤـێ[٢]
غــالبێ صــەحبــان شــەهیــد چــوون (بــل أحیــاء عنــد رب)
صـــاغێن وان بـــۆ وە نشـــاندم دەڤ و ڕۆجـــان تـــەڤ بـــڕین[٣]
شـــەڤ د مێـــژێ ڕۆژ ب ڕۆژی ب شـــیر و ڕم و تیـــر و کـــەڤـــان
د ئوحـــەدێ زێـــدە ژ بیســـتان حـــەمـــزە یـــی کوشـــتن ژ وان[٤]
ئـەنصـاری پێشـمەرگـە بـوون د عـەصـڕا نـە بیـدا بـەرزە بـوون
د ئوحەدێ هەفتی ژ وان چوون ئێن موهـاجر شـەش هـەبوون[٥]

---

(١) نەفس و مالێ  باوەرمەندا ژ وا کریە ب جەننـەتێ، ژبەر ڤە بەهەشت دایە وا د بەهشتێدا دیسا ئەوێ هەڤالێن پێغەمبەرن و ل دورا وینە.

(٢) ئەوا د شەڕانده د گۆتن: من ڕحێ خوە یێ شیرین نەڤێ من دڤێ ئەز شەهیدبم بگەهم وان کەسێن من دڤێن.

(٣) پڕانیا هەڤالان (صحابان) شەهیدبوونە لێ بەلێ لبا خودانە ساخن، ئەوێن مایین ساخ  ئەز ژ وەڕا پەسنی بدم ڕوویێ وا و لاشێ وا تەڤدا برینن.

(٤) هەڤالان (صحابا) شەڤێن خوە دمێژانده و ڕۆژین خوە د ڕۆژی گرتنێدا د بوراندن و خوە ب ڕوم و شور و تیروکەڤانا ژبۆ بەرخودان و جیهادێ پێچابوون.

(٥) هـەڤالێن (ئەنصاری) ئـەوێن کـو خـەلکێ مـەدینێ  بوون کـو نـاڤێ هاریکـار بـوون ئـەو فیدائی و پێشمەرگە بوون، ژبۆ ئایینێ ئیسلامێ د چاخێ قاسدێ خوەدێدا وندابوون هـاتن شـەهیدکرن، د سـالا سسـا ٣ دچیـایێ ئوحودێـدا د وێ شـەریدا (٧٠) هـەفتێ ژ ئەنسـاڕا

دارا شـــەرەڤـــیَ دیَ هشـــین بـــت لـــیَ ب خوونـــا قـــەهـــرەمانـــا

سـەد هـەزار جـان ویَ بـدە ڕدن هندکـە هیَـژ ئـەڤ خـەبـات[١]

---

شەهید بوون، و شەش ژ پەنابەران (مهاجر) شەهیدبوون، مامیَ ڕەسول حمزە د وی شەڕیدا شەهیدبوو.

[١] دارا ئازادیا کوردستانا ڕۆژهەلاتا ترلیَ وا هەشین ببە لیَ بخوونا خوەشمێر و قەهرەمانا، سەد هەزار جانا ئەم بدن هێژی هندکە بو ویَ خەباتیَ و ئازادییَ، ئەڤ هزرا شاعێر بوو ژ وەلاتی ڕا.

## نەصیبێ مە

د هـزار و نـەهـ صـەد و هـەشـتێ و هـەفـت سـالْ مـیلاد
مـن عـەمـر هـەشـتێ ژ نـەصـیبێ مـە مـەیـل ئاڤێت فۆڕات[١]
فرقتـا وی ئـەز هلانـیم قـەصـدا ئـەسـتەنبـول مـەکـر
ئـەز گـەهـام ئاڤا حـەیـاتێ وەك گـولێ گـەشبوو فووئـاد[٢]
ل بـەژن و بـالا وی فکـریم د (أحسـن التقـویم) مـە دی
(بـارك اللـه) کـوك ل ژۆرە چـەق ل ژێـر ل طـۆپای هـات[٣]
سـەرمـەدێ ڕا دار قـودرەت سـەنـگ تلفزیـون و حکمـەتـە
هنـد سـو دەرسـەك عـەظیمـە شـەهـدە مـن (بـرب عبـاد)[٤]
شبنەیـا مـە ب خێـر و بێـر بـی دەستێ خـالقێ هـەڕا سـەری
علم و حیکمەت هەر مە دەرێ (صنع الله) د فەیچا فوڕات

---

[١] د مێژووا هـەزار و نەهـ صـەد و هەشتێ هـەفت بۆ سـالا زاینـی بۆ ژیـێ مـن هەشـتێ سـالْ ژ بـاژارێ نصیبینێ من بێهریا فۆڕات کر، دوور بوونا وی.

[٢] دوورکـەتنا وی ئـەز ژ هـولێ ڕاکـرم مـن قەسـتا ئستـەنبولێ کـر ئـەز گـەهام ئاڤا حـەیاتێ دلێ من وەك گولێ گەش بوو.

[٣] مـن ل بـەژن و بـالا وی فـەکـریم درنـدترین ل مـە ڤارا نێدە هـاتبوو چێکـرن. بارەکـە اللـه کـوك کـو سـەریە ل ژوورە دەسـت پـێ و ڕۆژ ل ژێـرن وەکـە دارا توبـایێ. دارا توبـایێ ژی کوك ل ژۆرە چکێ وێ ل ژێرن.

[٤] سـەرمەدی را دارە ژ قـودرەت ژبـەر مـە ژی تێدایـە سنگ وەکـە تەلـەفزیونێ سنکـی مـرۆڤ جهێ زانین و حکمەتێیە چێکرنا ئینانی هەندە سەك مەزنە من شەهدە بخورا ئینایە.

# باوەر ب تە خودا

بـــاوەر ب تـــە خـــودایێ بـــێ مێـــژوو زمـــانی
نـە بكووڤـە ل كـو تـو بـی جهـ تـە دزانـی[١]
(قـل هـو) مـە تلسـكوپ ئیمـان و فیلمـە
مینـا وی نـەهـن كـەس ناسـكە بخـودانی[٢]
بهتـــر تـــە دڤێـــتن بســـاروقا بناســـی
وەر ئـەسـمائی حوسـنا بخونـە لـی بزانـی[٣]
بـــێ جهـــ تـــو خـــودایی ســـبحانك شـــئانا
كـەس بسـەر تـەڤـە نـابن بێ دەوس و نیشـانی[٤]
وەك فرعـەون و هامـان ئـەحمـەق مـەنـەدیـن قـەت
هـاتن تـە خـودایی ب یـەك تیـر و كـەڤـانی[١]

---

[١] یا ئەو خودایێ بیێ مێژووە و بي دەورە چەرخ و زەمان ژێرە نینە وجە. و وارژی نینە تو هەر هەیی و ل هەر دەریێ ئەم و هەتە دناسن.

[٢] سورەتێ (قل هل الله أحد) وەكە ئامیرێ تلسكوپێ یە ئەوا كو تشتێن هوور دبینە ئەو سورەت باوەرییە و فلمە وەكە وێ نینن كو كەس ناس بكە ب خۆ دانێ وێ، خودا ب وێ تێتە ناسین.

[٣] هەكە تە بڤێت تو پتر خودا بناسی ب ساروقا وەرە ناڤێن خودا یێن رندن بخوینە تودێ ژێ بزانی، خودا كا چاوانە.

[٤] یا خودا تو بێ جهـ و واری تو پاكی ژ كارێ خوەڤە كەس تە نابینە و ب سەر تەڤە نابە تو یێ دەوسێ پێ شوین و بێ نیشانی و بێ بیرهاتن.

عــالم د تــەحــەيــور وەك مــن بــەهتــين تــەڤ

دەست خـەت تـە بـەديعـە قـەنج ژ وى ژى نزانـى[٢]

نيــنن تــە نــە ناســين مــا د لايــێ نكــايێ

ل نژيــارا تــە فكــرى ئيمــان ب تــە ئــانى[٣]

ئنسـان چـەپـر و غـرام ژ دەسـت گـاهێ خـودايێ

مـا ئـەشـهەد تـو هـوم خـەلـق هنـدك ژى دزانـى[٤]

بــاژارەكــێ بۆشــە تــەڤيــوك مالقــامێ

هـەيكـەل كـو گرێـدا سـەر سێزدە هـادانى[٥]

نقشك ژ ڤى هوورتر پێنج هەشت چلويـەك بوون

گوهـدە بخـو كومكـە ژ تـەفسيرێ مـە ئـانى[٦]

---

[١] وەكە فرعەون و وەزيرێ وى هاماني بێ عەقل و نەزان مەندى تن ژينى هاتن شەڕێ تە ب يەك تير و كەڤانى دەمێ فرعەون گوتە هامانى ژ من ڕە ئاڤاهيەك بلند چێكە دا ئەز هەرم سەر شەڕێ خودايێ مووسا بكم.

[٢] عالەم هەمى وەكە من مانە مەندەهوش و بەهتى دەست چێكەرێ تە خەريبە ئەم باش ژ وێژى بزانن.

[٣] كەس نينە تەنە ناسى نكارە ما دلايێ بكە بيژە خودا نينە هەكە ل بەرهەمێ تە تەماشە بكە و هزر تێدە بكە باوەريێ بتە تينە.

[٤] ئنسان چ بروغرامەكە دەزگاهەكە ژ دەست چێكەرێ قودرەتا خودايە ما أشهدتهم ئەوا شەهدێ پێ ددن خەلق هندكێ ژ كارێ خودا دزانن.

[٥] باژارەكێ بۆشە زۆرە ناڤ هەڤرا چوونا وێ مالقاصێ يە، هەيكەلێ وى دەما بهەڤە گرێدايە ل سەر سێزدەها دانينە.. طبائع (٤)، اركان (٤)، اخلاط (٤)، جوهر (٩)، طبقات (١٠)، اعمدە (٢٤٨)، حبال (٧٥٠)، خزائن (١١)، مسالك (٣٦)، انهار (٣٩٠)، ابواب (١٣)، حواس (٥)، عواد (١٤٨٥). ئەڤ مرۆڤێ ئاخاڤتيە كو وەكە باژاريية.

[٦] دەستەك نقشەك ژ ڤى هورير هەنە پێنج هەشت چل و يەك بوون بۆ خوە كۆم بكە ژ تفسيرى مە دەرانيە تەفسيرا طنطاوى.

نقشـــا ل پـــێ وان مليـــون و خـــەزينـــە
کـــایێ ڤـــان بـــزانن ژبـــل خـــالقێ بـــانی[١]

بـــاژارێ بخـــوەیـــی بـــت ژ نـــەیـــارا بپـــاریز
خـەبـات بـۆ خـۆیی بـت ئـەڤ ژینـا خـودانی[٢]

ل دارێ خـو بنێـڕە تـەڤ هـەنـدە سـۆ دەرسـن
طۆبـاکـی سـەر و ژێـر رادار مـە ژی دانـی[٣]

بـــالا تـــە بلنـــدە دە ڤـــرۆ نـــە ئـــەردێ
بـەژنـا تـەیـە خورمـە پـەنجـە مـوزەزانـی[٤]

دەسـتێ تـەیـە ئـەڵلاهـ دکـەفێ نوتـو نـەهـ نـاڤ
مێـــزەکـــە بخونـــە ئـــەو تـــورا خـــودانی[٥]

چـاڤ مـوهرە تلـی ئمـزا د گوهـدا هـەزار مـوو
هنگە وان ژی کەڤرکێن ب کەرا نوسدانی[٦]

---

[١] نقشا دەستا ل پەي وان ڕە ب مليونا و وەکە دەڤی نانە کایێ ڤا بزانی بن ژبلی خودایی ل ژوری ئافەراندەرێ ژورە پێڤە کەس نزانە.

[٢] باژارێ بخوەیی بت ژ نەیار و نەحەزا د پارێزە خەبات و خودانێ وییە ئەڤاهە خودان خوەیی دکە. ئەڤ شعرێن وی گەلەك هوورن و کوورن.

[٣] دبێژە لدارا خوە بنێ ڕە شبهاندییە دارێ. هەمی هەندە سەیە و دەرسن نە ژبەر خوە. پێ بوویە ب دەزگاهەکی پڕ خەریب چێ بوویە شبهاندیە دارا تۆبایێ دارا بەهشتیێ یە. کوکا وێ ل ژۆرە چەقێن وێ ل ژێرن. ژبەر دا فیکێ وێ نێزیك بە ژ ئەهلێ بەهشتیێ ڕە. کوکا ئنسانی ژی کو سەری یە ئەوژی ل ژۆرە. مەژی ژی وەکە ڕادارێ یە.

[٤] بەژنا تە بلندە دەڤ و ڕوییێ تە سەر و ژێرن بەرێ وا ل ئەردی یە. بەژنا تە وەکە دارا خورمیێ یە پەنجێ دەستێن تە وەکە فێقیێ موزێ یە.

[٥] دەستێن تە وەکە نڤیسانا (الله) دناڤا کەفا هەردوو دستادە ڕەقەما (٩٩) ناڤێ خودانە.

[٦] چاڤ وەکە موهرێیە تپل ئمزایە. دناڤا گوهادە مەزار موهەنە. هنگە وا ژی کەڤرێن هورهەنە و کەران و سدان ژی تێدە هەنە.

چـەرمـێ تـەیـە بێژینـگ هـۆر هـۆر ب قـولێرە
خوهـــدان و نـــەفـــەس دا هـــەوا خـــۆ هلانـــی[١]
هـــەیکـــەل تـــە خـــەزالـــوك ڕاچانـــد نورانـــە
ژ گـەهـ کـێن تـە هشـینن بنێـڕە تـێ بزانـی[٢]
شـــولێ دل و هناڤـــان پـــڕ ظـــور و گرانـــە
شـەڤ و ڕۆژ ئـەو دکـارن تـدبیر ژیـێ بـانی[٣]
هـن ل خـار نـوو خـونێ هـن ل ئـاڤ و هـەوائـێ
هـــن گـــرتن و بـــەردان هـــن جرنکوکـــانی[٤]
یـازدەهـ متـرە ڕووڤـی ئـور ژی وەکـی مـەرشـێ
ب تێکـــرن و ڕاچانـــدن وەك هیکـــە ڕادانـــی[٥]
ل ڤالاهیێ دوو گورچك لسەر ئور پیرە ڕەشکە
ژ خارنێ نەسلە خوون ئاڤ میز و خوەهدانی[١]

---

[١] چەرمێ لاشێ تە وەکە بیژینگێیە کۆن کۆنە، خوهدان و هەواتێرە دەردکەڤە هەوا بیژی ژ خوەرە دکێشە.

[٢].هەیکەلێ وەکە خەزالکۆکێیە. خەزالکۆك ژ قامیش چێدکێ چێدکرن وەکە شەکلێ خەزالیێ هەژیر پێڤەدانا نین. یانی لاشێ تە ژی هەمی ڕەهن ژ گەهێن لاشێ تە هشین دبن تو تەماشە بکی تووێ بزانبی.

[٣] شول و کارێ دل و هناڤان گەلەك زۆرە و گرانە شەڤ و ڕۆژ ئەو د کار و کریاریێ دەنە. پێك نائین ژ خودایێ بانی یە کو وا د دەکاری ناهێلە ڕاوەستن وەکە دل و یێن دی ژی.

[٤] هن خارنێ د حەلینن، هندەك خوونێ چێدکن و بەلاڤ دکن و هندەك ژی ئاڤێ و هندەك ژی هەوای ددن و دستینن. هندەك دگرن بەرددن. هندەك جرنکێ ئاڤێ نە هندەك ژی کانینە.

[٥] ڕووڤی یازدە مەترەیە دناڤا مرۆڤی دە ئور ژی وەکە مەرشکێ یە بتێ کرن و ڕاچاندنێ وەکە وێیا دناڤ هەڤرە دچە و تێت.

ما دار وهەباقی هەر دەست بیست و هەفت قەت
٣٣ موهرکێ پشتێ بێ میخ پەیڤەدانی[٢]

ڕاهـ تەڤ خەت و ڕێنە جیران نەدیارە
تەڤ تێلکو ڕانە ژ کارێ تە خودانی[٣]

ژ تەشریحێ دزانی هەر قانوونێ سینا
بەحرەك بێ بنی ئەو غەواسی دەرانی[٤]

د قورئانێ خودا گۆت ئادەم ب چ ڕەنگی
من چێکر و ڕوهدا قەنج وی ژ من نەزانی[٥]

ژ ئادەم حەوا عیسی بێ باڤ و دێن ئەو
وەك کەڤرێ دبن مە ژ کودێ ڤەوی ئانی[٦]

ڕۆژ ناز و دەلالە هەفت ڕەنگێ بەلۆرێ

---

(١) د ڤالاهیێ دە دو گورچك هەنە. ل سەر ئور ژی پا تەرەش پیرا ڕەشاخالخالوك ئەڤ ناڤێ وێنە ئەو هە ژبۆ حەلان د نازادییە گەلەك حەز ژ خارنێ دکە. خوون ئاڤ میز خوهـ دانێ خارن ڤایێ چێ دکە.

(٢) ماداروهـ هەر هەیە بەردەوامە هەر دەستەك بیست و هەڤت کەرن ٣٣ موهرك تێن پشتیێ هەبە بێ یی بزمار ب هەڤ ڤەدانانینە. خودا کارییە وا پەڤەبکە.

(٣) ڕهـ د لاشیدە وەکە ڕێیا و خەتانە جیران ژبۆ وانە یارن هەمی وەکە تێ لا و ڕانە ئەو ژی ژ کارێ خودانیە. ژ شولێ تەیە یا خودا.

(٤) تە بڤێت ژ زانستا رشیێ مروڤا بزان بی هەرە ل پرتەکا (القانون) ئەبو عەلی سینا بنێرە ئەو دەریایەك بێ بنە ئەوێ غەواسی بت دشێت زانینێ ژی دەرینە.

(٥) د پرتوکا پیرۆز دە خودا گۆتە ئادەم بچ ڕەنگەك عەجێب من ئەو چێکریە و ژیان من دایە وی لێ ئەوی باش ژ من نەزانیە زانینا وی بخودا کێم بوویە.

(٦) باڤێ ئادەم و دایکا مە حەوا و نەبی عیسا ئەڤ هندەك ژ وابێ باڤ دا هنژی دا بۆ باڤ نەبوو من ئاڤەراندنە. وەکە ڤان بەرێن دبن مەدا ما ژ کودیڤە ئەوی ئانینە. گۆتیە چێ بن چێبوون.

ل مـه فنـد و شـهمالـه دايكا مـه يـا بـانى[١]

ب مليونـــا ژ عـــهردێ مـــهســـتر ڕۆژه ژ ويـــژى

بێ حهد ژ وێ مـهستر ئـهڤ ستێ ڕێـن ل بـانى[٢]

هـهيـڤ و ڕۆژ سـتێر ژى ئـهو ژى وهكـى عـهردێ

تـهڤ كـهڤـر و ئـاخن يـهك ژ هـهڤ دهرانــى[٣]

ســاليّن ڤـێ عــهردامــه ب مليــون ســێ هــهزارن

ل ســـهرا ئيحتمالـــه ژ تـــاريخى مـــه زانـــى[٤]

طارپيســـتان بـــۆ نـــوردا پاشـــى ئاســـيمان دا

ئـهڤ ژ هـهڤ ڤـهقـهتانـدن نـوو شـين و داردانـى[٥]

ژ خوى ڕوهـ بـهرى بـهحرى طـهيرك ژى دگـهل وا

ژ ڤـان ژى بـهرى خوتـه نـهسـر ژى نێچيرڤـانى[١]

---

[١] ڕۆژ پڕ نازه دهلاله ڕنده هـهفت ڕهنگێ وێ هـهيه وهكـه بووكا بارانێ و بـهرێ بـالورێ. ئـهو ڕهنـگ تێره ديارن. ژ مـهره ژى فنـده و شـهماله و ڕۆناهييـه هنـدهك ژيانـا مـه ژ وێيـه دايكـا مهيه ل بانى.

[٢] ب مليونـا ژ ڤـێ عـهردا مـه مهسـتره مليونـهك سێسـهدوو پێنجـى جـارا ژ عـهردێ مهسـتره ژ وێژى بێ ههژمار ئهڤ هندهك ژ وا ستێرا عهسمانا ههنه ژ وێ مهسترن ل ژۆرێيه.

[٣] هـهيڤ و ڕۆژ و سـتێر ژى دچێكرنـا خـوه ده ببياتـا وا ژى وهكـه ڤـێ عهردامهنـه ژ كـهڤر و ئاخێ چێكرنه ههنه يان هـهمى ژ يـهك مادێ نـه پاشى خودا ژ هـهڤ ڤـهكرنه هـهر يـهك ئـاڤێ تييـه دهرهكـى ((كانتـا رتقـا ففتقناهمـا)) ژێـر ژۆر ب هـهڤ ڤـهبوون مـه ژ هـهڤ ڤهكرنه.

[٤] ساليّن ژيانا ڤێ عهردێ مه وهكه هاتيه ژمارتن ب مليون سێ هـهزارن. ل سـهرا هـهيه وه بت ههيه نه. نه ڤهبرِه ژ مێژوويێيه ئهڤا هه مه زانييه. دبه كێم بهيان زێدهيه.

[٥] بـهراهيكێ تارپيستان بـوو ڕۆنـاهيى دا پاشـى ئهسـمانى ئافهرانـد ژ هـهڤ ڤهقهتانـدن نوكـا شيناهى و دار دان و خهملاند كر جهێ ژيانێ.



Zakho Centre
for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخو بو ڤەكولينێن كوردى

ڕۆژا شـەشــێ حــەیـوان ئینســان نــوو لپــێ وان

ئــەڤ عالــەم و تــەدبیــر خــالق بــۆ مــەدانــی[٢]

داپیـــرا مـــە ڕۆژە دایکـــا مـــەژی عـــەردە

ژ ســـەرمـــایێ ڕەڤانـــدن ل مـــالا پیـــرێ دانـــی[٣]

ژ طــاڤێ مــە د ڕەڤینــە مــە دبــە هونکــاهیێ

ژ زڤســـتانێ ل دەشـــتێن هـــاڤینێ ل زۆزانـــی[٤]

شـێڤا گـایێ زەر تـێ دایکـا مـە یـا لـەیـلان

ژ مـــەڕا بکـــە پـــاریف قوربـــان تـــە جهـــانی[٥]

دایکـا مـە کوردســـتان پـڕ نـاز و گولســـتان

---

[١] ژیـان روهـ بـەری دەریـایێ و پەرەنـدا دگـەل وا ژی نـەهنگ پشـتی نەسـرە ئـەو ژی کـر نێچیرڤان.

[٢] ڕۆژا شەشێ ئاژەل حەیوان مرۆڤ نوکا ل پەی وا ئەڤ عالەم و تەدبیر خالقی بۆ مە دانی.

[٣] داپیـرا مـە ڕۆژە و دایکـا مـە عـەردە ئـەڤ مـە خـودان دکـن ئـەڤ نـەبن ژیـان دێ نـەبت بـەر سەرما عەردێ مە دڕەڤینە دبە مالا پیر دایێ کو ڕۆژە.

[٤] ژ تاڤێ ژی مە دڕەڤینە د بەر سیبەرێ هوون کاهیێ زڤستانێ ئەم تێنە دەشتێ گـەرمیانا و هاڤینـا ئـەم کـوچ دکـن زۆزانـا سـەکن بـۆ مـە نینـە هـەر چوونـە بـەرێ مـە ل وارەکـی ئەبەدییە.

[٥] شێڤا گایێ زەر شەڤەکا دژوارە دکەڤە ناڤە ناڤا هەردووکان و نادە پێ گۆتنەکە دبێژن دایکێ گۆتە زارۆکێن خوە شـەڤ نـەرازن و ڤـی گـایێ هـە سـەر ژێ بکـن. هـەر سـەربانی بەفرێ باڤێ ژن و دەستێ خوە بگۆت گـەرم بکـن ئـەوا ژی وەکـەر بـەر ئـاڤێ تـن حـەتا بۆ سـحار ئـەو مانـە سـاخ گونـدی هـەمی مانـە دبـن بـەرڤێ دەمـرن. خـانی ب سـەر وا دەکـەتن. دایکـا وا یـا دەلال ژ وارا کـرە پـەرێف. پـەرێف جەنـدەکێ گۆشـتییە دکـن د تـەنورێ دە سوهر دبە گـەلەك ب لەزەتە ل سێرتێ و بدلیسێ چێدکن. مەسەلە درێژە: دبێژە دیا مەیە ئەو ڕند و دەلال جیهان بلا گوری تـەبت. کوردسـتانە پەسنێ وێ ددە. مەسـەلا گـایێ زەر سەرداتینە

لەو د عالمێ بۆ بەحث عەنقایێ زمانی[1]

دایکا میدیایە د عالەمدا خۆیایە

ڕۆژ ژێرا چرایە دگەل عالەما بانی[2]

قەت ئەڤ نە عەجێڤە (في الارض خليفە)

تەڤ شینی بوو نەباتە فەرهەنگە کابانی[3]

ل ژۆر کەو سەر و حەودن ل ڤرِ قورئان و رەوضن

ڕۆژ بۆ مە بوو هشتە چێکر بۆ ئینسانی[4]

داپیرا مە ڕۆژە گەرمە وەکی دۆژە

تەڤ نۆرِ و تیرۆژە پیرۆز بە ل خودانی[5]

گەمی شلیو ئاڤێ ژ بەحرێ دکشینە

خودێ دهێلە د بەحرێ ژ عورا باران و کانی[6]

علمێ تە خودایی دەرمانخانێ عالەم

دەمەکی شوور و تەحلە دوما دی شیرینی[1]

---

(١) پاشی دبێژە دایکا مە کوردستانە پر نازە گولستانە ژبەر وێ د نا ڤعالەمێ دە بوویە بەحس یێ وەکەوی نینن د زەمانیدە بوویە عەنقاء.

(٢) دایکا میدیایە دناڤا عالەمێدە خۆیایە. ڕۆژ ژێرا چرایە دگەل عالەما بانی عەسمانانە.

(٣) دبێژە ئەڤا هە نەعجێبە د عەردێ دە خەلیفە دانیە ئەڤ کەسکاهی و شیناتی فەرهەنگە کەبانی.

(٤) ل ژۆرێ برکا کەوسەرێ وحەودێن ئاڤیێنە. ل ڤرِ ژی قورئان و رەوضا نەبی هەیە ژۆر بۆ مە بەهەشت هەیە خودا چێکریە بۆ مرۆڤا.

(٥) داپیرا مە ڕۆژە گەرمە وەکە دوژەهێ یە ئەو ڕۆناهی یە و تیرۆژا وێ پیرۆزبە ل خودانێ وێ کو خودایە تعالا.

(٦) گەرماهی شلی و ئاڤێ ژ بەحرێ دەریایێ ڕادکە و دکشینە وخێ ژ ڕاتێ دهیلە د دەریاییێدە ژ عەردی باران کانیا دەرتینە.

ژ ڕۆژا مــه حــەرارەت ژ ڤــێ بــای و هــەوایــە
ژ ڤــان ژی مــە نــەسیمە ئــاڤ نوشــێ جــانی[٢]
ژ ڤــێ ذکــر ژ ڤــێ فکــرێ غافــل نــەبــە جــارەك
علمــەك پــڕ مــەزن ئــەڤ تــەفســیرا قورئــانی[٣]
هــەر نوقطــە ژ صــونعێ وی هنگــە چیانــە
تــەڤ علــم و جــەمالــە بنێــڕ عالــەمــا بــانی[٤]

---

[١] زانینا تە یا خۆدا وەکە دەرمان خانێیە ژبۆ عالەمێ را دەمەکی چاخەکی شوورە و تەحلە و دەمەکی ژی شیرینە. دەریا تەحلە و شوورە دەمەکی هندەکی ژێ دکە دناڤ عەورا دە شیرین دکە.

[٢] ژ ڤێ ڕۆژا مەگەرمێ حەرارەتێ بایێ و هەوایێ ژێ چێدکە ئەم ژی ژ وی هەوایێ د مژن دبە تە ڕاهی ژبۆ پشتی نۆشی جان، گەلەك ئەڤ شعر کوورن دڤێت هزر تێدە وەرەکرن.

[٣] ژ ڤێ بیرئانینێ و فکر تێدە گرتی تو جار دڤێت مروڤ ژێ غافل نەبە. ئەڤ زانینەك مەزن نە ژبەر کو ئەڤ تەفسیرا پرتوکا پیرۆزە، زانا دکارن ئەڤان مەعنا ژێ دەرینن نەخوە هەر کەس فەهم ناکێ.

[٤] هەر دلۆپەك ژدەست خەتێ خودا هنگەچیا مەزنن مانی دران هەمی زانین و زانستە و ڕندییە تەماشە عالەما زورێ بکە ل ڤان نەقشا و ڤا ڕۆناهیا و ل ڕۆژی هەیڤا ل ڤێ چەمایێ و ڕندیێ. هەمی مەزناهیا خودا بۆ مە ددن نیشان دان. کو یەکە بێ هەڤالە هەر هەیە وێ هەر هەبت. دلۆپەك ژ شولێ وی هنگە دجلە و فوراتن.

# گولزارێ وەلاتێ

یــەك ژ گــولزارێ وەلاتــێ مــە ڕەشــینە چ ســەفــا
گەر د ڤێ ئـاڤێ حـەیـاتێ مـەلوێ کـانی کـەپـر[١]
ڕۆهنکــی چــاڤی بــی ل ئــاربي دوســـك و بــاد
خونێ یەحیای و عەقیقی مە هەوار بەخت و نەصر[٢]
شــێر کوهــ مــە هــەزار بــن لاوێــن مــە هــەمــی
د ڕێکــا تــە وەلاتــی مــە هــەمــی کرنــە نــەزر[٣]
نــازدارێ مـــە وەلاتـــی ب دجلـــە و فراتـــێ
پیــرۆزێ خــوەیــی بــت ل نــەیــاری قــەهــر[٤]

---

[١] د بەسنێ هندەك دەڤەرێن وەلاتی دە دبێژە. یەك ژ گولزارێن وەلاتی مەیە گوندەکە دکەڤە قونتارا چیایێ عێراقێ ڕەشیخە، کانی کەپرلورە جهێ کەیف و شاهی یایە. هەکە تە ئاڤا حەیاتێ ژیانێ تە بڤێت لور مە کەپر هەیە. و کانی هەیە هەرە ژێ ڤەخوە.

[٢] تو ڕۆهنکێ چاڤا بی ل گەلێ ئاری ل دوستك ل بادکورێ کەك کورێ دۆستك دامەزرێنەرێ دەولەتا کو کوردی دەلالەتا دۆستکی ل فارقینێ. ماتو وەك خوونا یەحیا پێخەمبەری یان تو عەقیقی مە هاوار ل بەخت و نەسرە. یەك وا ل هاوارا مە ژی وەرە.

[٣] مە ب هەزاران شێرکو مامێ صەلاحەددین ژ لاوێن وەلاتێ مە د ڕێکا ڕزگارکرنا تەدا ئەم هەمییا دکن نەزر و قوربانی. هندی وەلاتپارێز بوو ملایوسف: ئەڤ گۆتیە.

[٤] دبێژە یا نازدار وەلاتێ مەیە تێدا ڕووبارێ دجلە و فورات د هەرکە. پیروزبە ژبۆ خوەیێ خوە ڕە ژ نەیارا ژی قەهر و کول بە.

## گولزارێ وەلاتێ

یەك ژ گولزارێ وەلاتێ مەیە باسرەت چ فلیم

ما بەهشتا ئادەمی تو یانە باغێ ئیرەمی[١]

ئەڤ گول و چیچەك و بەخچە ژ گولستانێ بهار

بە گورانگەهـ و جڤاتی بو ب جوبار و چەمی[٢]

ئاڤەژین ڕۆهنكێ چاڤان د غەما نازداری بكی

یان د گابارده نەمایە جهـ ژی ب كول و دەرد و غەمی[٣]

ما تو ڕوو صورێ قەسركێ جارنان خونێ شەهید

ئەلبەت دەردەك تە هەیە وەك من بە ئێش و ئەلەمی[٤]

---

(١) پەسنیێ گوندێ باسرەتێ ددە ل دەڤەرا بۆتا بنگەهێ تەریقەتا نەقشەبەندی جهێ شێخ صالحێ سپكی بوو شێخ خالدێ جزیری و شێخ خالدێ زێباری و كوڕێ وی شێخ حسین و كوڕێ و شێخ ئیبراهیم حەقی و هندەك دیژی ژیۆ هاریكرنا شۆڕەشا شێخ سەعید كومبوونی لوركرن عەشیرین بوتا. دبێژە یەك ژ گولزارێن وەلاتێ باسرەتێ وەكە فلیمەكێیە. ما بەهشتا ئادەمە وەكە باغێ میرێ بۆتایە كو دگۆتن: ئیرەم زەری میر ل بن برچا بەلەك بوو.

(٢) ئەڤ گول و چیچەك یێن هندە ڕند و بێهێن یێن باغێ تە ژ گولستانا بهارا تەنە تە گورانگەهـ هەیە جهێ كوومبونا زەلامایە. تێدا جڤاتێ دگرن تو ب جۆبار و چەمی و شەلالە و ئاڤێن د هەركن تێدە هەنە.

(٣) ئاڤا تە ژ ڕوهنكێ چاڤان تێتە خار دیارە د خەما نازدارەكی داری. یا د چیایێ گاباری دە جهـ و وار نەمایە تو ب كول و دەردی و ب خەمی.

(٤) ماتو ڕوو سورێ قەسركا گەلیێ جار نا سوهرە وەكە خوونا شەهیدایە ئاڤا وێ بهارا سور دبە وەكە خوونێ تێت: وارەكێ مێژووییە. بەرماییێن مێژوو تێدا هەنە پەیكەرێ

وەك دوزەك تـە هـەبيـتن ژ عالـەمێـرا عـەرزكـە حـال

يـان وەكـى مـن شـلولالی بـێ زمـان و قـەلـەمـی[١]

---

قەیسـەرێ روم لـور هەیـە. دەمـێ هـاتی زیارەتـا چیـایێ جودیێ مـرادا. نـاڤ بـەینا قەسـركێ و دجلـە دە چـەمێ زەیتـون هەیـە شـەڕێ بـەدرخان بەگـە و لەشـكەرێ دەولـەتا عثمـانی یـان هەلبەت تە ژی دەردەك هەیە وەكە من تو ژی ب ئێش و ژان و ئەلەمی.

(١) مرۆڤ دبێژە وەكە تە دوزەك هەیە ژ گەلێ دنێرە بێژە عەرز بكە حالێ خوە و سـەرهاتیا خوە بۆ وان بێژە. ژبەر كو (١٩٢٦) دە مالا شێخ ئیبراهیم حەقی كوچبەر بوون چوونە بـن خەتێ و عراقێ ژبـەر دەولـەتا تـرك و یـان تـو ژی وەكـە مـن شـل ولالـی بـێ زمـان و قەلـەمی، كەس گوهـ نا ددەتە.

# ژ دنێ بایێ هەلاتی

ژ دنـێ بـایێ هـەلاتـێ مـن دڤـێ ئـەو بۆمـە بـەس
ژ وێ گهان ئاڤا حـەیاتێ سـەدخوەزی هـلام نەفـەس [1]
خوونـا مـن ژ ئاخـا هلاتـێ ل بریـنـدارا جڤـاتێ
مـن دا نـە ئـەجزانا خـەباتی ئـەو ژ تریـاقێ مـە بـەس [2]
چاڤ مە بۆ سیپا نوو خەلاتن ل وی تەلەسکوبی هلاتن
ل ئـارارات مـە جڤـاتن ژی نەسـیم هلـدم مـە بـەس [3]

---

[1] دبێژە ژ دنیـایێ هـەمیێ بـایێ ڕۆژهـەلاتیێ کوردسـتانە. مـن دڤێت بـۆ مـن ئـەو بەسـە. ژ وێ ئەڤ گەهامە ئاڤا ژیانێ سەد خوەسکا من ژ وێ نەفەسا هلدابا.

[2] خوونا من ژ ئاخا ڕۆژهەلاتێ یە ئەو ئاخ دەرمانە ل برینێن بریندار گەلەك لێ تێت ئـەمێ چ بکن ژ تریاقێ (تریاك). دەرمانە ژبۆ برینارا گەلەك باشە.

[3] چاڤێ مە وەکە چیایێ سیپانێ خەلاتییێە ئەو تلسکوبە بۆ ڕۆژهـەلاتێ هندی بلندە هـەر دەر ژ وێڤەك دخوەیێ. چاڤ دێرە ژبۆ وەلاتی. ل چیایێ ئاگری مـە جڤات هەنە کو جهێ شۆڕەشا خۆیبوون بوو دبن ڕێبەرییا ئیحسان نۆری پاشا دە ٢٨-٢٩ تا ٣٠- ١٩ دبێژە ئـەز ژۆر هەوایێ هلدم بەسە بووم.

## دارا دەولەتێ دپرسی هەشت چەقن

ل دارا دەولەتێ دپرسی هەشت چەقن هەر شین و تەر
یەك ژ وان هشك بن نەبن دەولەت دبت زێڕ و زەبەر[١]

دوو ژ وان حەقێ خودێنە یێن دی حەقێ ئادەمی
ب ڕەحم و شەفەقەت بن ژ هەڤرا د عبادەت دا هەمی[٢]

خوونا هەڤدوو هوون نە ڕێژن مال نە تالان و نەهیب
(ثم اقررتم وأنتم تشهدون) ئەڤ عەجیب[٣]

هەشت ئەڤن سۆزن ژ خودایی ژ دەولەتێ را کرنە شەرت
ژ ڤێ یە دەولەت نگونن زودچن ژ وان دمینە عەرد[٤]

ئاگرێ ظولمێ کەتە خیمێ دەولەت قەلین
یان ظولم دێ بیتە ڕایێ یان بێهتر قەتل و خوین[١]

---

(١) هەکە تو پرسا دارا دەولەتێ بکی دەولەتێ بکی هەشت چقێ وێ هەنە هەر شین و تەرن. یەك ژ وا هشك ببە و نەبن دەولەت ژ بنی وێران و ژناڤ دچە ئەو دار هشك دبە.

(٢) د دوو ڕۆژا چقا مافێ خودا تەعالانە ئەوێن دی مافێ مرۆڤانە یێن کوڕێ ئادەمن ژ هەڤ دووره دلوڤان حەژ هەڤ بکن ژ هەڤڕابن نەخاین و خوەهربن. دخودا پەرەستێ دە هوون هەمی وەکە هەڤن ژیۆ وێ هوون هاتنە ئافەراندن: ((وما خلقت الجن والانس الا لیعبدون)) سورەتێ (الذاریات) ئایەتا (٥٦).

(٣) خوونا هەڤدوو نەڕێژن و مالێ هەڤ تالان نەکن ئەڤێن هەر کەسێ بکە نکارە ببە یەك هوون ڤێ دکن پاشی هوون باوەریێ تینن و شەهدە ددن ئەڤە عەجێبە هەڤ ناگرە.

(٤) ئەو هەشتێن دەولەتێ چێ دبە سۆزن ژ خودارە ژ دەولەتێرا کرنە شەرت ژبەر ڤێ یە دەولەت سەرنگون دبن و ژناڤ دچن عەرد شوون واڤە دمینە.

وەر بنێـــڕە ل (البقـــرە) دا عـــەهـــد و میثـــاق دەعـــودۆز
ژ بنـی ئیسـڕائیل خودایی ستاند قەرار و عەهد و سۆز[٢]

ئـــەرســـطو گـــوت قوبـــەیـــا مـــن لبیچمـــا دەولـــەتـــێ
هەشت قەدەم هەشت مادە سەر بن وەکی یا دەولـەتێ[٣]

قـوطبێ ڤـان شـەرتـان عـەدالـەت ڕەعییـە ب وێ د ئێـوری
ئاشـێ بـێ بنـدەق نـەگـەریا دێـر دەغـان بـۆ شـەمـری[٤]

جهـ تـە ژی ئاسـارو (دارا) ب سـالێ ملیـون چـوو هـەزار
پـور وەکـی قـاڕۆن و مـارون وەك (قوصـێرێ خـوری)[٥]

یەك ژ عەلامێن زمانی سەید عەلی یەك ژێ شـکاکی
یـەك ژیـێن صـاحب مـە ئاسـر عـەبـدولڕەحمـان شـاوری[٦]

---

(١) ئاگرێ ستەمکارییێ دەمێ کەتە دبن بنگەهێ دەولەتێدە دقەلن ژناڤ دچن. یان ستەم یێ وەرە ڕاکرن و تەسلیم ببە یان وێ پتر وێ ببە کوشتن وخوون ڕژاندن.

(٢) وەرە تەماشە بکە ل سورەتی (البقرە) چەند سور و عەهد و گرێدان و دەعوە دۆز تێدە هەنە خودا ژ کوڕێن ئیسرائل وەرگرتنە ژوان. دەولەتی ئەوە لێ ڕحەتە و سەهلە.

(٣) ئەرستو یان ارسطالیس شاگرتێ ئەفلاتونی یە وێ سوقراتە ژ حوکەماییێن یونانیانە دبێژە گومبەتا من وەکە دەولەتێ هاتیە چێکرن ل سەر هەشت لنگاهاتیە دانین هەشت بەندە هەشت مادەنە سەرونێ وێ وەکی یا دەولەتێ یە.

(٤) قوتبێ (قوطبێ) ڤان شەرتا عەدالەتە ڕەعییەتێ مللەت ب وێ د ئێورە. دسەکنە ئاشی هەکە بندەقاوی شول نەکر وێ ژناڤ هەرە دێر دەغان دبە د شەڕە کار ناکە.

(٥) جهـ و وەلات تەژی کەڤنە وارن وەکە باژار دیرۆکی (دارا مێردینێ) ب هەزار سالان ب ملیونانە سالێن وا گەلەك کەڤنن گەلەکن وەکە قاڕۆن و ماڕۆن. وەکە قەصێری خوری ئەڤ گۆتنە ژبەر لەڤ هاتنا شعرێ و دیرۆکا وا. نەخوە چوگرێدانا وي نینە ب وەلات ڤە.

(٦) ناڤێ دوو سێ کا ژ زانایێن وەلاتیتینە وەکە نموونە سەید عەلی سوید سلیمانێ فندکی کو دیوانا وی یا شعرا هەیە سەیدا ملا موحەمەد زڤنگی شکاکی زانایێ مەزن پیرێ

مــە وەلات ئاڤــا هنــارێ ژ چــاك و پاكــانێ گــوزین
لێ بـەلێ بـەرخێ جـوانن بـەر دەرێ كوزكـا گـوری[١]

دار ژ كورمێ تخت ژ ظولمێ خەلـەف و شوورێ صـەدف
مینا موسو كوڤەخی كەركر ل مە شاهینێ كەری[٢]

ئەزدیشیرە كورمێ دیرە خاپاندن ب فرو زی و فیتـەكـی
گوهــ بــدە پیــرەكــی نــەرە دیوانــا میــرەكــی[٣]

---

بۆتـا و شـێخ عەبـدولڕەحمان ژ گونـدێ شـاورا دەڤـەرابوونا.و گەلـەكی دي ژی ژ زانایـان هەنە.

(١) دبێژە وەلاتێ مە كوردستان وەكـە ناڤا هنارێ یە ژ مروڤێن چاك و پاكا ئەوێن چوونە گەلەك زۆرن. یێ وەكە بەرخێ جوانن ل بەر دەرێ كوزگا گوری نە یارا ژناڤ برنە و پرتوكێن وا سوتاندنە بێ سەروشوون كرنە.

(٢)نـەمانا دارێ ژ كـورمێ دارییـە. گۆتن دارێ چما بڤر نـەیارێ تەیـە. تـە دبـرە و تنـە دكـە، گۆت: دەستكێ وی ژ منە ژبەر وییە. دبێژن كورمێ دارێ نە ژ دارێ بت زەوالا دارێ نینـە. تـەختێ مـەزن ژی ل سـەرن ژ ستـەمكارێ چێبوویـە. خەلـەف یـێ نـاڤ بانـگ مێرخاسـێ میرێ بۆتان بەدرخان بەگێ یە. دەمێ شۆڕەشا بـەدرخان زناڤچوو (١٨٤٨) ئـەز دینشێر هاتـە دەڤەرا بۆتـا گۆت: خەلـەف وەرە بمـن بێـژە گۆت ئـەز خەلـەفم خودانێ شوورێ سـەردەفم مەسەلە درێژە : مێرخاسێ دەڤەرا بۆتـا بوو وەكـە موسـو كووڤەخییەنـە تـرس بۆ گەلـەك پـێ هاتیـە گۆتن نـاڤ بانـگ بـۆ موسـو ژ عەشیرەتا مەمایە ئـەڤ عەشیرەت دەكەڤـە رو ئاڤایێ جزیـرا بۆتـان گوندی كووڤەخ نێزیك هەزەخە ل سـەر رێكـا گشتیی یـە وەكـە شاهین عەقلمەنـدێ میـرێ بۆتـا بـۆ دبێـژن شاهێن كـەڕی كـەڕا و مووسـا دوو بـەرە بـان ژ عەشـیرا دێرشـەوە ژ گونـدێ شـەڕەفی یێـە. ئـەز خەلـەفم خەلـەفم هـاوارە میـر هـاوارەمیر خوەیێ شوورێ سەدەفم ئەز دینشێر بەگێ بوتایە.

(٣) ئەزدین شێر كورێ سێڤدین بەگ بۆ پسمامێ بەدرخان بوون. چوون بوون هـەڤالێ دەولـەتا عثمانیا و بێبەختی ب شۆڕەشا بەدرخان ڕەكرن . بۆ جەحش. ب یەك فیتاوا هاتە خاپاندن گۆتبوونێ ئەمێ تە بكن میرێ بۆتا دەما شۆڕەشا بـەدرخان ژ ناڤچو (١٤٨٤) میرتیـی نـەدا

دبتن سەئو گورگ ببن یەك نەخوە زی بحالێ فلیت
دەردێ بێ دەرمانە مینا عەلقەمی ددست دا کلیت[1]

---

نەوی کرن مەزنێ تەولخانێ. ژبەر وێ یەکێ دگۆتنێ ئەزدینشێرە کۆمێ دێ ڕە کورمێ دارێیە.

[1]دڤێت مرۆڤ و گوهداربت بێ پیرەکی نەچێ دیوانا میرەکی دار مرۆڤ مشهەت نەبت ژبەر دبە سەیێ شڤانی و گورگ ببن هەڤالێ هەڤ هنگی نەخۆزی ب حالێ فلیتێ قوتو. فلیت کوری قوتو سترانا وی هەیە مامێ عەمێ عەتمانکی ئەو کوشت ل بشێ ڕێێ ل ناڤ غەرزا ژبو وەزنێ گۆتییە. دەرد هەنە بێ دەرمانن وەکە دەردێ مە کوردا بێ دەرمانە وەکە عەلقەمی د دەست دە کلیت، ئەڤە ژی وەزنا شعرێ گۆتییە.

## ژ حقیقت

ژ حقیقــت و حـــەقـــی دەفتـــەر گـــەهشـــت
ز ڕەیحـــان و ڕەوحـــێ مـــە دەفتـــەر بـــۆ هشـــت[1]
ژ ئـــاش و ژ بـــاژار مـــە تـــم دانـــە هـــەڤ
مـــە دفتـــەرە رادار ژ بـــرارا مـــە هشـــت[2]
تـــو جـــودیێ مـــرادا وەکـــێلا مـــەمـــێ
چیـارە شـکێ گـەودا فـەرەشـین ل تـەنشـت[3]
مـــا ب ســـیپان خـــەلات بگولوچیچـــەکـــی
ب سلیڤی و خەجا شەنگ ب تلسم و نڤشت[1]

---

[1] دبێژە ژ ڕاستیێ و حەقیێ ناما مە دەفتەرا مە تەمام بوو ژ ڕحانا و بێهنا خوەش مە دەفتەرا نامـە بـۆ تـە هشـت. ئـەڤ شـعرا هـەبوو كـوڕێ خـوە عەبـدولڕەقیب ڕا شـاندیە د مێـژووا (١٩٨٠/١/١٧) دە نڤیسیە. بەرسڤا دوو نامێن عەبدولڕەقیب مە دەفتەر بەهەشتە.

[2] مە ژ ئاش و باژار دایە هەڤ، دەما زێدە وەرە ئاخاڤتن دبێژن: مـە ژ ئـاش و بـاژار دایـە هـەڤ دەفتەر وەكە ڕادارێیە تشت تێدە دیار دبن مە هێلا ژ برارە.

[3] ژ هندەك دەڤرێن كفش داخڤە پەسنێ وا ددە و ڤیانا وەلاتی تێتـە زمـان. و پەسـنێ دەفتـەرا خودیێ خوە ژێ ددە. دبن ڤا ناڤادە. دبێژە بۆ چیایێ جودیێ مـرادا. ل دەڤـەرا بۆتـان دبێـژن خـودیێ مـرادا و كـێلا مـەمێ ڕا سـەری قەلابایـە مـەمێ شـڤان یـەك ژ چـاكێن هـەوێریا ئێزیدیایە یان هند بزێداهي و بەرەكەتی وەكە چیا ڕەشـكێ گەودایی گـەودا باڤكـەك ژ ئەرتووشـیانە. سـێ ڕووبـارێ ئـاڤێ ژێ دەركـەڤن بـەر ب باشـووری كوردسـتانێ تـێن. یـەك ڕووبارێ هیزل و یەك خابوور و یەك ڕووشینە زیێ بەهدینا وەكـە بـەرێ بـەنی ئسـرئیلیایە كو مووسا دارێ خوە لێ ددا دازدەهـ كانی ژێ دزان د هەركن وەكە هەژمارا بـاڤكێن وا. فەڕەشین ئەو زۆزانیێ ناڤ بانگ دكەڤە ڕەخ تەنشنا وی چیایی.

ئـــاراراتێ منـــواس باشـــروتێ مـــه هنـــد
هەکاری و  وەرزێ میری ژ هەرفیکی مشت[٢]
خانـــا پـــووتکێ ئـــاغروڤ ئارنوســـێ ژور
مـــا بـــەرادێ زاڤـــا و تـــو بـــایێ بەهشـــت[٣]
مـــه ســـپاری خـــوداکر بـــه پـــارێزه ئـــەڤـــێ
ب رەواج بـــت د عـــامێ ژ گـــەلی را مەهشـــت[٤]

---

[١]دبێژه ماتو سیپانێ خەلاتێ یی وارگەها سیا ئەحمەدێ سلڤی و خەجا شەنگی ب گول و چیچەکی و ب نقشت و تلسمی کۆمرا دا وا نەبوو ز سیا ئەحمەد و خەجێ نەگەهان مرادا خوه، گەلێ کورد ژی نەگەهانه مرادا خوه.

[٢]یان تو چیایێ ئاراراتی. چیایێ ئاگری. گۆتیه ئاراراتێ منواسی، منواس مەلکێ دەولەتا ئورارتۆ بی ل وانێ. ناڤێ باش ڕوتێ مەهندا ئانییەه کو دکەڤه نۆڕدزێ زیارەتگاها عودەی کوڕێ مووسافره. پیرۆزه ل با ئێێزدیا. ئەز چوومه سەرێ وی جهەکی گەلەك دلڤەکەره و ناڤێ هەکاریا ئانییه و ڕەزی میرێ جزیرێ پێڤه گریدایه ژبەر کو نۆڕالله بەگ ژ ور بۆ قائدەك بۆ د شۆڕەشا بەدرخان بەگ ده دبێژه ژ هەر ڕەنگێ فیکی دناڤ ده هەیه، ئەڤ هەمی ل سەر نڤیسانێ خوه گۆتییه.

[٣] د وەلات ده گەلەك خان هەنه ل سەر ڕێکێن گشتی کاروانێ لێ دئێورن هندەك ژی شکەفت بوون وەکه خانا ڕەش نێزیکی سێرتێ ل بەر ئاڤا دجله و خانا بهر ئاڤێ و گەلەکێن دیژی هندەك عەقدبوون وەخانا کاوا و خانا سۆر. بەحسا چیایێ ئاغیروڤ دکه ڕا سەری گولا وانێیه زۆزانه گەلەك بەرف گیره. چیایێ ئارنوسی ڕاسەری مکسیێ، ئەول زۆرن، سەرهەدن. ما وەکه دارکا زاڤایه کو ژ دارا ئێرڤستێ تانین ل سەر بانی مالا زاڤێدا د چکاندن هەر کەسێ ب هاتنا تشتەك پێڤه داد دلقاندن ژ ڤێ کر و کەلو پەلێن خارنێ یان تو وەکه دارا تۆبا یا ابەهشتیێ بێ.

[٤] مه ئەڤا هه سپاری خوداکریه ئەڤێ بپارێزه و ب ڕەواج بکه دناڤا علمێ ده من ئەڤا هه ژ گەلی را هشتیه و ژبەر کو زمانێ کوردییه.

ژ یوســـف مرارینـــه ئـــەڤ دەنگـــو بـــاس

بــۆ دوونــدەهێ ئاڤێهنــه پــاش بــول پشــت[١]

چــەكــەك پــوڕ ب دەواقــه وەرە بجــەربــین

ژ جــەرا مــه چێكــر ل نــەیار قشــته قشــت[٢]

دترســـم دیـــوار ســـەحكـــه ب پــەیڤـــم

نـــەكارم بـــدم دەر ددلـــدا مـــه هشـــت[٣]

---

[١] ئەڤا ژ یووسف وەكە مراربیانە ئەڤ ئاخاڤتن ژبۆ دوندەهێ مە ئاڤێنە پاش پول و پشت.

[٢] چەكـەك پـڕ ب دەواقـە. تەجروبەیـە. وەرە بجەربینـە ژ وەلاتیڕامـە چێكـر ل نـەیارە قشـتە قشتە و نە خوەشیێ بە.

[٣] نە وێرایە ڕاست و ڕاست ناڤێ كوردستان ناڤێ گەلی ل وڕ بینە. دبیژە دترسم دیوار ب گوهـ بـن سـەحبكن هەكـە ئـەز بپـەیڤم ئـەز نكـارم بـدم دەر مـه ددلـێ خوە دە هشـتیه. گەلەك زانا و شاعرێن كوردا نەوێرانە ژ ستەمكارییا نەیارا دا ددلێ خوەدە بێژن ب وی دەردیڤە مرنە و چوونە، مەلا یووسف ژی یەك ژ وا بوو..

## داستانا مەعریفەت

## مەعانی و مەعارف

مەعانی و مەعارف ل بەر یێ نەزان
دەما ئەو ڤەبن لەذەتا ڕوح و جان[(١)]

سەرەنجامێ لەذەتا مەعریفە
نە چێبە ب خودێ تە ئەوە موبەتەدا[(٢)]

چ دەرسەك عەظیمە ژبۆ پیببا
(اذ قال لها وللارض أئتیا)[(٣)]

دیمەك ڤان حەیاتەكێ حالی هەبە
خیطابەت د مابەینا واندا هەبە[(٤)]

ژ ئیبن عەرەبی موحەیەددین عالەم ناڤ عالەمە
یانی ئەو ب خالق خۆ عالمە[(٥)]

(وان من شيء الا) د قورئان دا
هەر شەی تەسبیحی وان هەنە بۆ خودا[(١)]

---

(١) واتە و ناسینی لبایێ نەزان دەچێ ئەو ئەشکە ڕەببن خوەشیا گیان و جانێ پەیدا دە.

(٢) سەریدا ناسکرن خوەشیە، هەکە ب خودانە چێبە کو ئەوە بەراهیکا هەمی تشتا لەزەت نابە.

(٣) چ دەرسەك مەزنە ژبۆ وا یێ پێ دبە، چاخێ گۆتە ئەردێ وەرە و ئەسمانا ژی وەرەن گۆتە ئەسمانا و ئەردی وەرن بۆ گوهداریێ هاتن ب حەمد و کەنیا خوە

(٤) ئەڤا ژی وەکە مە ژیانەك د حالێ خوە دە هەنە ب هەڤرە د چڤن ژ هەڤ فەهم دکن.

(٥) یبن عەرەب زانایەك مەزنێ عرفانیە، دبێژە: عالەم ناڤێ وی عالەمە، بەلکی ئەو ژ خالقێ خوە ڕە زانایە و وی داناسێ، ژبەر وێ گۆتنە وێ عالەم، عیلم زانین و زانست.

(ففـــــي كـــــل شـــــيء لـــــه أيـــــه)
(تـــــدل علـــــى أنـــــه واحـــــد)[٢]

چیـــا بـــێ وجـــوودێ تـــوڕا وەحـــدەتـــێ
ب ئیمـــانێ تێـــتن ل ســـەر فطـــڕەتـــێ[٣]

وەلـــێکن ژ ڤانـــان بـــەنـــی ئـــادەمـــە
ژ فطـــڕەتـــێ دەرکـــەت ل خـــۆ ظاڵمـــە[٤]

ئـــەمانـــەت هلانـــی ژ دەســـتێ خـــودا
گـــەلـــەك بـــێ پـــەلیـــژان کـــەت بـــن باریـــدا[٥]

ژ تـــەلبیـــا ئبلـــیس نـــەیـــارێ کـــەڤـــن
د دەســـتکیدا دونیـــا ب یـــێ دی قســـمێ ژن[١]

---

[١] خودا فەرمان کریە دبێژە: هەر هەینەك هەر تشت تەك ب ڕەنگەکی تەسبیح بۆ خودا ددە هەر یەك ب زمانێ حالێ خوە هەر یەك ژ وا وەکە مەعالەمە کن.

[٢] د هـەر تشتەکیدا ئایەتـەك ژێـڕا هەیـە دبێـژە: خـودا یەکـە، چـاوا هوسـتایەك دەسـت چێکەرێ وی ژێ هەر کەسی جودایە مرۆڤ دزانە کو ئەو فلانە کەسی چێکریە، یێن خودا ژی وەسایە، هەر تشتەك دبێژێ: خودا ئەز چێکرمە.

[٣] چ تشتا بێتە هەینێ تور ڕا یـەکیتیا خودا ل سەرە ب باوەری خـودا ددە، یانی دەما خـودا بچـووك ددە چ یـێ مسـلمانا بـن چ یـێ خـودان پـەرتووکـا بـت چ یـێ کـافرا بـت چ یـێ باوەرمەندان بت پاشی دێو و باڤێ وا، وا دکن جهویان فەلە یان بێ ئاینی وەکە قاسدێ خودا گۆتی.

[٤] لێ بەلێ ژ ڤانا کورێن ئادمی ژ وێیا کو ل سەر خودێ دایی دەردکەڤە، ستەمێ ل خوە دکە.

[٥] ئەمانەت کو باوەریە و مسلمانیە ژ دەستێ خودا وەرگرت کو خودا دبێژە: [انا عرضنا الأمانة على السماوات والأرض] (الاحزاب: ٧٢) خودا دبێژە: مە ئەمانەت بۆ عەرد و عەزمانا و چیا عەرزکر گۆتن یاڕەبی ئەم پێك نائینن بەنی ئادەمی گۆت: ئەزێ پێك بینم [انه كان ظلوما جهولا] (الاحزاب: ٧٢) شاعێر ژی دبێژە: گەلە دبن ڤی باریدە پەلیزان بوو.

هەيە ژ ڤان خلاص بن بەلى قسمێ ژن
يێ كت تورِا وان وى خلاصى نەهن[٢]

ئەڤانان حيجاب و سەدێن دونيەوى
د مابەينا مە و مەقصەدێن ئوخرەوى[٣]

ژ موختاريەتى د دەست مە جوزئەك هەيە
تو موختارێ موطلەق مە چاڤ هەر ل تەيە[٤]

كەشف كە ل بەر مە حەقيقەتێ حال
مە ئيمان ب غەيبا تەيە (ذي الجلال)[٥]

مە هش نە ل بوهشتى نە لە ذاتێ تێ
مە داخاز ژ تە نەبرِى نسبەتێ[٦]

مە سەر نە بە كوفرى نە زولف عاقيبەت
مە پورِ ل پێ خۆ بەردا هەواكێ غەلەت[١]

---

(١) شەيتان رِێك ل وا ونداكر ژبەر كو نەيارێ كەڤنە يێ باڤێ وايە. كورد دبێژن: (نەيارێ باڤێ نابە دوستێ كورێ) (رِەهـ دبە بوست نەيار نابە دوست) ددەستەكيدا دونيا هەبت و ديێ ديدە قسمێ ژنا ئەڤ هەر دوو ژى نەيارێن خورتن كو مرۆڤا ژ ئاخرەتى دوور بكن.

(٢) هەيە دكارە ژڤا كو شەيتانە و دونيايە خلاس ببێ، لێ خلاس بوونا ژ ژنێ گەلەك زۆرە مرۆڤێ كەتە د نتورا و شەبەكا وان دەژێ ڤەرا سانا وى گەلەك چەتنە بەلكى نينە.

(٣) ئەڤێن پەردە و بەندن و يێن دونيايێنە دناڤبەرا مە و دونيا ديدە نە كو ڤيانا مە بجە نەيێت كو شەيتانە و دونيايە و ژنن و نەفسە.

(٤) هندەك ڤيان يان شيان مە هەيە كو دبێژن: (جزئى إختيارى) لێ هەر تو وى بێ هەر ب كەيفا خوە چاڤێت مە هەر ل كەرەما تەيە.

(٥) ژبۆ مە بەيان بكە كارِاستيا حال چيە، مە باوەرى دى تناتە هەيە يازەلجەلال يا ئەوێ خودان عەزمەتە.

(٦) هزرا مە و هشێ مە نە ل وێيە تو مە ببى بەحەشتێ، داخوازا مە ئەوە كو تو خوە ژ مە دوور نەكى نسبەتا مە بال تە ڤەبت كو ئەم كولەيێن نەبن و مسلمان بن.

سورەیێ (قل هو الله) د مەعریفەتا
(آلهتی) فەزلەکە ئەی فەتا[٢]

مە قەیدکە د سجلا ئیمان نامەیێ
ب عەفوێ و یا ب مەهدەر و تەوبەیێ[٣]

ژ مەخلوقێ کەونێ بەنی و بەندەکم
ل بەر عەفو و ڕەحمەتێ ئەز ذەڕەکم[٤]

هەشتی سالْ پوشت عود و پیری و حەزین
بە کەشکول مە هیڤی تو نازڤڕین[٥]

مە کورتی کەلام شەهدە یێ ب تە نەدا
ژ وان ئەم بەرینە ببن باب و دا[٦]

صەلات و سەلام سەر نەبی وەك تە ڤین
و ئال و صەحابین ل وی د جڤین[١]

---

(١) تو مە نەبێ کوفرێ و داویا عەمرێ نە لەزەت بن و ژ ئاخرەتی دوور کەڤن، ئەم گەلەك دووڤ هەوا ئا نەفسێ یا خەلەت کەتن، مە خوە لپەی بەردا.

(٢) سوڕەتێ [قل هو الله احد] (الاخلاص: ١) ژبۆ ناسکرنا خودا کەرەم و فەزلەك زێدەیە.

(٣) مە بنڤیسە د سجل و دەفتەرا ئیمانێ دە، دەفتەرناما ئیمانێ بالێ بوورینێ یان ب مەهدەرێ و ب تەبی. جار هەیە خودا کولەیێ خوە عەفو دکە بێ بەرابەر جار هەیە هندەك ژێڕا مەهدەرێ دکن خودا عەفو دکە، جار نا ب توبە کرنێ ژوڤانان و عەفو دبە.

(٤) ژ مەخلوقی ئەز کولەك یێ تەمە، ل بەر عەفوا و ڕەحما تە وەکە زەرەکیمە عەفوا تە گەلەك، لبە وێ ئەز چونەمە.

(٥) ئەز هەشتێ سالْی بوومە پشتا من بوویە قوف وەکو عودێ لێهاتیە ئەز پیر بوومە و د حەزنێدا مە، کەشکولا من ل بەر سنگا منە ئەز هاتمە دەرگاهێ تە من هیڤیە تو من ڤالا نەزڤڕینی، کەشکول بەرێ هەبوون ژ داری دهاتن چێکرن دەروێشا زاد تێدا کۆم دکرن.

(٦) ب کورتی یێ ئەشهەدێ ب تە نەئینێ ئەز ژ وا بەریمە، باب بن یان دێ بن.

(عرفنـــــا الـــــذي علــــم بـــــالقلم)

(بـــنقض العـــزائم و خســـف الهمـــم) (٢)

ژ (أســـماء حســـنى) دەرینـــە كـــەمـــا

لا مـــەعریفـــەتـــا تـــە (بـــرب الســـما) (٣)

چ نـــەقـــص و كـــەمـــالێن د كـــەونـــی هـــەنـــە

بـــۆ وان ئـــەڤ نیشـــانگاه و هینگامـــەنـــە (٤)

بوونـــا موجرمـــان عـــەفـــو غـــەفـــوور

بوونـــا ظاڵمـــان مونتـــەقـــیم گـــەهـــ صـــەبـــوور (٥)

ژ ذەلیـــل ڕا مـــوعیزە ژ عـــەزیـــز ڕا موذیـــل

لـــەطیفـــە ژبـــۆ گـــەلكـــان ژ هـــەر دەر و كـــول (٦)

ب حوســـنا یـــێ خـــۆ عالـــەمـــا خـــوەیـــی دكـــی

ب حـــەیاتـــەكـــێ حـــالی ئـــەوان حـــەی دكـــی (٧)

---

(١) صەلات و سلاڤ ل سەر قاسدێ تە بن، وەكە تە بڤێت و ل هەڤالێن وی ژی بن ئەوێن لێ جڤیاین و كۆم بووین.

(٢) مە ئەو خودا ناسكریە ئەوێ كو مرۆڤ فێری نڤیساندنێ ب قەلەم كر، ئەو خوە د شكێنن و هەمی خوە ژناڤ دبن.

(٣) ژنو تو نەهـ ناڤا خودا دەرینە ناسینا تە ب خودایێ ئەسمانا، دەمێ تو ل ناڤێ خودا بنێڕی تو دێ خودا ناس بكی. وەكی ڕەحیم، ڕەحمان، عەزیز، جەبار، غەفوور، عەفو، ستار و خالق یێن دی.

(٤) چ تشت هەنە د هەینێدا چ كێم بن چ تەمام بن ب وا ئەڤ نیشان خۆیا دكە و مەزنە.

(٥) ژبۆ گونەهكارا خودێ لێبوورە و د غەفرینە، ژبۆ ستەمكارا تولڤەكەرە و بێهن فرەهە.

(٦) ژبۆ كەتیا هاریكارە ژبۆ دەستهەلاتا وا تونە دكە زەلیل دكە، ژ گەلكا ڕە چاكە، ژ هەمی دەردا وا ڕەها دكە، دەرمانە ژبۆ وا.

(٧) ب چاكیا خوە عالەمێ خوەیی دكە، ب ژیانەك گوری حالێ وان ژیانێ ددەوان یانی چ تشت لبا خودا نەمریە لبا مە بێ حس و دەنگێن.

## سڕەك خەفی

ب سڕەك خەفی ژ مە تە عالەم ژ فەنائێ
ئانی حوضوورێ ل مە حەمد و ثەنائێ[١]
باوەر ب تە خودایێ بێ مێژوو زەمانی
نە ب کو ڤەلکو تو یێ جهـ و عەیانی[٢]
(قل هو) تلسکۆپ ئیمان و فیلمە
وەك مەخلوقی نینە ناسکە ب خودانی[٣]
عالەم د تەحەیورەك من بهیستن تەڤ
دەست خەط تە بەدیعە ژی عالەما بانی[٤]
دونیا بۆ مە دەیدك چنجیر ل هەویێ
ل سەر ب سەیر و صەفایێ ڕزق ژی ژێ دەرانی[١]

---

(١) ب سڕەك ڤەشارتی ژ مە تە عالەم ژ نەبوونێ نە ئانیە هەینیێ ل سەر مە هەیە ئەم حەمد و سەنایا خودا دکن.

(٢) باوەری مە بتە هەیە تو خودایی مێژوو و دەم نینە بووتە ب کووڤەیی ل کودێ یی تە جهوار نینە تو ئاشکەرایی، تو ل هەمی دەرایی، عەیانە.

(٣) سورەتێ [قل هو الله احد] (الاخلاص: ١) تلسکوبا (ئامیرەکە سترکێن دووریێ تێنە دیتن) باوەرێیە وەکە فلمە تو تێرا دیاری، تو نە وەکە وایی ئەوێن هاتین چێکرن تو خودایی، هەر تشت تە ئافراندیە، ئەم وەساتە د ناسن.

(٤) عالەم هەمی ژ تە مایە گوهشی وەکە من، دەست خەتێ تە غەریبە ژ عالەما بانی هاتیە عالەما ژێر هەیە کو جهێ مرۆڤ و شەیتان و جنا و ئاژەلایە، عالەما بانی هەیە جهێ مەلەك و پەریایە.

وەك فرعەون و هامانی ئەحمەق مە نەدیتن تە کەسی
هاتن تەخودا یی ب یەك تیر و کەڤانی[٢]

نینن تە نە ناسی مادلای نکایی
ل نژیارا تە فەکری ئیمان ب تە ئانی[٣]

ئینسان چ پورِ و غرام ژ دستگاهێ خودایی
هەیکەل کو گێراید سەر سێزدەها دانی[٤]

ژ تەرکیبێ خەبەردن ژ تەشریحێ مە ئەڤ عیلم
ئیعجازە ژ قودرەت بۆ دەفك بۆ خودانی[٥]

قەنج فکرە ل یووسف تەڤ هەندە سو دەرسە
طۆبا کی سەر و ژێرە ڕادارە ل سەری دانی[١]

---

(١) دونیایە بۆ مە وەك دەیدکێیە، دەیدك بو چووکا تێدە د هەژێنن. دونیا ژی ل سەر هەوایە چاوا چنجیرك ب هەوا ڤەیە، ئەو ژی وەسایە مرۆڤ ل سەر وێ کەیف و سەفایێ دکن. ئابووریا خوە ژێ دەرتینن و پێ دژین.

(٢) وەك فیرعون و هامان مرۆڤێت نەزان نەبوون مە دیتنە فیرعون گۆتە هامان ژ من ڕە جهەك بلند چێکە دا ئەز شەڕێ خودایێ مووسا ل سەر بکەم ئەو ژی چێکر فیرعون چوو سەر تیر ئاڤێتن ئەسمانا.

(٣) کەس نینە تە ناس نەکە، ئەڤا هە نایێن مادلاکرن (ئینکارکرن) هەکە مرۆڤ ل کریار و نژیارا تە بنێرێ و پێ باوەریێ ب تە بینە.

(٤) چێکرنا مرۆڤی پڕوغرامەکە ژ کارێ خودا، هەیکەلێ مرۆڤا چاخێ دانی و چێکێ ل سەر سێزدە گریکا دانی. هەر دوو گوزەك، هەر دوو چووك. هەر دوو سێ ڤۆك. هەر دوو گوزەکێ دەستا هەر دوو ئەنشك، هەر دوو مل، هەروەسا سەری دانی سەر کەلەخی، ئەڤە بوونە سێزدە.

(٥) ژ لێکدانا مرۆڤی ئەم باخڤن. ژ زانینا تەشریحێ ئەڤ مە ئانیە دەر، ژ ئیعجازا قودرەتا خودایە ئەڤ عیلم یێ کەلەخی ئینسانیە. تشتێت عەجیب و خەریب تێدا هەیە.

بـــــالا وی بالنـــــده د ڤرونـــــه ل ئـــــەرضێ
ڕاســـت وەك مــەتا خۆڕمـــه پەنجـــه مـــو زەهـــانی[2]

جمجـــم ســـانترا لـــەبـــێ ســـلکه بـــەیانـــه
ب حســـه و ئینتیظامـــه ئـــەو فەضـــلەکا بـــانی[3]

پێـنج تلـێن تــه (اللــه) د کـەڤـێ نـۆط نـەهـ نـاڤ
چـاڤ مــوهره تــل ئیمضــا ئیعجــاز زوو بــەیــانی[4]

ژ چــاڤ بــۆ وه بێـــژم د نـــاڤ شـــەش پێچکانـــدا
گوهــ ژی ســێ مـــەقامن بکـــران و ســـدانی[5]

پشـــی پمـــپم و نـــەرمـــك لـــەو حافظـــه بـــۆ دل
دل خـــۆ نـــا تـــەمیز دا شـــوونێ هـــەوا ئـــانی [1]

---

[1] بـاش ل یووسـف بفکـره هـەمی چێکرنـا وی ب ڕەنگـەکی هەندەسـی هاتیـه دانـین و چێکرن، شاعێر دبێژه: لاشێ مروڤی وەکه دارا توباییـیه، ئەڤ دار ل بەحەشتێیه کوکا وێ ل ژۆره چقێن وێ ل ژێرن مرۆڤ وەسایه کوکا وێ کو مەژی یه ل ژۆره چەقێن وی کو دەست و پێنه ل ژێرن، رادار دانیه سەره سەرێ وی.

[2] بەژنا وی بلنده دەڤ و ڕووێ وێ ل ئەردێنه. بەژنا وێ ڕاسته وەکه دارا خواصێ، پەنجێن دەستێ وی وەکه فێقیێ موزێیه، تلیێ مرۆڤی وەسانه.

[3] قافێ سەری وەکه سەنترا لێیه بێ ئایه، ئەڤ کفشه دەنگا د بهیزه مونتەزەمه، ئەو ژ فەزلا خودایه ژ بانی هاتیه دەزگاهێ خودا گەلەك خەرییه.

[4] پێنج تلی خودا ل سەر ناڤێ خوه وەکه تیپێن (الله) کو پێنجن چێکرنه، د ناڤا کەفا دەستیدا، یێ ڕاستێ ڕەقەم (١٨) یێ چەپێ (٨١) هەمی دبه (٩٩) ناڤێ خودا دانیه. چاڤ کریه موهر و تلی ژی ئیمزا و تەوقیع ئەڤ هەمی ئیعجاز و بەیانه.

[5] ژچاڤا بۆ وه باخفم چاڤ دناڤا شەش پیچکا دەیه، شەش پەردەنه، ل سەر و دورا چاڤی گوهـ ژی سێنه گوهێ دیار و گوهێ ناڤین و گوهێ داویێ دەمێ دەنگه دچه ناڤا گوهـ ناڤا گوهـ وەکه گەلانەکی هەیه ل سدانی دکەڤه دەنگ دده مەژی، مەژی ژ هەڤ ڤەد ڤەتینه.

صـــەد و بيســـت و چـــار هـــزار بهـــن ژ وەقتـــێ تـــا ب وەقتـــێ

هـــــەر يـــــەك ژ وان دوو نيعمـــــەت تـــــو چـــــامنێ وانـــــى[٢]

دلا شـــــێ تـــــەدا دازدە قـــــولێر هـــــەنـــــە كفشـــــن

بـــەژنا تـــە ژى هەشـــت بۆســـت ئـــەڤ هنـــدە ســـاجانى[٣]

ڕويـــێ تـــە ژى چارچـــك د قـــەيســـا بنيـــێ پێتـــە

ناڤـــــەك نيڤـــــى بـــــەژنێ ژ نـــــاڤێ وى ژى زانـــــى[٤]

ئـــوور مينـــايێ مـــەرشـــێ بـــە تێكـــر نـــو ڕا چانـــدى

(انثـــى عشـــري) چەنـــد پـــڕ ئـــووركێ بچووكـــانى[٥]

هـــــەفـــــت متـــــرە نـــــە ڕووڤـــــى جهـــــازى دزكـــــدا

ژ قـــــودرەتێ چ عەجيبـــــە هـــــەميێ وى كـــــى زانـــــى[٦]

ل جهـــەكـــێ زادى حالدكـــە هـــن ژى د بێـــتن خـــوون

صـــــەفەرا ســـــەودا بەلغـــــەم هـــــن ميـــــز و خوهـــــدانێ[١]

---

[١] كەزەب، پشاسور وەك پف يفوكيە نەرمە وەكە سنگەرێيە. ژبەر وێ دل دپارێزە و خوونا پاقژە ددە دلى و دەوسا وێدە هەوايێ دمژە، كەزەب خوونێ پاك دكە يا پاقژ ددە دلى يا پيس تێتە پيرا دەچە خالخالكێ.

[٢] سەد و بيست و چار هەزا بێهن نەفەس، ژ وەختى تا وەختى مرۆڤ ددە و د كشينە، ژبەر ڤە مرۆڤ زامنێ وا نيعمەتايە، ئەو هەمى چالينە خودا ددە مرۆڤى.

[٣] د لاشێ مرۆڤيدە دوازدەهـ كون هەنە ئاشكەرانە، بەژنا ئينسانى ژى هەشت بۆستن ب بۆستا مرۆڤى ئەڤ هەندەسا جانێ ئينسانيە.

[٤] ڕووێ مرۆڤ ژى چارچكەهنگە پێ مرۆڤە، ناڤك ژ نيڤێ ئينسانيە ژ خوە ناڤێ وێ لێيە، دبێژن: ناڤك.

[٥] ئور وەكە مەرشێيە د چێكرن ڕاچاندنا خوە دە، دوازدە هوك گەلەك ئوركن، دەمێ بچووك بچووك دبن.

[٦] درێژاهيا ڕووڤيا هەفت مەترەنە، ڕووڤى ئاميرەكە د ناڤا مرۆڤيدا ژ قودرەتا خودايە كو هەمى زانيە، عەجيبە كو هێ ژ مەزناهيا خوە هەمى زانينە و دانايە د جهێ وێدا.

ئـــەڤ عالـــەمـــێ صـــوغرا فابريقـــەيـــە تـــەمثيـــل
هــــن را هنورێنــــــە هــــــن جرنــــــك و كــــــانی[٢]
تـــەڤ حيكمـــەت و عيلمـــە ئيعجـــازە ژ قـــودرەت
ل خـــۆ ب خـــۆ تـــو نەظەركـــە خـــالق د دە نشـــانی[٣]
ئـــەی مـــادیێ بـــێ ديـــن مينـــای طـــەبيعـــی
ب ڤـــی فكـــر و خيـــالێ چ كـــەفرەك دەرانـــــی[٤]
ئـــەی جـــاهێلێ جامـــد بـــێ عـــيلم ئۆصـــولێن
بـــێ قـــەلبێ ســـەليم ئـــەڤ ژ ظـــەنێ تـــە دەرانـــی[٥]
حـــەفـــت صـــەد و پێنجـــی ڕەهـــبەنـــدێن هـــەســـتيانە
هەســـتی دوو صـــد و چـــل و هەشـــت دا ڤێـــژی بزانـــی[٦]

---

[١] ل جهەكی زادی د حەلينە هن ژێ دبت خوون هن سەفرا، زەرئاڤ هن ژی بلغەم هن ژی ميز هن ژی خۆهدان هن ژی پيسی تێتە ئاڤێتن.

[٢] ئەڤ عالەما بچووكە وەكە پالوكێيە، هن ڕاورێنە هن جرنكن يێن ئاڤێ هنەك كانينە. هن ژ وێ ئاڤێ شيرينە وەكە يا دەڤی هنەك ژی تڕشە شووڕە وەكە يا كەپی، هندەك ژی تەحلە وەكە يا گوها، هندەك ژی شووڕە وەكە ياچاڤا، مەزناهی بۆ خودايە.

[٣] ئەڤ هەمی حكمەتە وئيعجازە ژ قودرەتا خودا ل ب خوە بۆ خوە تەماشە بكە، ئەوێ خالقی نشا تە بكە ئەڤێن ب ڤێ چێكرنا خەريب هاتبن ئافراندن، كريارا يەكی زانا و حەكيمە. كو خودايە.

[٤] يا ئەوێ مادی و بێ ئاينی وەكە يێ نەبێ. ب ڤێ فكرا خەلەت و خيالێ خاڤ چ كوفرەك تە دزانی فكرا تە خاڤە و خەلەتە زەمان دەهر، نەخالقە نكارە تو تشتی ب ئافەرينە يا نەزانێ.

[٥] وەكە بەری هشك بێ زانين و بێ بنيات بێ قەلبەكی ساخلەم، ئەڤ هزر وزەن تە دەرانی، نە ژ زانين تە ئەڤا كونيە.

[٦] حەفت و سەد و پێنجی بەندێن هەستكانە وا ب هەڤڤە گرێددە وەكە كەشەلاتێ، بۆ زانين هەستك دوو سەد و چل و هەشتن.

ئـــەی عـــەبـــدێ طـــەبیعـــی موختاریـــەت داوی

گـــەر را ســـتوو درســـتی عـــیلم و عـــەقل كـــانێ[1]

ئـــەو هـــەر دوو نـــەبیـــتن قـــوەت د گـــەل وان

كـــەنگی د بـــە غالـــب ســـەر عالـــەما بـــانی[2]

حـــەتـــا كـــافران ژی ڕەدا داروپـــن كـــر

ژ جـــوزئێ پـــازدەهێ مـــە ژ طەنطـــاوی ئـــانی[3]

حاشـــا بـــێ خـــوەیـــی بـــن مـــادی و طـــەبیعـــی بـــن

بـــن ئـــەمر و نـــەهی بـــن پـــارەب نـــە ژ ڤـــانی[4]

ئـــەم ژ وانـــن ژ نـــەینـــی ئینانـــدن هـــەیینـــی

ب فـــەرمان و حوضـــوری كـــر كـــار ژ وارا دەرانـــی[5]

د كـار دامـە قـەوی كـە ب حـەسـەناتـان مـە خـویی كـە

ژ توڕوهاتـــان مـــە بـــەری كـــە ب ڤـانـــان تـــە دزانـــی[1]

---

(۱) یا كولەیێ تەبیعەتێ یێ دەهری كو دبێژن: تەبیعەت خالقە، ئەوێ موختار ب تە دایە تە تو كری ب كەیفا خوە. هەكە ڕاستە و درستە كانی عقلێ وێ و كا زانینا وێ، ئەوی عەقل و زانین نینە.

(۲) ئەو هەر دوو عەقل و زانین نەبێ و هێز ژی نە دگەل بت گەنگی ب سەر عالەما بانی دكەڤە، ئەو بەتالە كو خالقەك زانا و عاقل نەبت ئەڤ نیزام ئینتیزام هەبت.

(۳) حەتا كافرا ژی ب گۆتنا داوین كرنە گۆتنە نە ڕاست دبێژە و گۆتنە: خودا هەیە ئەو دەرەوا دكە. دبێژە من: ئەڤا هە ژ پەرتووكا تەفسیرا قورئانێ یا (تەنتاوی) دەر ئانیە ئەڤ (تەنتاوی) بیست و شەش جلدن باڤی من گەلەك حەژێ دكر. هەر دگۆت سەیدایی (تەنتاوی) وەها گۆتیە.

(٤) حاشا ئەم بێ خوەیین مە خودا نەبت وەكە مادیابن. مە دڤێت ئەم دبن فەرمانا تەبن ئەوێن تە گۆتی نەكن. ئەم نەكن، ئەم كولەیی تەبن یارەب ئەم ژ وانە.

(٥) ئەم ژ وانن ئەوێن تە ژ نەینێ ئانینە هەینێ، تە فەرمان ب مە كر ئەم هاتنە حوزۆرا تە، كار ژ وارە دەرانی. وەكە مێژ ڕۆژی و زەكات وحەج و هندەك دی ژی.

یەك ژ مەعریفەتا تە نەقچا تە عەزائم

خەسفا هەمەمێ مە ژ کەشف و مەعانی[٢]

ڤینا تە نە بیتن ڤینا مە چ قیمەت

گۆیا قەدەرێنە چووکان هلانی [٣]

واجب بەرێ هەمیان مەعریفەتا خالق

وەك نوقطا سەوادی ژی حەرف و مەبانی [٤]

د خالقدا (لاتفکر غیر مشروع وخطر)

موئمنان حیرە عەجەزە مەعریفەت ژ وەصفا دەرانی [٥]

ژ حەشرا سەنەوی ژی ئیمانێ قەوی کە

تەشکیل و فیلمێ حەشەرا مە یا پانی[٦]

---

[١] د کار دەمە قەویکە ب چاکیا مە خودان بکە، ژ تشتێت بێ بنیات و چونە و پووچ مە دوورکە تە ب وان کەسا دزانی ئەوێن کو خودانێ ڤان شولانە.

[٢] یەك ژ ناسکرنا خودایە بۆ تە تو عەزیما بشکێنی هەم و خەمێ مە ڕاکی ببی خارێ، ژ دیارکرنا وانا.

[٣] ڤینا تە نە بێتن یانی تە بڤێت کارەکی بکی ڤیانا مە چ قەدر بوهایە، چنکو ب ڤیانا تە شول و کار چێ دبن ئەم گوکا قەدەرێنە چووکان پێ دکەڤە و ڕادکە ژ هولێ.

[٤] یا واجب بەرێ هەمی تشتا ناسکرنا خودایە، وە چاو ناسینا نوقتا ڕەش ڕابوو ناسینا تیپا ئەڤا هە ناسکریە یان مەبنیە. مەبنی مەعریفەت.

[٥] د دەربارەیێ خودا دە ژبلی تشتێت مەشروع لێ نە فکرە هزرا تێدا نەکە خەتەرە و بڤەیە. مرۆڤێت باوەرمەند بت د کارێ خودا دە بەهێتیە نەکارە. بەلکی ناسکرنا خودا ژ ئەوسافێن وی دناسە نەك ژ زاتێ وێ کا ژ چ چێ بوویە

[٦] حەشر د دوونە حەشرا سالێ هەیە کو ئەوا هەر سالێ جارەکێ ڕووێ زەمینی دمرە گول و گەیا و دار نامینە جارەکا دی ساخ دبە و شین دبە ل بەر دەستێ قودرەتا خودا ئامادە دبە. بلا باوەریا تە بڤێ قاهیم ببە. کو جارەکا دی ساخ بوون هەیە، حەشر و حەساب هەیە، ئەڤا سالێ شکل و فیلمێ یا دوویێە.

دیسانی قەوی کە ب ڤان نەجەم و سوڕەیا

دەبران و سوهەیلێن د ڤان عالەمێ بانی[1]

ژ نامی و بیولوژی قەسمێ بەشەریە

بوون مەعرەضێ تەکلیف دین بارێ خودانی[2]

یێ ب جان نە فدا بە نە ژ حزبا خودا بە

گەر ڕاست و دوروستی نك وی تورونانی [3]

یێ حەق نە دە نیشان ب حالی و مەقالی

وی قەت نەکە صاحب گر عالییو شانی[4]

هەم ذی ڕوحی ددونیێ عەسکەرە کی موەظەف

دێ نەرنە خیلافا وەضعا مەلك دانی [5]

میم کی ضەرەڕی ل دین مەکە گەر ڕاست ودوروستی[6]

---

(١) دیسا باوەریێ قەوی بکە ب ڤان ستێرکا و کۆمکا سیویا. کو (٧) یان (٩) یان (١١) هەر وەکی قاسدێ خودا دیتنە سلاڤ لێ بن، جار دبێژن دەبران، سوهەیل، د ناڤا عالەما ژۆردا.

(٢) ژ وا تشتێت زێدە دکن، کو د بیولوژی ناچی، بەشا مرۆڤایە، ئەو بوونە مەعرەزا تەکلیفێ دبن بارێ خودانیدە، خودا تاعەت ل وا بارکریە هەر وەکی کرنا تشتێت چاك و باش بکن و ژیێن خراب دوور کەڤن.

(٣) ئەو کەسێ ب جان و دل ژ خودا ڕە نەفیدا بە و نە ژ حزبا وی بە، هەکە تو ڕاست دکی و تو ژێڕا درستی لبا وی کەسی نارۆنی هەڤالەتیێ پێرە ناکی.

(٤) ئەو کەسێ حەق ماف ئەشکەر نیشان نەدە چ ب کریار بن چ ب گۆتن بن. ئەوی توجارا بۆ خوە نەکە هەڤال، هەکە تو خودان و شەرەف بی.

(٥) هەمی ئەو تشتێت گیانەبەر خودان ڕوهـ. د دونیایێدە لەشکەرەکە خودان وەزیفەیە، ژبۆ خودا ڕە د ڤێ خوە ب چولایا ڤەنەدن ژبلی وێ یا کو خودانی ژێرە دەستنیشانکری، ژ وا پێڤە نانی پیا هندە دی بکە.

(٦) هنگەمی مەکی دڤێت تو زیانی ل ئایین نەدی هەکە تو ڕاست و درست بی.

موهیمـــاتێ دیـــن ســێنه هـــەر ســێك ب ثوبــات
حـــەلال و حـــەرام یـــا ســـــى پوبهاتـــە[١]

زیـان یـێ حـەرام چـار کنـار شـوبهەیـه
دەمـا چـوو یـێ شـوبهه زیـان توهمەتـە[٢]

بـه سـەمـا دێ بخـۆ ئیقتیصـاد شـەرعیـه
ژ ڤـی حـەدی دەرکـەڤـی تـەبذیریـە[٣]

بـەرەکـەت ئـەڤـە گۆت: خـودایی و ڕەسـول
ئـەڤـی طـەبعێ عونصـوڕکه نـه ڕە فوضـول[٤]

سۆئالێ نـەکـه ژ کـەسـی ب تـەدبیـرێ تیـز
ب ئیـداره تـو دەربازکـه عـومرێ عـەزیـز[٥]

بنێـــڕه تـــو ل میـــزان ئینتیظامـــا
خـــودا دانـــی ئـــەرض و ئاســـیمانا[١]

---

[١] ئەو تشتێت د ئایین دا گرنگن سسێنه ئەڤه هاتنه سابت کرن، یەك حەلاله و یەك حەرامه و یەك شوبهەیه ئەوا دناڤبەرا حەلال و حرامیده وەکه دوور ما دوورێ زیانێ.

[٢] یا حەرام زیانه تاوانه، هەر چار کەنارێ وێ شوبهەیه، دەما تو چو ناڤ شوبهێ تو دێ بکەڤی ناڤ حەرامی، حەدیسا قاسدێ خودا چییه د ڤێ بارێدا، دەما ژ حەرام داخڤه دبێژه: وەکه ئەو شڤانێ ل دوورا زیانێ پەزێ دچێرێنه. توهمەیه کو بکەڤه ناڤ زیانێ، دڤێت مروڤ خوه ژ شوبهێ ب پارێزه دا نه کەڤێ د حەرامی.

[٣] نه کێم نه زێده بخوه ئابوورێ یا شەرعی ئەوه ژ ڤی تو دەرکەڤی یانی زێده بخوی ئەو تەبزیراتیه. خودا گۆتیه ئەوین وەسا برایێ شەیتانینه یانی موبەزر

[٤] بەرەکەت د ڤێدایه خودا و قاسدێ وی وەسا گۆتنه تەبیعەتی وەکه کارینا خوه بکه کاتو د کاری چاوا وەکه عوسورێن خوه بکی وەسا بکه. یا دی فزولیه زێدەیه ب کێر نایه.

[٥] خوازوکی نەباشه نەکه ژ تو کەسی ژ خودا بکه، یا ئەوێ بیرتیژ ب ئیدارێ دەرباس بکه عەمرێ خوه یێ عەزیز.

قە یەك ژ خەطا خۆ دەرناكەڤە توجارا
ژ مەشا خۆ ل پاش نامینە جارجارا[٢]

تو قەنج فكری ل دەزگاهی ل بەر چاڤ
ژ شەكێ تێ بچی غەیبێ تو هنگاڤ[٣]

ژ غەیبێ دێ بچێ عەینێ شهوودێ
مەقاماتێ موناجات و سجوودێ[٤]

مە (فعال مطلق) یەكە یەك ئیلاهـ
تو تەئسیر و مای نەدە (ما سواهـ)[٥]

(لم یجعل سبیلا الی المنعرفة)
(سوی عجز عبد عن المعرفة)[٦]

بۆ عابدان مەعبوود تووی
بۆ شاهیدان مەشهوود تووی[٧]

بۆ قاصدان مەقصوود تووی
بۆ نا مەریدا تو موراد[١]

---

[١] بۆ بنێڕە ل میزانیا خودا دانی د عەردی و عەسمانا دە چەند مونتەزەمە، خڕابوون تێدا نینە

[٢] قەت یەك ژ خەتا خوە دەرناكەڤە، وەكە زڤڕاندنا عەردێ ل doورا ڕۆژێ مانگ ژی وەسایە.

[٣] ڕۆژ ژی هەروەسا ژ چوونا خوە ڕۆژەكێ و گاڤەكی خەلەت نابن

[٤] هەكە تو باشی ل دەزگاهی بنێڕی ل بەرچاڤە، ژ شكی تو دێ بچی تشتا نە دیار و ژ نە دیارێ تو وێ بچی بەرچاڤێ و شهودێ ئەو جهێ ئاخڤتنا ب خودا ڕەیە. سەری ژێڕا داتینە.

[٥] ژ مەرا ئەو كوچ بڤێت یەكە ئەوی ژبۆ (الله) یەك شەریك نینن چ بڤی بت وێ بكە. تو نەبێژە فلانە تشتێ وەها كر یان ڤێ نڤشتایێ ئەز ساخ كرم ژبلی خودا كەسی نكارە تشتەكی بكە هەر ب وی یە.

[٦] نەگەراندیە سەبیل ڕێك بۆ گەهاندنا ناسینا خوە ژبلی نەكارینێ عجز یا كولەیی ژ ناسكرنێ.

[٧] ژبۆ پەرستنێ كولا پێ تێتە پاڕەستن هەر تو وی ژبۆ ئامەدەبوونا د حەوزورێدا هەر تووی.

دبن پەردێ ڕەحمە بەندیە
بۆ وەحدەتێ تلیا مەیە[2]

ژ داخاز و حاجاتێ مەڕا
دەست مە کەشکۆل مەنجەلە[3]

تاعەت نە طلسم و نقشت
مێژ نپسووله پێ گەهشت[4]

شوکران سەعیا تە بەهشت
ژ دینی مە ڕە مێژە عوماد[5]

---

(1) بۆ کەسێن قەستا وی تێتە کرن هەر تووی، بێ کو قەستا وی تێتەکرن، ژ موریدان تو مرادی. مرادامە تووی یا خودا.

(2) ئەز دبن پەردا ڕەحمەتا تەدامە، ژبۆ شەهدەدان ژبۆ یەکیتیا تە تلیامە. یا شەهدێ دبێژە خودا یەکە و تێتە بلندکرن.

(3) دەستێ مە ژی ل بەر دوعا و دخوازێ وەکە کەشکولێ و مهنجەلێیە. تو ژ مەزناهیا خوە چ بکی تێدا ئەم پێ ڕازینە هەما تو ڤالا نە زڤڕینێ.

(4)

(5)

# عیلم

د حـەقـى عـیلم ئـەرزان نـەبـە كومكـە دزك تـا غـەرغـەرى
ژ ئـــەولـــین ئاخرینـــا ژ غـــەربـــى بگـــرە تـــا ب شـــەرق[١]
بـــو تـــەنـــویر ســـحرەبـــازان دیـــن عـــەصـــا ثوعبـــان حـــەق
عیلمـــێ وان ئیمـــان نشـــان دا ســـجدە بـــر بـــەر ذاتـــێ حـــەق[٢]
عـامـى بـێ عـیلم دەسـتـە ڤـالـە بـى تـەمیـز د كـوفر و ظـەلالـە
كـى حـەقیقـى كـى میثـالـە نینـە نـك وى قـەت چـوو فـەرق[٣]
یـەك حـەیاتـە ئـەو ژى عیلمـە فـەرەخـێ وێ بـە ژیـن تـە ژى
عیلمێ ئاصف طەرفەت عەینە ئیسمێ ئەعظەم ئەو چ بەرق[٤]

---

(١) د دەربـارەیێ عـیلم دا نـە ئـەرزان بـە ژبـۆ خـوە كـۆم بكـە دیزكـا تـە بـلا تـەژیبـە حـەتا بـەر غەرغەرا مرنێ هەر كۆم بكە، ژ زانایێن بەرێ و یێن داویـێ ژ ڕۆژئاڤا و ڕۆژهـەلاتێ زانینـێ فێر ببە ژ خۆ ڕە كۆم بكە ژێ تێر نەبە، تە چەند هەبت نە بەسە.

(٢) بۆ تە ڕۆناهیە سیحربازا دارێ مووسا دیتن مارێ ڕاستە حەقە، زانینا وا ئیمان بـاوەرى نیشا وا دا سوجدە برن ژبۆ زاتێ پاك، سیحرا وا بەتال و نە ڕاست بوو.

(٣) مرۆڤـێ نـەزان عـامى بـێ زانست دەستێ وى ڤالایـە ژ هـەڤ نـا ڤەقـەتینێ كـیژان كـوفرە و كیژك نەڕاستیە وندا بوونە، و كـیژان ڕاسـتى و حەقیقـەتە و كـیژان نەڕاسـتیە و میسـالە نینە باوى جوداهى ژبەر كو نەزانە.

(٤) ژیـان یەكـە ئـەو ژى زانینـە تـو فـەرخێ، تێژكـێ وێ بـە ژینـا تـە بلا ژ وێ بـە، بـوویێ وە ڕە خودان كرن. زانینا عاصف وەزیرێ مسلمان سلاڤ لێ بن، وەكـە چاڤ مچانـدن و ڤـەڕێن بوە گۆتە سلێمان. تو چاڤێ خوە بگرى و ڤـەكى ئـەزێ تـەختێ پـەلقیسـێ ئامادە بكم، ناڤێ خودایێ مەزن بوو. ئەو چ بروسكە چ بەرقە یارەب.

د حـــەديثـــێ مـــالێ مـــە صـــەدەقـــەيـــە بـــۆ موئمنـــا
وارثـــێن مـــە عـــالمن ژ هـــەميـــان ئـــەون ئـــێن موســـتەحـــەق[1]

بـزرِی فیـردەوسـێ ژی عیلمـە لـی بـەلـێ ب شـەرِط و شـرِوط
بـاڤکێ ئـادەم ب عـیلم نـاجح بـوو خـەلیفـێ ذاتـێ حـەق[2]

(1) د حەدیسێدا هاتیە: (مالێ مە خێرە بۆ باوەرمەند) قاسدێ خودا گۆتیە: (نحن معاشر الانبیاء لانورث)، وارسێ وا زانانە نە خوە مافێ وایە.

(2) تو ڤێ بەحشتێ ژی زانینە عیلم لێ شەرت و شورت هەنە. نە بەلاشە دڤێت وەرە پێك ئانین یێ زانا وی مافی ژ سەرخوە پێك بینە. باڤێ مە ئادەم بزانین سەرکەڤت، خودا زانین دا ئادەم ناڤێ هەمی تشتا پێ دا زانین و مەلائیکەتا نەدزانین [وعلم آدم الاسماء کلها] (البقرة: ٣١)، (العلماء ورثت الانبیاء).

# قورئانا ڕەسول

د قورئانێ ڕەسولێ وە یا بۆ وە دا
بگریا نەهی کر نەکن جان فیدا[1]

ژ ڕەسولێ خودایێ ژ سەیدایی دەرس
مالا یەعنی تەرك كە ئەوە یا نە طەڕز[2]

ئیسلامەتیا تە چە حوسنایە گەر
مالا یەعنی تەرك كی ئەیا موعتەبەر[3]

ما یەعنیە نێچیرە بگر ب کێلب و دەڤ
ل عەکس و خلافا وێ قەت دەر نەکەڤ[4]

مە چار و سەلامەتا عەبدێ ب گەڤی
ژ خەبەرا خودایێ خۆ دەر نەکەڤی[5]

---

(1) واتا ئایەتێیە، د پەرتووکا پیرۆزدا ئەوا قاسدێ خودا بۆ وە گۆتی وێ بگرن یا گۆت هەوە نەکن هوون ژێ نەکن یا ئەوێ جانفیدا بۆ دینێ خودا.

(2) ژ قاسدێ خودا و ژ سەیدایێ دەرسە بۆ وە تشتا بۆ هەوە نە لازم نەکە ئەوە یا نە بابەت نەلایقن (من حسن اسلام المرء ترکه مالا یعنیه).

(3) ئیسلامەتیا تە چەند ڕندە و باشە هەکە تشتا نە مراد بە بۆ تە تو نەکی یا مرۆڤێ خودان سۆز و بەخت.

(4) تشتا مەخسەد بت بۆ تە نێچیرە بدەڤ و کولافا بگرە کلبا تو ل یا وەکە وێ و خلافا وێ بت نەگەرە و ژ وێ دەر نەکەڤە

(5) چارە و سەلامەتیا کولەیێ بگەڤی یانی ب پور ئەوە ژ گۆتنا خودا دەرنەکەڤە بیا خودا بکە هنگی سەرفەراز دبە.

دەلیل ئەوە بێ سووج و سەبەب قەط خودا
عەذاب نادە کەسەکێ ئەیا جان فیدا[1]

عەفو هەکە مەکە خودایێ عەلیم
جەزایێ گونەهان عەذابێ ئەلیم[2]

گونەهکاری ئیمان ب (لاتقنطوا)
تەسەلی تە دامە ب (لاتقنطوا)[3]

ب قاس ذەڕێ نوورێ ثەنا مە ب لەب
وە هەر یەك ب زمانێ تەڤان ڕۆژ و شەب[4]

صەلات و سەلام سەر نەبی وەك تەڤین
وە ئال و صەحابیێن ل وی د جڤین[5]

تو گوهدە مەن (ئوخوە) تام حەقیقەت
بەلێ نك سەلەفێن صالح ب قیمەت[6]

---

[1] دەلیل ئەو بێ سووج و سەبەب، خودا کەسی سەزا نادە. هەر سەبەبەك هەیە لوما کولە سەزا دخوە ژبەر کو بێ ئەمری کریە.

[2] هەکە خودایێ زانا یەکی نەبوورە سەزایێ دژ وار ژێرە هەیە، ئەو سەزایێ گونەهێ ویە ئەوی گونەهـ کریە، لوما تێتە عەزاب دان.

[3] هەکە تو گونەهکاری تە باوەری پەرتووکا پیرۆز هەیە کو خودا گۆتیە خوە بێهیڤی نەکن ژ دلوڤانیا خودێ، ئەو دلخوەشیە بۆ تە، یا خودا گۆتی.

[4] هنکە زەڕەڕێ ڕۆناهیێ حەمد و سەنایێن مە ب لێڤا و دەڤ هەر یەك ب زمانی هەمیا و ڕۆژ و شەڤێ بۆ تە مە هەنە یاڕەب.

[5] صەلات و سلاڤ ل سەر قاسدێ تەبن وەکە تە بڤیت و هەروەسا ل سەر ئەهلێ مالا وی و هەڤالێن ویژی بن ئەوێن لێ جڤایین.

[6] گوهێ خوە بدە من براتی ڕاستیە لێ ل نك ئەوێن بەرێ چووین کو ئەوێن چاکن و ب قەدر و قیمەتن. ئەوێن دەورا بەرێنە کو وەکە خودا و قاسدێ وی دکرن، دگۆتن وا (سەلەفێن صالح) نە وەك ڤایێن نها بوون.

ل بـــابێ ئۆخـــوەتـــی بنێـــڕە چـــەوانـــە
ژ (حـــەبیـــب اللـــە) چێبوویـــە بزانـــە[١]

چیـــا دانـــی ل ســـەر تـــەقـــوایێ دانـــی
چیـــا دانـــی نـــەبـــێ ســـەیـــدا وی دانـــی[٢]

ژ وان کـــەت دەســـتێ جـــەهلـــێ پـــێ لـــەســـتن
ژ لـــەو کـــوفرێ شـــیعارین دیـــن گوهســـتن[٣]

ئوخـــۆە ئـــەصـــله قورئانـــە و حـــەدیثـــە
عـــەشـــیر و عوصـــبه مونتـــەنـــە و خـــەبیثـــە[٤]

برایـــــــێ دەورێ وەعـــــــدا وی وەعیـــــــدە
نـــە بـــە مـــەغـــرور ب وان تـــەکلیفـــێ زێـــدە[٥]

بـــرا گـــەر مـــن ئـــەمـــین و دوســـت دبینـــی
هـــەر دوو عـــەیبـــێن مـــن ل بـــەر مـــن تـــێ ب خـــوونی[٦]

---

[١] ل بابێ براتیێ بنێڕە کا چاوانە و ژ کێ پەیدابوویە، قاسدێ خودا دەمێ هاتە مەدینێ د ناڤبەرا کوچ کریا دە و هاریکارە دە براتی چێکر. یا ڕاست و دروست ئەو بوو. مالێ خوە لێکڤەکرن. هنا ژن ژی ژ هەڤڕە تەکلیف کرن، کابراتیا نها.

[٢] چیادانیی بنگەهێ وێ ل سەر خودا ترسێ هاتیە دایین. ئەوا دانیی نەبێ سەیدا دانیە خودا پێ دایە زانین ئەوی ژی وەسا کریە.

[٣] ژ وا ئەوا ڕاست کە دەستێ نەزانا و جاهلا ئەوا ژی پێ لەیستن، ژبەر وێ کافرا شیعارێن دبن گوهەڕین نها ئایین بێ هێز بوویە، تشتێت وێ هاتنە گوهەڕین.

[٤] براتی تەمەلێ وێ ژ پەرتووك و حەدیسێیە ئەسلە، عەشیرەتێ و ڕەگەز پەرستی پیسن و بێهنووینە، سفتونە، نەباشن یا باش براتیا ئیسلامێیە.

[٥] براتیا نهو نە سۆزە بەلکی نەڕاستیە. ب تەکلیف و ئەزێ هو بکم ئەز ژ تەرە ئامادەمە ب ڤانەوە چاپان دین ئەڤ هەمی زێدەنە.

[٦] ئەو برا باشە و گەرمە کو تو وا ئەمین و دوست ببینی کو هەر ڕۆژ کێماسیێن تە ل بەر چاڤ ب خوونە ژ تە ڕە بێژە عەیبا ل تە نە ڤەشێرە هنگی ئەو برایێ ڕاستە بو تە.

دزانێ د عەیبێ خۆ کوڕ و نە ناسی
برێ مۆئمن دوور بینە بۆ یێ عاصی[1]

دیزکێ گۆت هەسکوا داری زێڕپینم
ئەوێ گۆت: وێ بنێ تە ئەز دبینم[2]

بۆ عەیبێن خۆ براکێ بگرە دەروێش
د ناڤ هەڤرێ و هەڤالا خۆ نەدە پێش[3]

تو چێتر کە خەفێن مە ژ ئاشکارا
ژ نیفاقێ تو ب پارێزە مە ژارا[4]

خودێ بگرە بەنی بەردە چ پەردە
چ لەیلانە ل بەر چاڤان چ دەردە[5]

ژ قەنجان بە نە قەنجی خەبەر قەت نەدە
گوشتێ وان ژەهرە تو دەڤ لێ نەدە[6]

نەبێژە ئەڤێ هە ژ ڤی قەنج تڕە
خودا ڤی دزا نە یا ئەم بێژن ڤڕە[1]

---

(1) تو دزانی کێماسیێن خوە نابینی و کوڕی ژێڕا و ناسی ناکی، برایێ باوەرمەند وەکە دووربینێ بە ژێۆ گونەهێن تە، ژبۆ وێ دکەڤە خەلەتیا نە مرۆڤ ڕاست بکە باشە.

(2) دیزکێ گۆت: ژبۆ هەسکو وا دارین، ئەز زێڕم هەسکوێ ئەز بنێ تە دبینم مروڤ کێماسیێن خوە نابینە لێ باوەرمەند دبینن.

(3) ژبۆ عەیبن خوە برایەکێ ژ خوە ڕە بگرە بلا بۆ تە ئەو عەیبێن تە بێژی، یا ئەوێ کو دەروێشە، د ناڤا هەڤالا دە خوە نە دە پێش، نە بەرپرس، مەزناهی و پێشتی بەلایە..

(4) یاڕەب تو ڤەشارتیێن مە ژ یێن ئەشکەرا باشتر بکە ژ دوورتێ و نیفاقێ مە بپارێزە.

(5) تو خودا بگرە بەنیێ بەردە ما ئەڤ ژ پەردەیە د ناڤبەرا تە و خودا دە، ژ لەیلانە دکەڤە بەرچاڤ تە ئەڤ ژ دەردە نو کەتیێ، لەیلان ل بەری و بەرستانا وەکە ئاڤێ دەکەڤە بەرچاڤێ مرۆڤ، مرۆڤ دبێژە ڤەی ئاقلێ نەڕاستیە.

(6) تو ژ چاکا بە ژ مرۆڤێ نەباش نە ئاخڤە گۆشتێ وا ژەهرێیە تو دەڤێ خوە لێ نەدە.

كەڕامات ژی حەقن وەلی ژی بڕن
ژیەر حەڤا نەفسێ نەبن چێترن[٢]

هنەك وان مەدح کن کبر چێ دبن
دەها زێدە بێژن هەدم کن ژبن[٣]

ژ مەدحێ عوجوب چێدبت وێ نەکە
تو مەصلەحەتێ تێ ببینی بکە[٤]

چیا تو بکی نەچە بەر ئەصلەکی
دبت سوئێ قەصدە لازم دێ نەکی[٥]

(تداووا تصحوا) حدیث امره
ژ ماهر حەکیمان ڤی عیلمی بگره[٦]

کەسێ کو ل عەکسا حەدیثێ بچە
بەلێ طاعەتێ وی ژی پێرا بچە[١]

---

[١] نەبێژە: ئەڤێ هە ژ ڤێ هە باشترە خودا دزانە کی باشە کی نەباشە یا ئەم بێژن ڤڕە نە ڕاستە، ئەم ژ غەیبێ نزانن، زانایێ ب غەیبێ هەر خودایە.

[٢] کەرامەتێ وەلیا هەنە، وەلی ژی هەنە، کەڕامەت ژ وا پەیدا دبن، موعجیزە ژ قاسدێن خودا پەیدا دبن. ژیەر پارا نەفسێ کو نەفسێ خوە پێ مەزن دکە، کەرامەت نەبن چێترە.

[٣] هندەك مریدێ وا مەدح دکن پەسنێ وا ددن، کو باوەری پێ چێد بە، هەکە زێدەتر گۆتن هنگی ژ بنی د هەرفینن خراب دکن. سوفی گەلەك جارا وەسا تێنن سەرێ شێخێ خوە، ئەو ژی خوە ب گۆتنێن وا مەزن دکە ژ بنی وێران دبە.

[٤] ژ پەسن داینێ موعجب چێدبە ئەوێ نەکە توجارا، هەکە شولەك یێ خێر تێدا هەبت پەسنا بدە، بەلکی هندەك دی ژی چاڤ ل وی بکن ئەو ژی باشێ بکن.

[٥] هەر چی تو بکی نەبێژە ئەز وامە باڤ و باپیر ژی وەسا بوون خوە پێ ناڤ نەدە، ژ وێ قەسدا نەباش نە ژیۆ خودا پەیدا دبە دڤێت وەسا نەکی

[٦] دەرمانی بکار بینن هوون دێ ساخ ببن ئەڤا هە فەرمانە ژ قاسدێ خودا هاتیە، ئەڤێ زانینێ ژ حەکیمەك زیرەك فێر ببە

بـــزان ب حـــوكم شـــەرعـــا شـــەريـــف ئاثمـــە
ب تـــــەركـــــا تـــــەداويـــــى ئـــــەو ظالمـــــە[٢]

ژ ئـــــەوەل ڤـــــە ئيمـــــان موقـــــام دوســـــيێ
مـــــەعافـــات و صـــــەحـــــەتـــــە ل دوو پێشـــــيێ[٣]

ژبـــەر ڤـــێ حـــەبيـــب گـــو تـــەصـــديقێ نـــاز
ژ خـــــودێ خـــــۆ مـــــەعافـــــات بـــــۆ خۆبخـــــاز[٤]

حـــــەديثـــــە چـــــەوا ئـــــێش بـــــەلا قـــــەدەرن
موعافـــــان و صـــــەحـــــەت ژی تـــــەڤ قـــــەدەرن[٥]

يـــێ فـــەلـــەج ئـــەمـــەلا صـــەحـــەتـــێ تـــا هـــەبـــە
ل دينـــێ خـــودێ صـــەڕفكـــە مـــالێ هـــەبـــە[٦]

---

(١) كەسێ وەكە حەديسێ نەكە نە وەك وێ بكە، كريار و تاعەتێ وی ژی پێرە دچە ژبەر كو هەكە مروڤ نەساخ بت نكارە نڤێژ و ڕۆژیا بگرە و گەلەكێن دی ژی

(٢) ئەوێ دەرمانا بكار نە ئينێ و ژێرە لازم بن ب گورەی شەريعەتا شەريف ئەو گونەهكار دبت، حەتا بكار نە ئانينا دەرمانی ئەستەم كارە، زولمێ ل خوە دكە.

(٣) ژ ئەول ڤە باوەری ئانين بخودا پاشی مەقاصێ دووێ تەندورستيە وعافيەتە ئەو ل دووڤ تێن گەلەك گرنگە سەلامەتی بۆ مرۆڤی، دڤێت مرۆڤ ژی هایی ژێ هەبت ژبەر وێ خارنا گەلەك تشتا حەرامين ژبەر كو زەرەڕ ژ وا پەيدا دبە، وەكە خارنا تشتێت هوشبەر و ئاخ و خون گەلەكێن دی ژی

(٤) ژبەر ڤێ قاسدێ خودا گۆتە ئەبوبكرێ صەديق ژ خودێ بۆ خوە تەندروستيێ بخوازە. عافيەت نيعمەتەكا گەلەك خوەشە ژبەر وێ قاسدێ خودا وەسيەتا وێ كريە مسلمان ژی تەمەلێ ساخلەميە، مرۆڤێ مسلمان ژ نەساخيا دوورن، ژبەر كو تشتێت حەرام بكار نائينن و ژ وا دوورن.

(٥)

(٦) چاخێ سەحابە هاتی شامێ ل وێ بەلا هەبوو خەليفێ دووێ عومەر شێور ب وا كر كا ئەم هەڕن ناڤا شامێ يان ئەم ڤەگەڕن. ئەبو عوبيدە گۆت: ئەمێ ژ قەدەرێ ڤەگەڕن يا

بــۆ ئــەهلــێ بــەلا یــان ثــەواب بــێ حیســاب
وەلــی ب شــەڕط و قــەیــدن نــەظــەر دە کتــاب[1]

عــــەوارض ئینســــان ســــیو پێــــنج هــــزار
لــە وەصــیەتــا مــەیــزەکــە ئــەی گوشــیدار[2]

خودایــە ژ نــەینــێ تــو گــەر چــەك کــری
د (أحســـن التقـــویم) تـــو ترکیـــب کـــری[3]

د حــەدیثــێ حــەبیــب گــۆت: عــەمــەل پــێ بکــن
د ڤــێ هــەر کــەس پــەهرپــزا خۆناســی بکــن[4]

---

عومەر بەرسڤا وی عومەر دا گۆت بال ئەدەرێڤە ئەمێ ڤەگەڕن. مرۆڤێ فەلج بت حەتا هێڤیا ساخ بوونێ هەبت، دێ ژ ئاینێ خوە مالی دێ خەرج بکە هەکە هەبت دا کار ببە واجبێ خوە پێك بینە.

[1] ژبۆ وا یێن کو بەلا وینە خێرا وا پر هەیە با خودا لێ شەڕت و شڕوتێ وێ هەنە، دڤێت خوە ڕاگر بت و گازندەیا ژ خودا نەکە حەمدی وی بکە. شوکوردار بە بۆ خودا گەلەك حەدیس پێ هەنە.

[2] ئەو تشتێت ل مرۆڤا پەیدا دبن سەهو پێنج هەزاران تە بڤێت زێدە ژێ بزانی هەرە ل وەسیەتا مێزەکە تو دێ بزان بی. (تداووا تصحوا) حەدیسە ژ نەبی درد و دەرمان ژێ قەدەرن ئەی ئەبی.

[3] خودایە مری ژ نەینێ ئینانە هەینێ. د چترینێ لەڤدانا دە تەسازکریە، ئەو لێکدانا خودێ مرۆڤ لێك دایی ئەوی ب خوە وەسفێ خوە پێدایە و [لقدخلقنا الانسان في أحسن تقويم] (التين: ٤).

[4] د حەدیسێدا قاسدێ خودا گۆتیە: دڤێت مرۆڤ کار پێ بکە گۆتیە تە داوی ببن نە خوە دڤێت هەر کەسی پەهریزا خوە ناس بکە چ کێر وی تێت چ بکێر وی نایێ، یا بکێر وی نەیێ دڤێت نەخوە (المعده بیت كل داء)، (والحمیة رأس كل دواء) معیدا ئینسانی ئامانا هەمی نەساخیایە، پەرهرێز سەرێ هەمی دەرمانایە، ئەڤا هە حدیسە.

خیطابەت د گەل عامێ كورتێ كەلام
تو قەنج حەلكە (هەضما) بخۆ (والسلام)(١)

ژ یووسف دەبركە ئەڤێ غونمەیێ
هەنیئون مەریئون كە ئەڤێ لەقمەیێ(٢)

چیا مە نیزیك جەننەتێ كە تە گۆت
ژ دوو ژی دووركە تەمامەن تە گۆت(٣)

صەبركە صەبر تە ب خودایێ تنێ
تو دل طەنگ نەكە ژ ئەهلێ دنێ(٤)

خودایە دگەل موتەقی و موحسنان
ب مەعییەتەكێ (خاصە) بۆ ئەڤان(٥)

پەیاپەی مەدەد تێن ژێ شەئن ددەست
نەبوویێ موخالف و دونیا پەرست(٦)

---

(١) ئاخڤتنا من دگەل عامێ خەلكێ، گۆتنا كورت بۆ وا خارنا تە خار باش بچوو حەل بكە و ب خوە والسلام.

(٢) ئەڤێیا هە ژ یووسف بۆ خوە بگرە ئەڤ بۆ تە خەنیمەتە ژبۆ تە خوەشی و عافیەت بت خوەشی هەرە خارێ، ئەڤ پاریێ هە.

(٣) چ تشتا مە نێزیكی بەحشتێ بكە تە گۆتیە: یاڕەب كو باوەریە و ئیمانە ئەوا مە ژ ئاگری ژی دوور دكە تە گۆتیە و نیشا مە دایە كو كوفرە و شركە.

(٤) دبێژە صەبر كە بلا صەبرا تە ب خودێ تە نێ بت تو دلی تەنگ نەكە ژ ئەهلێ دنێ. بلا تو دل فرەهبی ل سەر حەمدێ خوەبە بزانبە هەر تشت ژ خودایە، بی خودا چو نابە.

(٥) هەر خودا دگەل ویێ ژ خودا ترسی و خودانێن چاكیا بت، تایبەتەك بۆ ڤا هەیە. هەڤالێ وایە، خودا ئەوێن كو خودا هەڤالێ وا بت ئەو ژ هەر تشتی بێ منەتن، دبێژن: بلا خودا یار بێ بلا دونیا هەمی نەیار بە.

(٦) ل دووڤ هەڤ مەدە مەدتێن ژێ كو دكارێ خودا دایە نە ژبۆ دونیا پەرستا و موخالفا ڕە هاوار هاتن نینە، كەسی ل هاوارا وا نایێ مەدەد یاڕەب مدەد یاڕەب.

دەور ل پێ دەورێ پەیا پەی ژ عالەما ظولماتێ بەر

ل دار تەکلیف و ئیمتیحان و سەجدەگاه و موئتەمر[١]

بەر دوو عەصرێ سعادەت وەحی و تەبلیغا ڕەسوول

هەم جەمالا وەجهێ ئەنوەر هەم بەیاناتێ ڕەسوول[٢]

نابیتن ژ جوزئێ ئیختیاری دوومکێ دێ داکەڤن

قەدەر و سەبقا کیتابێ دێ ل سەر مە دەرکەڤن[٣]

هەم دە ئادەم سووچ نە کربا دێ ژ حوسنای تە چەند

وەك عەفوێ ئەم د دائیرێ دێ ب مانا بێ مەدد[٤]

ئەڤ نەکن دێ هن دێ بێن ئەفساد کن بەر ڕووێ خاك

ناسی بکن ب ئازاد و عەفوێ بین ڤەنا یەزدانێ پاك[٥]

---

[١] دەور ل پەی دەورێ زەمان پەی ب زەمانی ل دووڤ هەڤ ژ عالەما تاریتیێ بەر ل دارێ دونیائێیە کو دارێ تەکلیفێیە و ئیمتیحانێیە جهێ سەجدە برنێیە بۆ خودا و وەکە کوتگەرێیەکا کی سەر دکەڤە و تێتە هەلبژارتن بۆ ئاخرەتێ.

[٢] بەرێ دوو دەورێن زمانی قاسدێ خودێ و وەحیێ و گۆتنا قاسدێ خودا هەم ڕندیا ڕووێ و ڕۆناهی و بەیانێن وی کو دایین بە ئومەتێ پاش ڤا هەمیا.

[٣] نابە دومەکیژی ژجوزئێ ئیختیاری ئەم دوور بکەڤن قەدەرە و نڤیسینا د پەرتووکێدا ژ ئەوێ ل سەر مە دەرکەڤن کا چ د قەدرا مە دە هەیە و د(لوح المحفوظ)دا چ هاتیە نیڤساندن چاك یان خراپ وێ بیتە پشیامە.

[٤] هەکە ئادەم سووج خەلەتاهی نەکربا ژ گەلەك چاکیێن خودا بێ بەهر دبوو وەکە لێ بوورینێ عەفوێ و ئەم ژێ وێ مابینا د وێ دائیرا تەنگدا.

[٥] هەکە ئەڤێن هە نەکن تشتێت باش هندەك دی وێ وەرن فەسادێ ل سەر ڕووێ عەردێ وێ هاوار و گازی بەلاڤ بکن. دڤێت خودا بێتە ناسین کو خودانێ لێ بهورتنیە و مرۆڤی ئازادکە، هەزار سەنا بۆ خودا بن.

ئایــه (فـــي الارض خليفـــة) (أعلـــم مـــالا تعلمـــون)
(أو حقـائق بـين ظهـوري معرفـة) ب يـەزدانـێ پـاك[1]

تـــــەبــــــارەك ژ (لـــــولاك لـــــولاك) تـــــو
چ دەلالـــە كـــەنـــزا خـــەفـــە ژ فـــاكێ تـــو[2]

---

[1] ئايەتا گۆتى: [إني جاعل في الارض خليفة] (البقرة: ٣٠) مەلەكا گۆتن تێ يەكى چێكى خوونێ ب ڕێژە د ئەردێیدە. گۆت: [اعلم مالاتعلمون] (البقرة: ٣٠) ئەز ژ هەوە چێتر دزانم، ئەڤ ڕاستێن هە بێنە زانين باشترە. ڤەشارتى بمينن خودا ئادەم چێكر ئەڤ دونيا ب وا ئاڤەدان بوو و خودا هاتە ناسكرن.

[2] پيرۆزى بۆ تە بت هەكە تو نەبوو بايى تە ب دەڤێ گۆتيە ئەز دەفينەك ڤەشارتى بووم من مەخلوق ئافراندينە دا ئەز بێمە ناسكرن.

## حەسەنات و سەیئات

حـــەســـەناتـــان پـــوڕ بکـــە ژ ڤـــان ســـەیئاتـــان توبـــەکـــە
ڤانـــان بوانـــان دەفعـــە کـــە توبـــا نصـــوح عوقبـــای دار[١]

عەبدینیێ نەخوەش نەکە بەختێ خوە ب ڕەشۆهەش نەکە
د عوقبـایێ خـۆ ڕووڕەش نـەکـە هـم شـەرمـی و دوژەهـ و نـار[٢]

ژ هــەر مــەرکــەزێ بــۆ وەحــدەتــێ عــەبــدینی رادارا مــەتــی
ئـەنفـەع ئـەوە لـەو ژ حـەضـرەتـێ بـۆ ئـەمـر دا ئـیلاڤ مـەدار[٣]

عــەبــدینی پــڕ عــالی مــەقــام مــەوصــوفە پــێ (خیــر الانــام)
سەر عەبدێمە نازل ئەڤ کەلام د قورئانێ ها تە چەند جار[٤]

ســیما و ســەرمــا یــەك خــەفــی بــۆ موئمنــان ســەیــر و صــەفــی
قودســی فــری خــوەش ڕەفــرەفــی هــەر فــرەك تێــدا صــەد هــەزار[٥]

---

[١] چاکیا پڕ بکە ژ ڤان گونەهان توبە بکە، گونەها ب خێرا بدە لایەکی ل بایەکی و شیرەتڤان ژبەر کو جهێ تە ئاخرەتە چو وار دی تە نینن.

[٢] کولەتیا خوە بۆ خودا نەخوەش نەکە بەختێ خوە ل ڕەش و هەشە نەکە دبێژن: فلان بەخت ڕەشە، تە هەش ل خوە دایێ دەرمانەك هەشینە، ل کوردستانێ شەل و شاپکێن عەسمانی پێ هەشین دکن.

[٣] ژ قەرەبالخێ هەرە بۆ یەکیتیا خودا کولەتی وەکە ڕادارێیە بۆ مە ئەم چ بکن پێرە دیارە خودا مە دبینە. یا باش و فەیدە ئەوە ژ حوزۆرا خودا بۆ مە فەرمان وەرە هەر تشت ژ وێ دائیرێ دەردکەڤە.

[٤] کولەتی مەقامەك بلندە خێرترێ عالمێ کو موحەمەدە پێ هاتیمە وەسفەدان: [وانزلنا على عبدنا الکتاب] گەلەك جارا هاتیە.

[٥] بیسیماك و سەرمایەکی خەفی، بامال و بەدەنا خوە ڤەشارتی بۆ باوەرمەند سەران وەصفایە د جەنەتێدا مرۆڤێ پروز قودسی بت د فرە خوەشی د ڕەڤ ڕەفادا د بورە هەر فرەك د بەحشتێدا سەد هەزارە.

## قەلب موطمەئین کن

ژ ڤان کو قەلب موطمەئین کن گەلەك
تە نیشا خەلیلێ خودان تا فەلەك[١]

ژ ڤان زێدە بۆ نەبیێ ئاخر زەمان
ژ هەر مەلەکۆتێ ئەرض و هەم ئاسیمان[٢]

چەنان علێ غائین و لەولاکە ئەو
وەسان ل جوملە مەعلول گەراندیە ئەو[٣]

کەرامات و هەم موعجیزات بێ حیٚساب
تە دانە صالْحێن خۆ خیطابە ب کیتاب[٤]

ئەم ئاخر دەورن بن بێدەری
د طرسن ب رەحمەت ل مە نە نێری[٥]

---

(١) ژڤا تاعەت و چاکیا دلێ خوە گەلەك بسەکنی نن، تەهەمی نیشا حەژێکەرێ خوەدا هەتا فەلەکا ژی وەکە برنا عەسمانا.

(٢) ژ ڤان هەمیا زیدەتر بۆ قاسدێ داویا زەمانێ ژ هەر مەلەکوتێ عەرد و عەسمانا.

(٣) هەروەسا ئەگەر غایە، نەتوبیایی ئەو وەسان ل هەمی تشتێت دبێ ئەگەر و علە ژ وا هەمیا. پەسنێ قاسدێ خودا ددە. دبێژە ئەو ئەگەرا هەمی تشتایە، خودا دبێژە: (لولاك لولاك لما خلقت الافلاك).

(٤) کەرامەت و موعجیزە بێ هەژمار دانە مرۆڤێن چاك ئەوێن چاکێ خودا کو وەلینە و قاسدن. جارنا بهنارە ئاخفتیە وەکە مووسا، ژ هنارا پەرتووك رێکرنە و سحوفە و پەرتووکێن مەزن.

(٥) ئەم ئەڤێن هە بن بێدەرن ب کوردێ دگۆتن عەفارە. بی بێدەر ئەوا کو گەلاشی بۆ توز بوو. زادێ نەباش بوو. سەر کۆم هەبوو و سەر بێدەر بن بێدەر ئەو زادێ نەباش و کێر نەهاتی بن کۆم دبێژە ئەم د ترسن تو رەحمێ ژی ل مە نەکی.

ژ ئایەتا (لاتقنطوا) مە ئەمەل
هەیە ڕەحمەتێ کەلیێ بەد عەمەل[(١)]

د قورئانێ ئایاتێ تو بێ پڕن
عەفو و غەفور و ڕەحیم بهترن[(٢)]

هەچی نە موطیعێ خودایێ (ذي الجلال)
ل من نەزر بت وی نەکەم قەط هەڤال[(٣)]

تو خێر خوەشیی و مەنفیعەت من نەڤێ
ژ سوڵطان و پادشاهـ وی تو نەڤێ[(٤)]

ب من تو دزانی نە صاڵح و قەنج
دگەل ڤی ژی من قەط نە ڤی یێ نە قەنج[(٥)]

ئەمەل د من هەبن هندەك ئەخلاقێ پاك
ب عەفوێ تەمیز بم ب وان تابناك[(٦)]

---

[(١)] ژ ئایەتا [لاتقنطوا من رحمة الله] (الزمر: ٥٣) هیڤیا من هەیە کو تو ڕەحمەتێ بکی ل من ڤیێ بەد عەمەل. ئەز بهێڤیمە ژبەر کو ئەز ب هیڤیمە ژ ڕەحما تە.

[(٢)] د پەرتووکا پیرۆز دە ئایەتێن ژوڤان بوونێ پڕن وەکە عەفو و غەفوور و ڕەحیم و هنەك دی ژی ڕەحیم پڕترن. ئەڤ هەمێ جهێ کەیفخوەشیا مرۆڤن.

[(٣)] هەر کەسێ نە گوهدارێ خودایێ زیلجەلال بت ل من نەزر بت ئەز وی بۆ خوە نەکم هەڤال.

[(٤)] تو خێر و چاکی من ژ وی نەڤێ چ سلتان بت و چ پاشا بت ئەوێ کو تە نەڤێ من ژی ئەو نەڤێ.

[(٥)] تو ب من دزانی ئەز نە چاکم د سەر ڤێ ڕا ژی یێ نە قەنج من ئەو نەڤێت ئەز نە هەڤالێ وامە یاڕەب.

[(٦)] هەر هێڤیێ بدە من هندەك ئەخلاقێ باش من هەبن، یێن پاك بن ب لێبوورینێ ئەز پاقژ و پاك ببم دا ب وانا هەتا دگەهە ئاسمانا.

## داستانا قەلەم

تـەفضـەل كـەرم كـە (قـەلـەم) مـەڕحـەبـا
ل سـەر چـاڤێ مـن بيـی ب صـەد مـەڕحـەبـا[1]

موشـەڕەف بـتن ئـەم ب تـە ئـەی قـەلـەم
فـەضـل بـو تـەيـە ژ (علـم بـالقلم)[2]

چ خـۆش تـەرجمـانی ژ سـەرێ تـە قـەلـەم
عيبـارەت مـە تـەحريـر كـرن پـوڕ قـەلـەم[3]

سـەراسـەر د فـەرمانـدە سـەر سـەر قـەلـەم
ب قـاس ذەڕێ نـورێ ڤـەنامـە قـەلـەم[4]

ئـەز و تـو هـەڤـالێ يـەكـن ئـەی قـەلـەم
خـودا مـن ژ تـە دوور نـەكـە ئـەی قـەلـەم[5]

د ترسـم تـو دۆزێ ڤـەكـی ل مـن قـەلـەم
مـە عيشـێ حـەرام دا بـە بـەر تـە قـەلـەم[1]

---

(1) ب فـەرموو كـەرەمكـە قەلـەم خامـە مەرحـەبا ل سـەر چـاڤێ مـن وەری ب سـەد مەڕحـەبا، ژيـەكی ڕا كـەيفا مـرۆڤ گەلـەك وەرە مـرۆڤ دبێژيـێ: سـەد جـارا تـو بخێرهـاتی تـو سەرچاڤێ من هاتی. ئەوی ژی گەلەك حەژ قەلەمی دكر. ژێرا وەسا گۆتيە.

(2) ئەم ب تە پيرۆز دبن يا قەلەم سەركەڤتن و باشی بۆ تەيە ژ گۆتنا خودا كو دبێژە: [علم بالقلم] (العلق: ٤) من مرۆڤ ب قلم زانست دا يا وا.

(3) تو چقا وەرگێرەكا باشی ژ سەرێ تە وەرگێران دەردكەڤە، گەلەك خوەندن مە پێ نڤيساندنە ب قەلەم (بخامێ) پەسنێ وێ ددە.

(4) بەردەوام د فەرمانێدايە سەرسەرێ خوە خامە. هنگە زەرێن ڕۆناهيێ مەسەنا و سپاسی نامە سەر تەبن يا خامە.

(5) ئەز و تو هەر دووك هەڤالێ هەڤن و حەژ هەڤ ڤەنەكێ و دوور نەكێ يا قەلەم ژبۆ كو ئەز و تو ببێ هەڤ سەبر ناكن مە بێهنا خوە دايە هەڤدوو.

دۆزێ مــن نــەهــن ســەر تــە نــازك قــەلــەم
د ئــەمــرێ موطــاعی صــەوابــی قــەلــەم[٢]

خـۆزی صـەد خـۆزی صـەد خـۆزی ئـەی قـەلـەم
د عوقبــایێ ئــەم فرقــەدەیــن بــن قــەلــەم[٣]

مـەحالـە دگـەل بـەد عـەمـەل بـن قـەلـەم
فــەطــەهــر ئیلاهــی ڕەفیقــل قــەلــەم[٤]

د مــەیــدانێ دا ســەرســەرێ خــۆ قــەلــەم
کـەتـی ڕەقـص و جـەزبـێ تـەبـارەك ژ قـەلـەم[٥]

د ڤــێ تــەعــب و ڕەحتیــێ دا ئــەی قــەلــەم
ئـەز و تـو یـەکـن ئـەی ڕحـێ مـن قـەلـەم[٦]

هـا بـەرزەخ ل مـن دەرکـەڤـە ئـەی قـەلـەم
ژ پێتــا فیراقــێ چ کــم ئــەی قــەلــەم[١]

---

[١] دبێژە ئەز دترسم ڕۆژا ڕابووینێ تو دوزێ ل من ڤەکی یا خامە. مە کارێ نە باش دابێ بەرتە یێ حەرام یا قەلەم. وە نڤیسانا گارێ ربایێ و بەرتیلیێ و ڤەخارنا خەمرێ و یێن دی لێ کار من ب تە نەدانە کرن.

[٢]دوزێن من بخوە ل سەر تەنینن یا ئەوا نازك قەلەم، ئەز دزانم د فەرمانێدا تو کەمەر بەستی و ڕاستی یا قەلەم.

[٣] خوەزی سەد خوەزی یا قەلەم، د وێ دن یایێدا ئەم بهەڤڕە بوونا ژ هەڤ نەقەتا بوونا. قەلەم خامە.

[٤] نابە مەحالە قەلەم دگەل مرۆڤێ کارێ وی پیس بت. یارەبی تو من پاك بکی ئەوێ کو هەڤالێ قەلەمییە (المرء مع من أحب یوم القیامة) قاسدێ خودا گۆتیە مرۆڤ دگەل ویە ڕۆژ ڕابوونێ ئەوێ کو مرۆڤ ل ڤڕ حەژێ دکە.

[٥]خامە چاخێ نڤیسە دکەڤە داوەتێ ل سەر سەرێ خوە د مەیدانێدە د ڕقس و جەزبێ دایە پیرۆز بت بو تە یا قەلەم.

[٦]د ڤێ تەعبیێ و نە ڕەحتیێ دە یا قەلەم ئەز و تو وەکە هەڤن یا ڕحێ من یا قەلەم ئەز ژی ڕەنجێ دکێشم وەکەتە.

نـــزانم ل كـــودێ كـــەڤـــم ئـــەی قـــەلـــەم
د كتابـــا مـــــە دا چ نڤيســـــى قـــــەلــــەم[٢]

د دنـــێ ڕوح و ڕەيحـــانێ مـــن تـــو قـــەلـــەم
ل ســـەر دەفتـــەرێ شـــيرێ تيـــزى قـــەلـــەم[٣]

شـــبى تـــە تـــو ســـەر بـــڕو بهتـــر قـــەلـــەم
نـــە دى مـــــن ببـــڕن حرِوفـــان قـــەلـــەم[٤]

ل ڕاســـت و ل چـــەپ لێـــدخێ ئـــەی قـــەلـــەم
جـــەســـارەت تـــێ خالـــد و ڕوســـتەم قـــەلـــەم[٥]

تلـــێ مـــن دلـــەرزن مـــە بـــەس كـــر قـــەلـــەم
تـــــەبـــــارەك ل مـــــــن (علــــم بـــــالقلم)[٦]

قـــەلـــەم ديســـا ڕابـــە فـــەرمـــان ژ خـــودا
د ئـــەمـــرێ خـــودێ دا ب بـــبن جـــان فـــدا[١]

---

[١] ها نيزيكە دەرێ عالەما بەرزەخێ ناڤبەرا مرنێ و ڕابوونێدە، د بێژن: وێ عالەما بەرزەخێ ل من ڤەبە يانى مرن نيزيكە يا قەلەم ژپێتا ئاگرێ ژ هەڤبوونێ ئەزێ چ بكم ئەی قەلەم.

[٢] ئەی قەلەم ئەز نزانم ئەزێ ل كو بكەڤم يا قەلەم د پەرتووكا مە دە چ نڤيساندیە خێر پترن يان گەنەهـ ئەو ژى دەردێ گرانە، ژبۆ ئەهلێن خودا.

[٣] د دونيايێدە خوەشيا من و ڕەحانا من تووى يا قەلەم لسەر دەفتەرێ شورەكى دژى دبرى يا قەلەم.

[٤] وەكە تە تو سەبر وبێهتر ئەی قەلەم من نە دى تنە كو تيپا حوروفا ببرن يا قەلەم، بەرێ قەلەم ژ قامشى چێدكرن من ل بيرە شێخ سەيدێ جزيرى قاميشە يا موصل وەكە قەلەم دا باڤێ من ملا يووسف هنگى مالا مە ل گوندێ هێت مابوو.

[٥] ل ڕاست ل چەپ لێ دخى ئەی قەلەم وەكە مێرانيا خالد بن وەليد كو قورەيشيە و ڕۆستەمێ زال كو كوردە، تو وەكە وان جەسورى بى ئەی قەلەم.

[٦] تليێن من د لەرزن من نەمايە تاقەت ل لاشێ من دە، ئەڤەيە من بەسكريە ژ نڤيساندنێ يا قەلەم بەرزاهى بۆ وى بت ئەوێ زانست دايى ب قەلەمێ كو خودايە.

د بـەنـدێ قـەلـەم كـا صـەلاتـێ نـەبـی
ب تـــەركـــا صـــەلاتـــێ موجـــەزا دبـــی[2]

ژ عشـــقا تـــە مـــەدهۆشـــی بـــووم صـــەلات
د دەســـتانێ تـــە مـــن ژبیـــر كـــر صـــەلات[3]

ب عشـق و مـەحـەبـەت وەوە ب قـەلبـێ شـاد
موشـــرەف بـــبن ئـــەم ب ســـەلام و صـــەلات[4]

بـــەرابـــەر ب عیـــزەت عـــەظـــیم ئیحتیـــرام
ژ مـــە هـــەدیـــە بـــن بوونـــا (خیـــر الانـــام)[5]

صـەلات و سـەلام سـەر نـەبـێ وەك تـە ڤـین
وە ئـــال و صـــەحـــابێن ل وی د جڤـــین[6]

ب قـــاس ذرێ نـــۆرێ صـــەلات مـــە ب لـــەب
وە هـــەر یـــەك ب زمـــانێ تـــەڤـــان ڕۆژ و شـــەب[7]

---

[1] قەلەم دیسا ڕا ب فەرمان ژ خودا هاتیە بۆ كاری و شولی دڤێت ئەم جان فیدابن بۆ خودا ژبۆ كارێ وی ئەز و تو فیداییبن.

[2] د ڤێ بەندا هە یا قەلەمێدا كا مە سەلەوات نەدانە ل سەر قاسدێ خودێ ب نەدانا سەلەواتا ئەمێ بێنە سەزادان.

[3] ژ عشقا تە و ژ حەژێكرنا تە، ئەز بێ هش بووم، سەلەوات د دەستانا تە دە من ژبیركر ئەز سەلەواتا ل سەر تە بدم.

[4] تو ب عشق و محەبەت وەرە ب دلەكی ڤەكری ئەم موشەڕەف ببن ب سەلام و سەلەواتا بدن سەر قاسدێ خودا.

[5] ب هەڤرە بەرابەر ئێك و دوو ب عیزەت و ئیحتیڕام ژ مە یادیگار بن ژبۆ چاكترینێ مرۆڤا.

[6] سەلات وسەلام سەر قاسدێ خودا بن وەكە خودا بڤێت و ل سەر كەسو كارێ وی و هەڤالێن وی بن ئەوێن ل وی د جڤان و كۆم دبوون.

[7] هنگە زەڕەییێن ڕۆناهیێ سەلەوات مە ب دەڤ و هەر یەك ژ وا ب زمانێ ئەڤان ڕۆژ و شەڤ ل سەر قاسدێ تەبن.

(الهـــي فعظمـــــة بــــاعلاء ذكــــره)
(وانفـــاذ مـــا شـــرع مـــن وحـــي ربـــه)[١]

(الهـي وفــي العقبــى بتضــعيفى أجــره)
(وتشــفيعه فـــي الامـــة عنـــد ربـــه)[٢]

ژ ئەحسەنی تفسیرەین صەلات ل سەر نەبی
ئەڤە من ژ ئبن عابدین بۆ وە هەدیە بی[٣]

(الهـــي بجـــاهى) ســـولالا تـــەمیـــز
نـەبـی موصـطەفـا وە دائـو بـابێن عـەزیـز[٤]

ســبك كـــی تــو یووســف ژ بـــاری گـــران
ژ وان فاحشـێن د مـەحشـەری بـن عـەیـان[٥]

ســـتاركی مـــە حزبـــا خـــۆ یـــا مـــوئمنین
(وأنــــه لحســــرة علــــى الكــــافرين)[٦]

ب گونـەهـێن خـۆ ئـەم ئیعتیرافـی دكـن
ب عـــەمـــەل صـــالحی ئیختـــیلاط دكـــن[١]

---

(١) یارەبی تـو وی مـەزن و بلنـد بكـی گۆتنێن وی و بەحسـا وی كـرن ژی مەزنـە و ئـەوا وی كری شەریعەت پیك وەرە ژ وەحیی یا خودا.

(٢) یارەبی د ئاخرەتێدا خێرا وی چەند قەت بكی و تو شەفاعەتا وی د بارا ئومەتا وی دە لبا خودایی وی پەسەند بكی.

(٣) ژ رندیا هەر دوو تەفسیرا سەلەوات ل سەر نەبی بن ئەڤا هە من ژ پەرتووكا ئیبن عابدین ژبۆ هەوە من كریە دیاری.

(٤) یارەبی ب جاهی سولالا وی یا پاك مصتەفا و دی ئو باڤێن عەزیز.

(٥) تو یووسف باری وی یی گران ژ گونەها سڤك بكی ژ وا تشتێت فاحیشە ئەوین د مە حشەرێدە د بن عەیان، ژبۆ خوە دوعا دكە یارەب تو قەبوول بكی. د حەد یسێدا (أنا خيركم نفسا وخيركم ابا) هاتیە.

(٦) ستاركە مە حزبا خوەیا باوەرمەندا [وأنه لحسرة على الكافرين] (الحاقة: ٥٠) كافر ژی دبێژن رۆژا رابوونی خوەزی ئەم ژی ژ حزبا خودا بوونا ژ وە حەسرەت.

ئـەوان ب ڤـان دەفـع كـە بشـارەت تـە كـر
د قورئـــان بـــۆ مـــە ئيشـــارەت تـــە كـــر[٢]

مـە ئـوداء بـا بـێن ئـەمـەك پـوڕ ل مـە دان
وەكـى ڤـان ئـەسـاتيذێن دەرسـێن گـران[٣]

وەكـــى ڤـــانێ خـــارن تـــەبـــەڕوع كـــرن
دگـــەل ڤـــان بـــراييێن تـــەضـــەڕوع كـــرن[٤]

تـــو ئازادكـــە ئـــەهلـــێ قبلـــێ چونـــان
ژ ڤـێ حـەسـرەتـێ دلكوشـادبن ب جينـان[٥]

كوشـەد خـاكێ ئـادەم بـەهشـتێ سـەمـا
ل بـەر پـاى مـيم بـوڕجێ هـەيبـەت نومـا[٦]

كوشـــەد خـــاكێ ئـــادەم بوهوشـــتا بـــەرى
بـەلـى ب كـەعبـە و ڕەوضـا پێغـەمبـەرى[١]

---

[١] ئەم ب گونەهێن خوە ئيعتراف دكن دبێژن: مە گونەهـ كرنە ئەم گونەها كريارێن چاك تێكل يێك دكن هندەك خير هندەك گەنەهـ.

[٢] گونەهان ب خێرا ددنە لايەكى ئەڤا هەژى مزگينيە تە كريە د پەرتووكا پيرۆز بۆ مە تە ئيشارەت كريە [أن الحسنات يذهبن السيئات] (هود: ١١٤).

[٣] مەو داوو باڤێن كو گەلەك ئەمەك ب مەدابين وەكە ڤان سەيداييێن دەرسى گۆتين مە ئەو دەرسێن گران.

[٤] وەكە ڤاييێن خارن دايين مە ب خێرا خوە و بەلاشى ژبۆ خوەندنێ دگەل وا هەڤال براييێن خوە بۆ مە كێمكرين زارەزار كرين.

[٥] تو يا خودا ئازاد بكە ئەهلێ قوبلەتێ هەروەسا ژ ڤێ تنێ تيێ وەحشيتيێ و ژ ڤێ حەسرەتێ دلخوەشى بن ببەحشتيێ.

[٦] ئاخا باڤێ مە ئادەمى بكە بەهشتا عەسمانا ل بەر لنگێ موحەمەدێ وێ بوڕجا بلندا بترس با پادشاهيا.

ب سەجدە ئۆ مەزرەعەتیێ ئاخرەتێ
چونان داری تەکلیف بۆ خزمەتێ[٢]

داخازا مە هەر دەم ژ تە سەیدی
نیشانێن ئالهیەتی بۆ مە دی[٣]

ژ وجوودا مەئو هەم ژ ئافاقێ دی
تە حەق ئەم ببینن ئەزەل ئەبەدی[٤]

بەروداریێ ئیش و بەلایان دەما
ل ڕاستا تە بیتن خۆ نمزکە هەما[٥]

بلا ژ تە ب بورت سەلامەت ئەوە
ل بەر ڕانەبە تە سەلامەت ئەوە[٦]

نەبی فتنێ هشیار بکێ لەعنتە
ئاگر کەفتە ڕێلێ ب هشك و طەڕ کەتە[١]

---

[١] تو بکە یا خودا ئاخا باڤێ مە ئادەمی بەهشتا بەرین دیسا ب کەعبە ب ڕەوزا قاسدێ خودا ژێ تێدە بە.

[٢] دیسا سەجدەیێدا هەبە ئەڤ دونیایە جهێ چاندنا ئاخرەتێ بت و هەروەسا مالا تەکلیفێ و خزمەتێ بت.

[٣] داخوازا مە ژ تە یا گەورەم تو نیشانێن خودایەتیێ نیشا مە بکی کو تو چەند مەزنی عەفوا تە هەیە.

[٤] ژبۆ مە و ژ هەمی دوورێن دنێ و ئافاقێن سەماوی نەیێ حەق ئەم ببینن د ئەزەلدە و دئەبەددە.

[٥] بەروداریێ ئێشێ و بەلایان دەما ڕاستا تە هاتن خوە نڤز بکە نشکاڤە، هەکە تەژی ژێڕا خوە ئامادەکر ئەوە دبە فتنە و شەر، هەکەیەکی دار و بەر بلندکرن کو دانێ تە تو بەرسڤا وی نەدە بلا ملێ تە ژێڕە نڤز بە دا تو ژی و ئەو ژی ژ وێ بەلایێ ڕەها ببن. بلا تە دەست نە هلانی بت نە ژبۆ کێماسیە بەلکی شەرەفمەندیە.

[٦] بلا ئەو شەڕ ژ تە ببورە یا سەلامەت ژی ئەوە، تو ل بەر ڕانەبی. دەست ڕانەکی میرێ باشی ئەوە فتنیێ ڤەمرینە ئاگرێ وێ گەش نەکە.

دەمــا بــەشــەريــەت كــەتــە ڤــێ دنــێ
ژ هنگاڤ ڤـە ظـولم ئـاگر كـەتـە دنـێ[٢]

ظـــولم مالكـــە ل بـــەر دەرێ دوژەهـــێ
يـــەنـــار داغــە دونيـــا بســـرێ ناگـــەهـــێ[٣]

ژ حـەفتـى و سـێ فـەرقـان مـە يـەك سـونەتـە
ژيـــل وێ يـــەكـــێ باطـــل و بيدعـــەتـــە[٤]

د (شـــرح المقاصـــد) ســـەعـــد مێـــزەكـــن
دا حـــوكمێ ئـــەڤـــا نـــان بـــەرزە نـــەكـــن[٥]

يـــێ مـــوئمن د بوهشـــتێ يـــێ كـــافر دنـــار
ئـەڤـان هـەر دوو وان جهـ ئـەبـەد يـەك مـەدار[١]

---

(١) نە بـى هشيار بە فتنە ڕازايە هشيار نەك، ئەو كەسێ فتنێ هشيار بكە لەعنەت ل وى هاتيەكرن. ئاگر چاخێ دگرە ڕێهلى تەر و هشك پێكڤە د سۆژە، شەڕ دەمێ چێبوو مرۆڤ سووج لى و بێ سوج ب هەڤڕە بەهرەمەند دبن.

(٢) دەما مرۆڤ هاتنە سەر ڕووێ ڤێ دونيايەهە ژ وى چاخێ ڤە ستەم و زولم. دەركەت ئەو ژى ئاگرە كەتيە د دنێدە، كورێن ئادەم قابيل هابيل كوشت. ستەم ل برايێن خوەكر.

(٣) ستەم، زولم مالكێ بەر دەرێ دۆژەهێيە (مالك ناڤێ وى مەلەكێ بەر دەرێ جەهنەمێيە وەكە چيايێ د شەوتێيە. پەيڤەكا توركيە، ستەم وەسايە دونيا برێڤە چوونێ ناگەهێ.

(٤) ژ هەفتێ و سێ فرقا يەك ژ وا خەلكێ سونەت وجەماعەتێنە، ژبلى وێ يەكێ يێن دى هەمى بەتالن و بيدعەنە قاسدێ خودا دبێژە يەهودى بوونە هەفتێ و يەك، فەلە بوونە هەفتێ دو يێن من مسلمان دبن هەفتێ سێ فرڨە، يا خلاس بوويى يەكە ئەو ژى ئەوە ئەز و هەڤالێن من ل سەرن.

(٥) د شـرح (المقاصـد) يـا (سـەعەد)ى مێزەكن هـونێ حـوكمێ ڤـايێن هـە هـەميا ببيـنن نەبەرزەنـە د وێ پەرتووكێدا ژ ڤـا فرقـا هـەميا ئاخافتيـەكا حـوكمێ وان چيـە د مسلمانييێدا گۆتيە.

فاســـق و موبتـــەدع دێ جـــەزای وان دەتـــێ
ب ئیمـــانێ دیســـا دچـــن جـــەننـــەتـــێ[٢]

ب بـــوغض و عـــەداوەت د عـــەلـــەهـــی ئـــەڤـــان
لـــــە و ألیـــــە نـــــەبـــت مـــــە بـــــۆ ڤـــــان[٣]

جومهـــور گۆتیـــە یـــا صـــەواب واجبـــی
ب ڤـــا چـــار مـــەذهـــەبـــان ڤـــە موقـــەلـــەد ببـــی[٤]

ژ ڤـــێ چـــەورێ جـــەوره نـــەبـــێ دەرکـــەڤـــین
ئـــــەڤـــــە رێ ژبـــــۆ ڤـــــی برایـــــێ ئـــــەمـــــین[٥]

---

(١) یێ باوەرمەند دێ هەرە بەهشتێ یێ بێ باوەر کافر وێ بچن دۆژەهێ، ئەڤ هەر دوو وارێن وا جهێ وا دیارن ئەبەدینە دجهێ خودەدە.

(٢) یێ فاسق گونەهـکار و ئـەهلی بیـدعیێ وێ خودا سـەزایێ وا بـدەیێ ب ئەگەرا باوەریێ ئیمانێ وێ دەرکەڤن بچن بەهەشتێ تم و تم نامینن د ئاگردا.

(٣) ب عـاجزی و عـەرن ونـەیارەتی دژی ڤـانـا، ژێـرا یـان ل سـەر نـەبت مـە ژ وارە. کۆمـا ئومـەتی گۆیننە یا ڕاست واجب ب ڤا چار مەزهەباڤە گریداییین.

(٤) ئەڤ مەزهەبێن شەریعەتێ شافعی و حەنـەفی و مـالکی وحەمبـەلی، یـا ڕاست ئـەوە ژبۆ مـە ئەم خوە یەکی ژ وا بگرن.

(٥) ژ ڤێ چارچوڤێ دەرکەتن ستەمە دڤێت مرۆڤ دەرنە کەڤە، ئەڤە ڕێ ژبۆ برایـێ ئـەمینی ڕا، ژبـەر د درێژاهیـا ئومـەتا ئیسـلامێدا زانـایێن گەلـەك مـەزن ڕابوونـە ل دوڤ ڤـان مەزهـەبا چوونە،حاشا ئەو نە نەزان بوون.

# حەمەد و ثەنا

حەمد و ثەنا ژ خودا را دەلیلە بۆ حەیارا

عەفوێ ددە سوکارا ب وان ڕا مە ژی عەفوکە[١]

ب تەوحید و شەهدێ کافری عەفو دکە ژ ئاگر

موئمن هەنە کەبائر بەر عەفوێ پوڕ بچووکە[٢]

فەضل نەبت صەغیرە ب عەدلێ دبت کەبیرە

عەکسا ئەمر کەبیرە ل بەر فەضلێ پوڕ کوچکوکە[٣]

تەقوا سەنا و سلوکە بێ پیرە بێ مولوکە

یێ ئەو نەبت لەظایە گەر میرە گەر بلوکە[٤]

حەقیقەتا مە هۆرە ژ ڕەیبێ د ڤێ ببوورە

ئیمان تەصدیق و (علم الیقین) بێ شکوکە[٥]

چیا ڕەسول دامەژ ئیجماعێ یا گەها مە

سەمع و ئیطاعە فەڕضە ڕەدە کوفرە گەر چ موکە[١]

---

(١) سپاسی و شوکر بۆ خودا کو دەلیلە ژبۆ مرۆڤێ حەییری مرۆڤێن سەرخوەش ژی عەفو دکە یاڕەب. ب وارا مە ژی عەفو بکە و ل مە ببوورە.

(٢) دەمێ ب یەکیتیا خودا باوەرکر و شەهدە ئانی کافر ژ ئاگری عەفو دکە، باوەرمەند گونەهێن وا یێن مەزن ل بەر عەفوا خودا گەلەك بچووکن نە زەحمەتە ل وا ببوورە.

(٣) هەکە کەرەما فەزلێ خودا نەبت یان خێرێن زیدەبن خێرێن بچووك ب عەدالەتا خودا دبن یێ مەزن، گونەهێن مەزن ل بەر فەزلێ خودا گەلەك بچووکن.

(٤) ژ خودا ترسی شووڕە و ڕێکە بێ یەکی ژ ئەوا مەزنی پێك نایێ کەسێ ئەو سلوك نەبت جهێ وی دۆژەهە و ئاگرە بلا میر بت ملووك بت، د ڤێ ژ خودا بترسە.

(٥) حەقیقەتا مە مسلمانا کورە و دوورە و هوورە دڤێت شك تێدا نەبت، باوەری ئیمان ڕاستیە، صەدقە، و زانینە و باوەریە بێ شك وشوبهەیە ژ دلە.

ئیمـان چڤـا ب خـوەیـی بـە دێ زێـدەکـە گـولا گـەش

وە گـەهـ نـەدێ ضـەعیف بـە (ڕەدت) بـێ دێ مـەحوکـە[٢]

زمـان ژ دەڤ نـە بـەردە ب هــەر تیشـتی گــەر خـەبـەردە

تـە د کێشـە ئیرتیـدادیێ ئـەعـدا عـەداکـە فوکـە[٣]

ئـەعضـا عیتـاب ل زمـانی کـوفر و ئیرتیـداد تـە ئـانی

دۆزا ئــەڤــان دۆزە ســەر هــەر شــەشــان ســەروکــە[٤]

صـەڵات و سـەلام سـەردمـە مـە هـەدیـە بـەر موحـەمـەد

ئـال و صـەحاب و ئـەهلێن ل پـێ ڤان سـەیـر و سلووکە[٥]

---

[١] چ تشتا قاسدی خودا دامە ژ کۆما زانا گەهایە مە نە د هراویرا هاتیە گۆتن. گوهداری کرن و بەیانکرن فەرزن، کو یەك بێژە نە وەسایە کوفرە بلا چەند کێم و هندەك بت ئەگەر وەکە مویە کر ژێ بت.

[٢] باوەری چەند بێتە خودانکرن وا زێدە ببە وەکە گولێ هەر وێ گەش ببە هەکە نەهاتە خودا کرن ب تاعەتی وا زەعیف و ژار ببە ژ خوە هەکەر ددەت هات ژ خوە مەحو دبە و ژ ناڤ دچە.

[٣] زمان د دەڤدەیە نە بەر دە بلا هەر تشتی نە ئاخڤە. ئەو یێ تە بکێشە مورتەدیێ و دین بەردانێ، نەیارێ ژ هەمی نەیارا زۆرتر بۆ ئەزمانە.

[٤] هەمی پارچێن لاشێ ئینسانی گازندا ژێ دکن دبێژن زمانی تە مورتەدیێ ب سەر مەدە ئانی تو ژ ئایین دەرکەتی، ئەم ژی ل پێ تە هاتن، دوزا ڤا دۆزە سەرۆکێ هەر شەشا زمانە ئەو چاوا بکە ئەوێن بندەستن، هەر دوو چاڤ هەر دوو دەست و پێ شی و پاشی.

[٥] سەڵات و سەلام ل سەر مە دەوامی هەدیە بن سەر موحەمەد و ئال و صەحابابن و ئەم ل پەیی ڤان دچن و ل سەر رێێ وانە.

## موعجیزه و موعەما

دەورا مە کورە ئەما قورئان مە نورِ عەما
چ موعجیزه و موعەما بۆ عالەمێ ژ ژۆره[1]

د عالەم سەرائی (الندوة) تێ مەعریفه و حیکمەت
بۆ عاقلان چ سەروەت ژ یێ بێ مەژی چ دۆرِه[2]

(ولیس في طاقة العبد الاحاطة بل)
(اعراض في مصحف الله فحار العقل) [3]

نەظەرِ دە ئایەتا (ما فرطنا في الکتاب)
من شیء) وەهـ خەزینه بێ غایه کوور و هووره[4]

دەواما زەمانی چقا هەبیتن
دێ موعجیزێ قورئانێ هەر نوبتن[5]

---

[1] دەور و زمان یێ ئەم تێدا کوره نابینه لێ قورئانا مە رۆناهیه بەلێ چ موعجیزه و تشتەکی نه دیاره ژبۆ عالەمێ ژ ژۆر هاتیه.

[2] د کەونێده سەرا ئاشووریه تێدا زانین و حیکمەت هەیه، ژبۆ مرۆڤێن ب عاقل سەروەتەکا مەزنه، ژیێ بێ عاقل را دووره هشێ ناگەهیێ.

[3] نه د شیانا عەبدێ دایه و تاقەتا وی ناگەهێ کو کاریه هەمیێ بزانه، بەلکی غەدره د قورئانێده یا خودا هەیه عەقل ما حەیری.

[4] تەماشه ئایەتا [مافرطنا في الکتاب من شيء] (الانعام: ٣٨) مە چ تشت نەکری د پەرتووکێدا نەهێلا هەمی هەیین تێدا هەنه. یا دەفینەیه خەزینه، گەلەك و گەلەك هووره وکووره، کەس ناگەهه بنێ وێ.

[5] چقا دوما زەمانی بێت، هەروەسا موعجزێن قورئانێ ژی و یێ بێن وەکه خودا دبێژه: (ددەمێ هەوه زاد دروو زەکاتا وی بدن). د دەمێ درۆنێدا بەریێ زەکات ژێ نەددان حەتا

بـــارانی ب زوور و ب زەحـــەفـــی نـــەدە
دێ بێـــژن بـــەخیلـــە نکـــارە بـــدە[1]

قـــەضـــیی جـــەواب دە چـــەنـــم ئـــەی چـــەنـــم
(حفالـە) ئـەمـن یـی چـووی ئـەسـمەر گـەنـم[2]

ل مـــە ڤـــان سـەفیهـــان تـــو ڕەحمـــێ نـــەكـــی
حوفالـــەت و بـــن بێـــدەرن دێ چكـــی[3]

ب تـــەوبـــەك نـــەصـــوح تـــو تـــەفـــەضـــل بكـــی
دەرێ عـــەفـــوێ و ئـــازادیێ ل مـــە ڤـــەكـــی[4]

دێ ئـــەم بـــن حـــەقیقـــی وە قـــەنـــدێ شـــەكـــر
دەمـا ل پـەی نـە قـەنجیێ خۆ قـەنجێ مـە كـر[5]

گونـــاهێن مـــە چـــەنـــدان گـــران بـــێ حســـاب
د میزاینـــا عـــەفـــوێ نـــە بـــوون یـــەك مكـــاب[6]

---

سافی ب كرانا. هۆ هەر د ڕۆژێدا دەڕاسە زادی د درو و دڤێت زەكاتا وێ ژێ بێتە دایین ئەڤ ژ وا موعجیزێ قورئانێیە ئو بوویە.

(١) بارانا ڕەحمەتێ هەكە تو نەدی ب زۆر و زەحفی ئەوێ ژ خودا نەترس دێ بێژن خودا بەخیلە بارانێ نادە. دێ وەرە ل ڤێ قەزیێ تەماشە بكە.

(٢) یا دەڤێ من دێ بەرسڤێ بدە. بن بێ ڕۆن عەفارە ئەم بێن چوویین گەنمێ سۆرن.

(٣) هەكە تو ڕەحمێ ل مە ڤان نەزانا و عەقل سڤكا نەكی، ئەم عەفارە و بن بێدەرین ما ئەمێ چ بكن چ ژ مە تێ.

(٤) ب توبەك نەصوح تو كەرەم بكە و دەرێ عەفوا خوە و ئازادیێ ل مە ڤەكە یارەب.

(٥) هەكە تو وەسا بكی ئەمێ هنگی ببن ڕاستی حەقیقی نەبن بێدەر و عەفارە و ئەمێ ببن قەندێ شەكر، دەما ل دوڤ نە قەنجیێ ئەم نەكەتن و قەنجی وچاكی مە كر، وێ دەمێ ئەمێ ژ باشا بن.

(٦) گونەهێن من چڤاس گران بن و بێ هەژمار بن. د میزانیا عەفوا تە دە نابن یەك میكاب ل بەر عەفوا تە سڤكە.

گەلەك كێم و كاسی و قصوور مە هەنە
گەلەك سەهـ و نسیان غورور مە هەنە[1]

مە هیڤی ب رەحمەت خودا ب یەك نەظەر
عەفوكە مە عەبدێ ژ دەردێ گوذەر[2]

مەفەر و مەقەر من نەما درووێ خاك
مە شەهدە و تەوحید ب تە ذاتێ پاك[3]

ئەمەل من تو دوور بكی من ژ نار
تەفەضەل ئەیا جار من ئشتەجار[4]

ب عەفوێ مە ناسی تو عەفو نامەیێ ب من دە
عوذر نامەیا جەهلێ جەزایێ د بەرمندە[5]

ل نك قەدەریا تەمەنی جەنەتی
عیبادەت و طاعەت حەقە دەتی[1]

---

[1] ئەز دزانم گەلەك كێموكاسی من هەنە گەلەك خۆ ژبیركرن و قوسۆر ژی من هەنە ئەز گەلەك جارا سەر خوە ژێ چوومە. خرڤامە.

[2] لێ مە هێڤی ب رەحمەتا خوە تەماشەكی ل مە بكە مە ڤی كولێ ژ گونەهێن بوورین عەفو بكە یارەب

[3] رەڤا مە و وارێ مە نەمایە ئەز خوە بەس پێرمێ كەس نینە ئەز خوە پێ بگرم ل سەر روویێ ئاخێ یارەب. مەشەهدە و یەكیتیا تە و بزاتیێ یێ پاك باوەری پێ مە ئاینە یا خودا.

[4] هیڤیا من ژ تە یارەب تو من ژ ئاگری دوور بكی، كەرمكە یا جیرانێ كو هەر كەس جیرانەتیا وی داخواز دكن، پەناهـ هەر تووی یا خودا.

[5] مە تو ب عەفوێ ناسكری تو ناڤ بانگی ب عەفوا تو گەلەك لێ د بهوری ل گونەهێن كو لەیێن خوە. هەجەت عوزۆر نامەیا نەزانینێ ئەڤە د بەرمندایە وەكە بەر بەژنێ، من كریە دەستوكورا خودە ئەز رابەری تە دكم دا تو من عەفو بكی.

عـەكسـا قـەدەرێ مـەذهـەبـێ جـەبـەريـان
عيبـادەت وەسـيله ل نـك سـونيان[٢]

كـەفـا مـەعـرەضـا ئايـەت و (وابتغـوا
اليـه الوسـيلة) (وقـل اعملـوا) [٣]

د نـەهجولئـەنامـا خـەليلـێ مـەتـێ
تـو نـاچێ بـەهشـتێ سـەبـەب طاعـەتـێ[٤]

ولكـن بواجـب أمـر الا لـه
أقيمـوا الصـلاه وآتـوا الزكـاة[٥]

ژ هـر پێڤـه مـن ل خـۆ نـەذركـر كـو ئـەز
ژ دەرێ ئيسـتيجابێ نـه ڕابـم ڤـه ئـەز[٦]

ب كـار كـار و زار زار بكـەڤـم لاڤيـان
وەكـی بلبلـێ گـول و سـەڤـدانيان[١]

---

[١] لبا مەزهـەبێ قـەدەريا كـو دبێـژن چوونا بەهشتێ گرێدايە ب قەدەرێڤە نەك ب تاعەت وعيبادەتڤە. عيبادەت وتاعەت حقە د دتێ.

[٢] جەبری دبێژن: ل سەر خودا واجبە مرۆڤا ببە بەهشتێ. لبا مە ئەهلێ سونەت و جماعەتێ عيبادەت وەسيلەيە بۆ چوونا بەهشتێ هەكە نەخوە بێ وێ ژی خودا دكار و بڤێت وێ مرۆڤی ببە بەهشتێ.

[٣] ئەڤ ئايەتا هە بەسە بۆ دانينا بەرچاڤی خودا دبێژە: داخواز بكن بال خودا ڤە ب تاعەتی خودا دبێژە عەمـەلی بكـن خـودا وێ عەمـەلێ هـەوە ببينـە، عەمـەل دبـە وەسيلا چوونـا بەهشتێ.

[٤] د (نهج الانام) يا سەيدايێ مەلا خەليلێ سێرتيدا هاتيە سەبەب تاعەتی تو ناچی بەهشتێ.

[٥] لێ ب فەرمانا خودا كو واجبە دبێژە نڤێژا بكن و زەكاتێ بدن، ئەم د ڤی بكن تاعەت ژبۆ ڤێ فەرمانێ كرنا وی واجبە نە ژبەر چوونا بەهشتێ.

[٦] ژ نهو وێڤە من ل خوە كريە نەزر من پەيمان دايە كو ئەز ژبەر دەرێ داخوازا بەرسڤدانێ نە ڕابم، ئەزێ ژ هەر ژ خودا بخوازم عەفويێ.

ب ئـەسـمائێ حوسـنا موحـەسـەن کـە مـن
ژ رجسـا گونـەهـان موطـەهرکـە مـن[2]

تـو دینـێ مـە نوکـە ب تـەوبـەك نـەصـۆح
ئـەبـەد ئـەم ثـەنـاکن ب جسـم و ب ڕۆح[3]

ژ تـە ئـەڤ نـە گـەلکـە تـو قـەیـومێ عـام
سـەفیهـی عـەفوکـە ژ فیعلـێن حـەرام[4]

ژ مـەهـدێ زەمـین غونجـەیـەك ڕەحمـەتـێ
ل سـەر وی ب ڕێـژە ب فـەضـلا خـو کـێ[5]

دزانـم خـەطـا و سـووج مـە نـائێن حـەدێ
وەلـی نینـە پـێ بـی تـەوبـێ نـەدێ[6]

غـەریقـێ گونـەهـان بـە سـووج و خـەطـا
ئـەمـاری ب مـن کـر د جهـ نـەمـەطـا[1]

---

[1] بکارەکار و زارەزاریم بکەڤم لاڤا و هێڤیا وەك بلبل بۆ گولێ سەودایە، ئەز ژی وەسابم ئەز ژی سەودالیمە بۆ خودا.

[2] بخاترێ ناڤێن خوەیێن چاك بکی من ژ پیسیتیا و گونەهان پاك و پاقژ بکی.

[3] تو ئایینێ مە نوو بکە ب تەوبەك نەصوح، ئەمێ ئەبەدی بۆ تە سەنایا بکێ ب ڕح و لاشێ خوە. و سپاسیا تە بکن یا خودا.

[4] ئەڤاهە ژبۆ تە نە گەلەکە کاروبارێ ڤێ عالەمێ تو سەروبەر دکی بێ هشەك وەکە من عەفوکە ژ کریارێن پیس و حەرام.

[5] ژ ناڤا ڤێ عەردا هە بشکوژەك ژ ڕەحمەتا خوە ل سەر وێ دە بریژە ب فەزل و کەرەما خوە یارەبی.

[6] ئەز دزانم خەلەتاهی و گونەهێن من زۆرن نایێنە ژمارتن. لێ نینە ئەو کەسێ بلنگ وەرە دەرگاهێ تەوبێ ژیرا نەبت و تو نە دیێ.

مە دەست بەر دوعا مە ژڤێ کەربلائێ
خلاص کە ب ئیمان مە نەفس نائێ ڕائێ[٢]

گەدێ تە نزان بۆ کەتە موشتەها
نە نێری ل پاش ڕۆژوڤان دۆژەها[٣]

تو عەفوێ نەدێ من حەیاتم زیان
ئەمان صەد ئەمان ئەمان صەد ئەمان[٤]

ئیلاهی ب جاهێ نەبی موصطەفا
عەفوکی مە شەرمەندە ئێ بێ وەفا[٥]

ژ فقهێ نە دەرکەڤە نەچە قیل و قال
موخالف نەچە صونعێ ئەهلێ ضەڵاڵ[٦]

شەریعەت چوو دەریایێ ئەز ئابێ پوڕ
طەریقەت سەفینە حەقیقەت چ دوڕ[١]

---

[١] ئەز د گونەهادە خەنقیمە ب ئەگەرا سووجا و بێ ڕێزیا نەفسا ئەمارە ب من کر ئەو ژی د جهێ خوە دە نە ڕاوەستا. مەتا و ڕاوەستا سەکنی پەیڤەك کەڤنە جارێ د گۆتن مریشك ل سەر موتکێدا متایە.

[٢] دەستێ مە ل بەر دوعایە مە ژ ڤێ کەرب و بەلایێ ڕەها بکە ب ئیمانی و باوریێ نەفسا مە نایێ ڕایێ یانی تەسلیم نابە د گۆتن عەمرێ گوزی نایێ ڕایێ.

[٣] گەدێ تە نەزان بوو ل جهێ ژۆرێ ل سەرهەدا د گۆتن: مرۆڤێن لاو گەدە. کەتە دویڤ ڤیانێن نەفسێ ل پاشی ڕۆژا خوە تەماشە نەکر کو هەمی دۆژەهن و ئاگرن.

[٤] هەکە تو من عەفو نەکی حەیاتا من زیانە و زەڕەڕە، هاوارا من تو وی سەد هاوار سەد هاوار.

[٥] یا خودا بخاتر و جاهێ موحەمەد مصتەفا کی، من عەفو بکە ئەز مرۆڤەك شەرمەندەمە ئەز ژبۆ تە بێ وەفا مە دەربارێ تەدا یارەب.

[٦] ژ شەریعەتێ دەرنەکەڤە نەچە قیل و قالا نەبە موخالف بۆ شەریعەتێ ژبەر کو ئەوە ڕاست و دورست.

عومر هەشتییە هێژ ئەمارەئێ
دەهـ دەهانە خلاصم ژ حەیاصێ[2]

ل دەرێ تە مرادێ دیسا نامەیێ
عەرظێ تە بکم ئەز ژ ڤێ بادەیێ[3]

ژ جەزا ئەڤیا دووژێ مە پیرێ ئەسیف
حفظکە ژ فیردەوسێ من یەك مەسیف[4]

مە رۆژنامە دارا عومر دی میثال
ب ڤان زەرخەزامان ب لەز چوونە سال[5]

عومر ما قەدرٍ و مەتاعێ دنێ
عومر بوونا عوقبایێ ئاڤیتە دنێ[1]

---

(١) شەریعەت وەکە بەحرێیە، دەریاییێە، ئاڤەکی زۆربت، تەریقەت گەمیە حەقیقەتە وەکە دورپییێە، ئەڤ هەر دوو ژ هەڤدوو نا ڤەقەتن.

(٢) عومرێ من بوویە هەشتێ سال دەمێ ئەڤا هە نڤیساندی ژیێ وێ هەشتێ بوو دبێژە: نەفسا ئامارە هێ ژێ وەیە د دەهـ سالیا دەیە. دەهـ دەها وێیەکا ئەزێ چاوا ژ ڤێ بێ حەیایێ ئەزێ خلاس ببم. ئەگەر یەك بێ فهێد بوویا دگۆتنێ بێ حیا حەیاسە کەمەرەك بۆ ژ زیڤ دهاتە چێکرن ژنا ددا پشتا خوە. ژن نە پشت ڤەکریبوون، ژن پشت ڤەکری شەرم بوو، پشتك ل پشتا وا بوو شەرمی و فهێتی هەبوو.

(٣) ل دەرییێ تەیێ مرادێ دیسا ناما خوە ئەزێ عەرزی تە بکم ئەز ژی عشقێ و ڤیانێ تێمە بەردەرێ تە یارەبی.

(٤) ژ سەزادانی ژ وا عەدەتا ژ ڤی پیرەمێرێ کال ژێرە ب پارێزە ژ بەحشتێ بۆ من یەك بەسفکە کی. مەسیف. ئە بەرەهێن دەرێ وا ڤەکرینە، بەشکەڤتن دبێژن وا مەسیف. یان نەسیف. هەر دوو ژی هەن، بەرنڤان.

(٥) مە رۆژناما عەمری کرە مەسەلە بۆ خوە ب ڤان خەزامێن زەربوویڤە داویا پاییزێ بەلگ زەرٍ دبن ژ وارە دبێژن خەزام، عەمر ژی کو دچە داویێ سەر و رهـ ژی سپی دبن، بلەز سالٚ دچن.

عـــەجـــەب هـــەروو كورســـيكى ژێ هلـــدكى
تـــەزێـــر و زەبـــەركـــر چ غـــەدرە دكـــى[٢]

مـــە جـــان بـــەرفـــە دەور ئافتـــابێ تـــەممـــۆز
دەر ئـــان مـــودەمارانـــە نـــەمـــان ســـالْ و ڕۆز[٣]

بـــزان صـــوفيێ صـــاف كـــورێ وەقتـــێ خـــۆ
عـــالم دێ وەصـــابە ژبـــۆ وەقتـــێ خـــۆ[٤]

د قورئـــــانێ (أنـــــي قريـــــب أجيـــــب)
دەمـــا ئـــەم دوعـــاكێ ژ مـــە ڕا يوجيـــب[٥]

ب (فليســــــتجيبوا لـــــــى) فـــــأتميروا
ببيـــــع مــــن اللـــــه (فاستبشــــروا)[٦]

---

[١] عەمر ما تشتەك وەسا بە وەكە قەدر و قيمەتێ پەرتالێ دنێيە عوهمر ژبۆ ئاخرەتێ ڕا ئاڤێتيە دونيايێ سەبا وێ كر.

[٢] گۆت عەجێبە هەر و ژ كورسيەكى ژ ديوارێ خانيێ عەمرى دەرتينى تە زێڕ و ڕەبەركر دێردەخان بۆ ئەڤە چ غەدرە تو پێ دكى دونيا وەسا ل مە دكێ.

[٣] جانێ مە وە كە بەفرێيە يانى عەمرێ مە. دوور و زمان ژى وەكە ئاڤا مانگاتير مەهێيە دژوارە د ڤێ دەمێ كورتدا دحەلينە سال و ڕۆژ نامينن.

[٤] بزانبە سوفى يێن ساف و ڕاست كورێ دەمێ خوەيە هايێ وى ژێ هەيە ناهێلە دەمێ زكرێ دەرباس ببە. نەخوە مرۆڤێ زانا و عالم دڤێت ئەو ژى وەسا بت ژبۆ دەمێ خوە بەلاش دەرباس نەكە خۆسارەتە.

[٥] خودا فەرمان دكە دبێژە موحەمەدى هەكە پرسا من ژ تە كرن. ئەز نيزيكم داخوازێ داخوازكەرا قەبوول دكم دەمێ گازى من بكن، بلا داخوازا قەبوولێ ژ من بكن و باوەريێ ب من بينن ئەوێن چاك بن.

[٦] د پەرتووكا پيرۆزدا دبێژە: ئە نيزيكم ئەو قەبوول دكم، چاخێ ئەز داخوازا بكن ژ مەرە قەبوولە. ب [فليستجيبوا لى] (البقرة: ١٨٦). موشا وەرەنێ بكەن ب (ببيع من اللە) (مزگينى هەيە خودا دەمێ بڤيت شولەك ببە).

خودێ مە دەما ب ڤیتە ئەمرەك ببە
عەقل دێ ببە داكو ئەو عیشی ببە[١]

خودایێ ل فراعینا دەر قەت نەگرت
ژ ڤێ مۆئمنی حوسن و ظەن بۆ خۆەگرت[٢]

چنان دەر حەدیثا نەبی ژی هەیە
(أنا عند ظن عبد بي) وەیە[٣]

چەنا بێ وەفا قەلە دەلە ژ ڕەب
ب زمانی و لێڤان ذکری کە ڕۆژ و شەب[٤]

د ڤێ سەجدە گاهێ د ڕوویێ زەمین
یێ تو ل سەر وی دانی تو هەر وێ بخۆن[٥]

ژ ژۆرێ تە باڤکێ مە یێ ئادەمی
سەیەلانا هندێ بۆ وی کر گەمیی[٦]

---

[١] خودا دەمێ بڤێت شولەك ببە، عەقل دبە ژ سەری مرۆڤی دا قەنە ئەو شول ببە دبێژن: عەقلێ فلان کەسێ نە ل سەرێ وی بوو لەو ئەو شول کر.

[٢] خودا دەرگەهێ تەوبا خوە ل فیرعەونا ژی نەگرتیە. ژ ڤێ یەکی، مۆئمنی هزرا خودا یا باش بۆ خوە گرت.

[٣] د حەدیسێدا ژی هەیە خودا دبێژە ئەز لبا هزرا عەبدێ خوەمە، ئەو هزرا ئەو ژ من دبە ئەز وەسامە.

[٤] یا چەن دەڤ ئەوابێ وەفا هندەك بت زکرێ تە لێ ب واستە بت ژ خودا ب زمان و لێڤان زکر بکە ڕۆژ و شەڤ نە ڕاوەستە.

[٥] د ڤێ وارێ هە یێ سەجدێدا کو ڕووێ زەمینە ئەوێ تو ل سەر هاتی دانین تو هەر ناڤێ وی بخۆ نە زکرێ وی بکە.

[٦] یا خودا تە ژ ژۆرێ باڤێ مە ئادەم ئاخا هندێ بۆ وی کر گەمی کەتە سەر و سەر ڕووێ دنێ، گەرا دبێژن: دەمێ باڤێ ئادەم ژ بەهشتی هاتە ئاڤێن ل عەردێ هندێ سەر دنێ کەتیە.

ل هەوائێ مە دەیدك نەسیمێ چیا
حۆڕانێ بەهشتێ ل سەر ئێویا[(١)]

مە حەمد و ثەنا ئاسیا مە ڤەدا
ب کەیف و صەفاییێن ژ وێ ڕزق ب مەدا[(٢)]

تەبارەك ژ تە ئاسیا هەمیێ ئەنبیا
میرئاتە ڕادار و نۆرێ چیا[(٣)]

ل سینا سەناء و جەمالا خودا
موسا لێ کەلیمە تەوڕات بۆ وادا[(٤)]

ل صەخرە عروجە لاقصی ئینتیخاب
ل ناڤ کوما نەبیا موحەممەد هەلبژارت[(٥)]

د فیلمێ بەهشتێ تەژی قود سیات
وەکی وەحی و قورئان شەهدە و صەلات[(١)]

---

(١) ل ژۆر مە دەیدکە دونیا وەکە دەیدکێیە د هەژە، چیا ژی پێرا د هەژن، نەسیم و هەوایێ چیا حوریێن بەهشتی ل سەر ئێورن، هندە خوەشن.د

(٢) مە سپاسی و شوکر ل قارا ئاسیامە ڕۆژێ ڤەدا ب کەیف و سەفایێ، ژ وێ مە بو خوە ئازوقە و ڕزق ڤەدا.

(٣) ئاسیا تۆ پیرۆزی هەمی ئەنبیا ژ تەرا بوونە، تو وەکە نەینکێ یێ تو ڕادار و ڕۆناهیا نورها چیایی.

(٤) ل دەڤەرا سینا ڕۆناهیا جەمالا خودا ل سەرێ چیایێ تور و سینا خۆیا کر چیا هەڕفی و حەلیا د دار زەیتونێدە جەمالا خودا خۆیاکر. نەبی مووسا ل وڕ ب خودا ڕە ئاخاڤت و خودا پەرتووکا پیرۆز تەورات دایە وی.

(٥) ل بەیتولمەقدسێ قاسدێ خودا موحەممەد مصتەفا چوو سەر بەری و بلندی ئاسمانا بۆ شەڤا چووی میعراجێ. و د مزگەڤتا ئەقصا دە ژلایێ هەمی نەنبیاڤە هاتە هەلبژارتن بۆ پێشنڤێژێ وا. ئەڤێن هە هەمی ل کیشوەرێ ئاسایا هەنە و گەلەك دی ژی وەکە ڕاوەستانا گەشتیا نوحی و ساڕبوونا ئاگرێ ئیبراهیم (سەلام لێبن) چیایێن پیرۆزێ جودیێ مرادا زیارەتگاها قەومێ گۆتی پیشێن کوردا بوون.

ل ڤێ (كعبة الله) ڕوكن و مەقام
بەرێ ڕەش و زەمزەم و (باب السلام)[٢]

حەطیم مولتەزم حجریا ئیسماعیل
مەقامێ ئیبراهیم ئەسرا جبرائیل[٣]

یەمین و معاهدە یا حاجیە
بەرێ ڕەش یەمینە خودێ دانیە[٤]

وەكی قوطبە ژ وڕ حاجیان فەتلوگەر
د فیلمێ سەما ب فەلەكە وەك مەجەر[٥]

چ (یوم القیامة) فیلمێ حەشر
مەقامەكێ مەحمووده ب بەعث و نەشر[٦]

بزان ئەفلاطونان ب فكرێ تنێ
قیامەت دەزانین ل پەی مرنێ[١]

---

(١) مرۆڤ وەكە فیلمێ بەهشتێ بینێ بەر چاڤێ خوە گەلەك تشتێت پیرۆز تیدا دیار دبن وەكە وەحیێ و قورئانێ و شەهدێ و نڤێژا و هندەكی دی ژی.

(٢) هەكە مرۆڤ ل كەعبەتو (الله) بنێڕێ ڕوكنێ بەرێ ڕەش و مەقامێ ئیبراهیم بەرێ ڕەش و بیرا زەمزەم و دەرگەهێ (باب السلام).

(٣) حەتیم د كەڤە ناڤبەرا دەریێ و حیجرا ئیسماعیل و بندەرا دەریێ بەیتێ دبێژنێ: ملتەزم مرۆڤ دەستێ خوە ددینت سەر و دوعا دكە، حیجر ئیسماعیل ئەو كاڤلێ ژ بەیتێ دەرڤەیە. مەقامێ ئیبراهیم ئەوێ دەوسا دوو لنگا تێدەیە.

(٤) جهێ سووند و سۆزا حاجیایە بەرێ ڕەش دەستێ ڕاستە خودا، دانایە عەردێ.

(٥) وەكە قوتتبێیە حاجی ژۆر ل دوورا كەعبێ د زڤڕن د وا فیلمێ ژ عەسمانا هاتی گرتن دا باش خۆیا دكە وەكە ڕێكا كادزایە ل عەسمانا.

(٦) وەكە ڕۆژا ڕابوونێیە فلیمێ حەشرێ مەقامێ مەحموود ل وڕ هەیە كو موحەمەد سەجدێ دبە ژ خودا داخوازا حسابێ دكە. بەعس و نەشر هەیە ل دەمێ ڕابوونێ، ئەڤێن هە ل بەیتو (الله) هەنە و ل وڕ ژی و هەنە.

ژ حەدیثێ یە (من كمل عقلە)
تەمام ئەوی (كمل دینە)[2]

د قورئانێ پڕ (أفلا تعقلون)
تەفەكەر بكن (أفلا تبصرون)[3]

كەسێ ژێڕا عەقلەكی تامە نەبێ
ب داهەن دێ دینێ ئەوی خامە بێ[4]

تەڕازویە هەر دوو ل دوو ما هەڤن
د كێماهی و زێداهی دا وەك هەڤن[5]

د حەدیثا (اللهم احفظ علی
عقلي و دیني) فخذ یا اخي[6]

وەیە دین چ سەرمایە بۆ عاقلان
نەبوو یێ بێ مەژی وەنە بۆ جاهلان[1]

---

(1) برزنبە ئەوێن عەقلمەند وەكە ئەفلاتونان، ئەفلاتون ژ حوكەمایێن یونانیا بوو. سوقڕات وبوقڕات حوكەما بوون. گۆتن پشتی مرنێ قیامەت هەیە، ب عەقلێ خوە گۆتنە ڕۆژا ڕابوونێ هەیە.

(2) د حەدیسێ دە هاتیە چ كەسێ عەقلێ وی تمام بە ئایینێ وی ژی تەمامە چڤا عەقل كێم بت ئایینی ژی كێم دبە. هەكە ژ بنی عەقل نەبوو ئاینی ژی نینە نە موكەلەفە.

(3) د قورئانێدە ئایەتێن ما هوون نا دنە عەقلێ خوە، هزر تێدە بكن ما هوون نابینن هو گەلەك دی ژی هەنە خودا گازی مرۆڤی دكە.

(4) چ كەسێ عەقل تام نەبێ تشتەك بەدیهیە ئایینێ وی ژی وێ سست و خاڤ بە.

(5) هەر دوو عەقل و ئایین وەكە مێزینێنە دڤێت هەر دوو سەری. وەكە هەڤ بن یەك ژ یەكی نە گرانتر بە، هەر دوو هەڤدوو تەمام دكن، عەقلێ پاش ئاینێ باشە، عەقلێ كێم ئایینێ كێمە.

(6) دحەدیسێدا هاتیە قاسدێ خودا دگۆت: یاڕەبی تو عەقلێ من ل سەر من بپاریزە و ئایینێ من ژی ئەڤێ بۆ خوە بگرە یا براكوكێ من

دگـــەل عـــەقـــل و نـــەقلـــێ فویـــوچین خـــودا
نـــە ئێـــتن مـــوەفـــەق نـــەهـــن قـــەط گـــەدا[٢]

ژ عـــیلم حـــەوصـــەلا تـــە تـــژی بـــە تـــژی
(العلـــم ســـلاحي) حـــەدیثـــە بـــێ بـــژی[٣]

هـــەنـــە عـــیلم ل دنـــێ ب ئیلهـــامێ خـــاص
وەكـــی شـــێخێ دەبـــاغ (علـــی الخـــواص)[٤]

د تـــەفســـیرا بیســـت چـــار هـــزار حاجـــب
ڕەئیـــەك دا حـــەبیبـــی دەرس ب ڕۆژ و شـــەب[٥]

نـــە هێـــژا مـــە وی نـــان و ئـــاڤێ تـــە دا
وەلـــی ب عـــالمێڕا د خـــۆتی گـــەدا[٦]

مـــە هیڤـــی دەمـــا بێتـــە ئـــازادیێ
مـــەڤـــا بارگرانـــان بـــدە پێشـــیێ[١]

---

[١] وەسایە ئایین چ ڕاست و مالەك باشە بۆ مرۆڤێت عەقل نەبوو یێ بێ مەژی و نەبوویێ نەزان.

[٢]دگەل عەقل و نەقل كو ڤەیزا خودا ژی هەبت هنگی ئەوێ مووەفەق ب سەر نەكەڤێ كەس نینە

[٣] ژ زانینێ گەوریا تە تەژی بت. حەدیس پێ هاتیە (العلم سلاحي) زانین چەكا منە ب وێ مرۆڤ بژی.

[٤] زانین هەیە نە ژ خوەندنێ زانا دبێژن: وی علمێ لەدونی وەكە (شیخ دەباغ و عەلی ئەلخەواص) ئەڤ ناڤ بانگن دبێژن: زانینا وا ژ كیس وا بوو لبا كەسێ نەخوەندبوون خودا دابوو وا.

[٥] د تەفسیرێدا هاتیە بیست و چار هەزار جارا جبرائیل دەرس گۆتیە قاسدی خودا سەیدایێ وی هەبووە.

[٦] ئەز نە هێژامە ئەو نان و ئاڤێن بەلاش تو د دی مە. لێ ئەز ژی ب عالەمێرا دخۆم نە ئەز تەنێ ل سەر سفرا تەمە ئەڤ عالەم هەمی ژی دخوە هەر هەیە هەر بەلاشە تو چەندە مەردی یارەب.

چونـــان ئـــەم د قـــەدیـــم زەمـــان کـــاروان
بـــەری بـــار سـقـك ئـــەم د چـــوون بـــار گـــران[٢]

ل ســـەر فـــەضـــلا تـــە ئـــەم مـــوقیم و بقـــیم
ببـــوورینی بـــەنـــدە ژ عـــەذابـــێ ئـــەلـــیم[٣]

وە یـــانی ژ قـــەنجـــان مـــە مـــەهـــدەر بکـــن
وە یـــا ب تـــەوبـــەیـــا تـــو د دی ئـــەم بکـــن[٤]

چ نیعمـــەت عـــەظیمـــە وا وی (لاتقنطـــوا)
(جمیعـــا) چ بوشـــڕایە ژبـــۆ مـــە ژی تـــو[٥]

نـــە هێـــژا مـــە وێ مـــەصـــرەفـــا ل مـــن دکـــی
وەکـــی فیکـــی نـــان ئـــاڤ جلـــێ ل مـــن دکـــی[٦]

هـــەم ئـــەیمـــان و قورئـــان و عـــیلم و مـــەعریفـــەت
د (یـــوم القیامـــة) عـــەفـــو و مـــەغفیـــرەت[٧]

---

[١] هیڤی و داخواز من ئەوە دەما ئازادی وەرە مەڤایێن بارگران ژ گونەهان بدە پێشیێ.

[٢] ژبەر کو بەرێ دەما ئەم دچوون کاروان یێن بارێ وا سقك بوویا دمان ل پاش یێن ئەم بارگران دچوون بەراهیکێ.

[٣] ل سەر فەزلا تە و کەرەما تە ئەم ل ڤرێ ڕاوەستانە و قیمامە پێ هاتیە کولەیێ خوە ببوورینە ژ سەزایێ دژوار.

[٤] یان ژ کەرەما خوە دەستووری بدە هندەك ژ چاکا بلا مەهدەرا مە بکن یان ب وێ توبەیا تە دایی مە ژ وی سەزایی ڕەها بکە.

[٥] چ نیعمەت و کەرەمەکا مەزنە واوا [لاتقنطوا] (الزمر: ٥٣). کو ژبۆ کومێیە یانی بێ هێڤی نەبن ئەڤ مزگینیەکا مەزنە ژبۆ مە ژ بال تە یارەب.

[٦] دبێژە ئەز نە هێژامە وێ مەسرەف و خەرجا تو ل من دکی وەکە فێقی و نان و ئاڤ و جل و گەلەك تشتێن دی ژی.

[٧] هەم ئیمان و قورئان و زانین و ناسین ئەڤێن هە هەمی، تە ل ڤرێ دانە من، دڕۆژا ڕابوونێدە لێ بهورین یارەب .

مـــه بـــار پـــڕ گـــران ل دەرێ خانـــەدان
جـــەهالـــەت عوذرنامـــە یـــا مـــە ئـــەمـــان[١]

حوقـــوق چقـــا مـــەزنـــەبـــە وەیـــا ذەرەبـــە
ب میزانـــــا خێـــــر و شـــــەڕان چێدبـــــە[٢]

چ ل ڤێـــدێ چ ل وێـــدێ ئـــێ دەینـــێ خـــودا
دبـــە موســـتەحـــەقـــێ ڕضـــائا خـــودا[٣]

خـــودا وەقتـــی راضـــی بـــێ ئـــاخر کـــەلام
(لهـــم عنـــد ربهـــم دار الســـلام) [٤]

دبیـــتن خـــودا ل قـــەتلـــێ بـــێ ڕەحـــەمتـــێ
بـــدە کوشـــتی تشـــتێ ب ڤـــی ژ جـــەننـــەتـــێ[٥]

---

[١] مە بارێ خوە گەلەك گران كریە ژ گونەها ل دەرێ خانەدانا تە بنە زانین، عوزرناما مە ئەمانەتە یارەب. خودا دبێژە ئینسان گەلەك ستەم ل خوەكر و نەزانی ژبن وی باری دەر ناكەڤە.

[٢] ماف چقاسی مەزن بە یان بچووك بە وەكە مسقالا زەڕێ بە، مێزینا خیر یان شەڕێ پێك تێت. ڕۆژا ڕابوونێ مێزین تێتە دانین خێر و گونەهـ پێ تێنە كێشان.

[٣] چ ل ڤرِ یانی ل ڤێ دنێ بت یان ل وێ بت لێ دەینێ خودا ل سەر هەبت، دبە خودان ماف كو ڕازی بوونا خودا ژێرە هەبت.

[٤] ژبەر كو خودا مافێ خوە ببوورە چاخێ خودا ژ كولەیی ڕازی بوو داویا گۆتنێ ژبۆ وا لبا خودایێ د وا خانیێ سەلامەتێیە كو بەهەشتە.

[٥] دبە خودا كوژەكی ژێ ئازاد بكە ڕەحمەتێ لێ بكە، كا كوشتی چ دڤە بەدە وی ژ بەهەشتێ ئەوا بڤێت، ئەڤە هەر دۆژە چوونە بەهەشتێ، هەمی ل سەر ڤیانا خودایە، چ بڤیت ئەوە.

## عەقیدەنامە

ژ تە تا وەرە عالەم و وە ذەڕەیات
مە تەڤ کرنە شاهدێ وەحدەتێ ذات[١]

ب تەنێ ژ ذات و صیفات و فعل
نە پالە نە عیشچی د شوغل و عەمەل[٢]

چیا کو تە گۆتی ژ مە ڕا ڕێکری
ب سەمع و ئیطاعە بو وی باوەری[٣]

سەرەنجام ئیمانێ یا حەزدکی
تەحەیور و عجزە ژ وی زێدە نەکی[٤]

مە ئەڤ شەهدەنامە سپارێ تە کر
ڕجائا قەبوولێ ژ تە هەر مە کر[٥]

صەلات و سەلام سەر نەبی وەك تە ڤین
وە ئال و صەحابێن ل وی د جڤین[١]

---

(١) حەتا ژ تە وەرە گەلەك و کێم  هەمی مە کرنە شاهد ژبۆ یەکیتیا تە تو بابەتی هەمی زەڕات و هەیین شەهدەکیێ بدە کو تو یەکی.

(٢) تو هەر ب تەنێ یێ د زات و صیفات و کریارێن خوەدا نە پالە نە کارکەر د شول و کارێ تە دەنە تە پێویستی ب کەسێ نینە، هەر کەسێ پێویستی ب تە هەیە.

(٣) هەر تشتا کو تە گۆتی و ڤرێکری بۆ مە ب گوهدار و ئامادە ب تە ئەم باوەرن.

(٤) د داویێ دە ئەو باوەریا تو حەژێ دکی مایی حەیراندی و نەکار مایی ژ وێ ئەم زێدە ناکەن.

(٥) مە ئەڤ شەهدەنامە سپارت تە هێڤیا پەسەندکرنێ ئەم هەر ژ تە دکن تو قەبوول بکی یا خودا.

ب شعرا نەچە كوفرێ حوسن و جەمال
يێ ئەو دانە وێ خالقێ بێ میثال[٢]

د مەهەدا حەیاتێ هەمی عالەمی
تو وان خوەیێ دكی سەر ئەوان حاكمی[٣]

ل بەر سینگا ئاسیایێ تێر و تژی
دیسان ژ تەیە ئەڤ حەیاتا مەژی[٤]

مە ئیمان ب تەیە مە تەوەكول ب تەیە
عیبادەت مە بۆ تە ئیعانەت ب تەیە[٥]

د حەدیثێ ڤی دینی قەوی دكە خودا
ب وان شەخصێ فاجر نە ئەهلێ خودا[٦]

نابت ژ (ظاهرین علی الحق) دا
هەبن ژ عالمان هەم ژ ئەهلێ خودا[١]

---

[١] صەلات و سلاڤ ل سەر قاسدێ تە بن وەكە تە بڤێت و هەروەسا ل سەر كەسوكار و هەڤالێن وی ئەوێن ل دورا وی جڤایین بن.

[٢] ب ستێركا شعری ژبەر ڕندیا وێ خوە نەبە كوفرێ یێ ئەو ڕندی و جەمال دا تە ئەوی ئەو ئافەراندیە، یێن وەكە وی نینن.

[٣] ل سەر ڕوویێ دنێ هەمیا تو خودان دكی و د سەر وا دە حاكمی، بریاردەر هەر تو وی تە هایێ ژ وا هەیە.

[٤] دەڤەرا ئاسیا وەكە دایكێ شبهاندیە دبێژە ئەڤ عالەم هەمی ل بەر بەدەنا وێ تێتە خودان كرن دیسا ئەڤ ژیانا مە ژ تەیە یا ڕەب.

[٥] مە باوەری ب تە ئانیە و تەوەكولا مە ل سەر تەیە كریارێن مە عیبادەت بۆ تەیە و هاریكاریێ ژی ئەم ژ تە دخازن.

[٦] د حەدیسێدە هاتیە خودا بهێز دكە ب زەلامێ نەباش فاجر كو نە زەلامێ خودانە (أید الله هذا الدین بالرجل الفاجر) حەدیسە.

ب فـــــەضــــلێ مـــــووەفــــەق و جونــــدیێ تـــــەبـــــن

ب ڕوح و جـــــەســـــەد ب قـــــەلبـــێ صـــاف بـــــەنـــده بـــــن[٢]

ژ ئـــــەنـــــواعێ كـــــوفرێ و عـــــەقیـــــدێن ضـــــەعیـــــف

ب پـــــارێزه ســـــونی شـــــەریـــــف و ظـــــەریـــــف[٣]

ژ ســـــــولالێ د طرِســـــــــن ژ فیتنـــــــێن زەمـــــــین

بـــێ دیـــن ئـــەو بچـــن گـــەر نـــەبـــێ تـــو مـــوعین[٤]

ژ ئیمـــانێ گـــەلـــەك طرِســـام ژ دونیـــێ مـــن نـــەكـــر كـــارەك

ژ غشـــێ ژی گـــەلـــەك طرِســـام مـــە بـــازارەك نـــەكـــر جـــارەك[٥]

مـــە گـــر بوویـــە گـــران هلـــدا بـــە پـــەنجـــەیـــەك ل مـــن دا

ڤـەدیسـا ئـەز كـەتـم طرِسـێ مـە حفظـا مـال نـەكـر جـارەك[٦]

ژ عـــــەبـــــدوڵلاهی خـــــودا نـــــەبـــــی میعـــــڕاج كـــــر

ســـــێ تشـــــتێ مـــــەزن بـــــۆ وی ئیكـــــرام كـــــر[١]

---

[١] نابـه هـەر هنـدەك وێ هـەبن ئـایین وێ ب وا عـەزیز بـت و سـەركەفتی دمینـه ئـەو ژی ژ زانایێن ئاینینه ئەهلی خودانه مرۆڤێن چاك.

[٢] بە كەرەما تە و فەزلا تە ئەم مووەفەق ببن و پەیا كێ تە بن لەشكەرێ تە بن ب گیان و بەدەن و دل ئەوێ ساف كوله و بەندیێ تە بن د ئەمرۆ فەرمانا تە دە بن.

[٣] ژ هەمی ڕەنگێن كوفر و عەقیدێن ژار و زەعیف مە ب پارێزه سونی باش و پاقژ.

[٤] ئەز ژ شوون خوەڤە ژ سولالێ و پاشەڤە مایا د ترِسم ژ فتنه و فەسادیا زەمانی كو ئەو بێ ئایین بچن هەكە تو نەبی هاریكار بۆ وا یا خودا.

[٥] دبێژێ ئەز گەلەك ژ باوەریێ ترِسام ژ دونیایێ ڕە من تشتەك نەكر ژ كاروبارێ دونیایێ دووركەتم شول كارێ وی دەرس د گۆتن و خوەندن بوو. ئەز گەلەك ژی حیلا د ترِسام د كرین و فرۆتنێدە من جارەكێ بازارەك نەكر ئەز ژ وێ ژی دووركەتم.

[٦] مە جارەكی كارەك گران هلدا سەر ملێ خوە ئەوێ ژی دەربەك ل من دا دیسا ئەز كەتم ناڤا ترِسێدا مە ئێدی مال نە پاراست و هلنەدا.

خەواتیم (البقرة) پێنج مێژێ فەڕض
(غفر من لایشرك شیئا) چوو عەڕض[٢]

د ڕەوض ئەلنەعیما شێخ ئاقتەپی
د میعراجدا و مەهدرا کر (نەبی)[٣]

خودا نۆط هەزار گۆتنێ ڕەحمەتێ
پێشکێش حەبیبی کر بۆ ئۆمەتێ[٤]

قەبوولکە تو مەهدەڕا مەهدەرچیان
بۆ مە ڤان گونەهکار و ڤان عاصیان[٥]

ئەمەل ژ عامێ دۆژە نەکی من د نار
تفضل أیا جار من أستجار[٦]

دەفعکە هنان ب هنان خۆندەکار
وە گرنە حضووڕ دە کونەند شەرمەزار[١]

---

[١] ناڤێ باڤێ قاسدێ خودا موحەممەد کوڕێ عەبدوڵڵای کوڕێ عەبدولموتەلبی ئەو نەبیێ خودێ دایە عەبدوڵڵاهی، خودا ئەو برە عەسمانا باخوە سێ تشتێ مەزن بۆ وی دیاری کرن.

[٢] یەك داویا سورتێ البقەره بۆ، ((لایکلف الله نفسا إلا وسعها لها ما کسبت وعلیها ما اکتسبت)) (البقرة: ٢٨٦). لێ بوورینا گونەهێن وان کەسێن شریك بۆ خودا چێ نەکرین ئەو پێنچ نڤێژێن فەرز ئەڤ هەر سێ دیاری بوون ژ خودا بۆ ئەمەتیێ.

[٣] د پەرتووکا شێخێ ئاقتەپەییدا هاتیە. د دەما کو موحەممەد چووە عەسمانا ژبۆ ئومەتا خوە مەهدەر کریە (شەفاعەت).

[٤] خودا نوت هەزار گۆتنێ دلۆڤانیێ ژبۆ ئومەتا وی تەسلیمی کو موحەممەد کرنە ئەوی ژی هەمی ژبۆ ئومەتا خوە گۆتنە.

[٥] قەبوول بکە یا خودا مەهدەرا مەهدەرچیا کو مرۆڤێن چاکن وکریارێ چاکن ژبۆ مە ڤایێن گونەهکارو خەتاباڕا یاڕەب.

[٦] هیڤیا من ژ دلۆڤانیا تە یا گشتی هەیە تو من نەکی دناڤ دوژەهێدا تو کەرەم بکە یا جیرانێ دبێژە جیرانیا من بخوازن.

حیفظکە ژ دۆژێ مە پیرێ ئەسیف
بدە من فیردەوسێ چەند مەسیف[2]

د ناڤ عامیان شەرمەزار مەکە من
ب علم ئەو مە ناسین عەفوکە تو من[3]

خەطائێن د دونیێ تە نا نین دیار
د عوقبایێ دیسا لێ ناکی ستار[4]

چ نیعمەت عەظیمە دەخالەت قەبوول
بشارەتێ خالق دێ چێ بت وصوول[5]

مە ئیمانە ل مەبە گوناهە ل سەر قرێژ
جیلاکە ب تووبێ د عەمرێ درێژ[6]

فەقیرم فەقیرم برچیمە نە تێرم
مە کەشکۆل ل بەر سینگ هەشتێ سالێ پیرم[1]

---

(١) تو هندەکا ب هندەکا ژ سەر من راکە یانی گونەها ب خێرا ژ سەر من ڕاکە هەکە نەخوە من ببە حوزوڕا خوە ل وڕ من شەرمەزار بکە.

(٢) بپارێزە ژ ئاگری من ڤی پیرێ هە یێ خودان کووڤان تو بدە من ژ بەهشتێ چەند بەرسفکا.

(٣) د ناڤا خەلکێدە من شەرمەندە نەکە ژبەرکو ب زانینێ من دناسن دبێژن ئەو مرۆڤەك عالمە ل من ببوورە یا خودا.

(٤) گونەه و خەلاتا هیێن من یێ ددنێ دە تە ستارکرن ژ خەلکێ ما تو د ئاخرەتێدا ژی لێ ناکی ستارێ و نا ڤەشێری، سەتاری یا ڕەب.

(٥) چ نعمەتەکا مەزنە بۆ مرۆڤی کو خودا خوە ئاڤێتنا مالا خوە قەبوول بکە ب مزگینیا خودا گەهاندن هەڤ چێدبە ل بەهشتێ.

(٦) باوەریا مە و کەلام بی یە ڕۆناهیە گوناه وێ بقرێژ دکن دژیێ خوە یێ درێژدا ب تووبێ جیلا بکە دا ئەو قرێژ ژ سەر رابە. بەرێ ئامانێن سفر و پاخر هەبوون سالێ جارەکێ دڤیا بهاتا سپیکرن جەلاچی هەبوو ئەوەل جیلا دکر ئەو قرێژ ژێرا دکر پاشی سپی دکرن.

د حیلما نەبی ڕەحمەتێ عالەمێ
بۆ ئۆمەتا ویژی د هەموو غەمێ[٢]

خوونا وی نەڕێژە بکە ئیحتیرام
ب کەلمی شهادة مقام اعتصام[٣]

د حەدیثێدا (المؤمنون جسد)
(اذا اشتکی عضو فما رقد)[٤]

قیتالا (نەبی) ئەیمان و ئاخیرەت
یا دەورا ملووکان ب وە د ئاخ و خەط[٥]

(یمزق بعضهم وملك بعض)
(حدیث شریف وذکره فرض)[٦]

ژ سێ صەد سالێ هجری تا عەصرێ نەبی
ئیسلامێ تەرەقی کرە و زێدە بی[٧]

ژی هێرڤە دناڤ وێ بۆ قەتل و قوتوول

---

(١) دبێژە ئەز فەقیرم بۆ خێرا ب رچیمە نە تێرم من تێرا خوە خێر نەکرنە ئەڤە کەشکولا من ل بەر سینگا منە و ئەز هەشتێ سالێمە و پیرم.

(٢) دبن دلۆڤانیا قاسدێ خودێ کو دلۆڤانیە بۆ عالەمێ ژبۆ ئومەتا خوە د خەما دایە.

(٣) خوینا مرۆڤێ مسلمان نەریژینە حۆڕمەتا وی بگرە ب کەلمەتا شەهادەتێ ئاخافتیە دەما مرۆڤەك شەهدە دە تێتە پاڕاستن.

(٤) د حەدیسێدە باوەرمەند یەك لاشن دەمێ کەرەك ژ لاشی ئێشها وێ شەڤێ هەمێ لاشی نا ڕازە، یانی دڤێت باوەرمەند ل سەر هەڤ بێش.

(٥) شەڕێ کو قاسدێ خودا دکر ل سەر باوەری ایمان و ئاخرەتێ بۆ شەڕێ دەورا پاشا و ملووکان ژبۆ ئاخێ و تخووبایە.

(٦) هندەك مەکیا هنا وێ ب پەلێخنن و پەرچقینن، ئەڤ حەدیسە بەحسکرن فەرزە دڤێت مرۆڤ حەدیسا بێژە.

(٧) پشتی قاسدێ خودا کوچ کری سێ سەد سالا ئیسلام پێش کەت و زیدە بوو.

نـــەيـــارى ظـــەفـــەر ســـتاند ئيســـلام دەر نـــزوول[1]

ســـەبـــەب وى كـــو ميثـــاق و عـــەهـــدێن خـــودا

شـــكاندن موخـــالفێ ئـــەمـــرێ خـــودا[2]

(جـــزاء العمـــل أخـــتلاف القلـــوب)

(مـــن اللـــه جـــاء عـــلام الغيـــوب)[3]

حـــەلالـــێ حاضـــر مێـــزەكـــە د نـــاڤ نـــەيـــار

ئيســـلام پـــێ كـــەنوكـــە ژ خـــودا ضـــەربـــە خـــار[4]

حـــەديـــث (لاتكونـــوا بعـــدي يضـــرب

بعضـــكم رڤـــاب بعـــض) فـــاعربوا[5]

المســـلم مـــن ســـلم المســـلمون

مـــن لســـانه ويـــده آمنـــون[6]

ژ قضـــا و قـــەدرێ ئـــەم نـــەزانـــن تـــوى

يـــا مـــەوقـــەدەرێ يـــا چوگـــا نـــوو گـــوى[1]

---

(١) ژ وێ دەورى هرڤە د ناڤ مسلمانا دە كوشتن و شەڕ زۆر بوون. دژمنا سەركەفتن بدەست خوەڤە ئانين و مسلمان ژار بوون و شكەستن

(٢) ئەگەرا وێ ئەو بۆ ئەو سۆز و بەختێ ب خوەداره داين شكاندن، نە وەكە فەرمانا خودا كرن هەڤدوو كوشتن ڕەحم لهەڤ نەكرن.

(٣) سەزايێ كريارا وا دل نە ڕاستيا وايە ژ هەڤڕا ئەو ژى ژ با خودا تێت ئەوێ كو تشتا نەديار دزانە.

(٤) نها ڤێ گاڤێ ل ناڤ نەيارێن ئيسلامێ تەماشە بكە چاوا كەنێ خوە ب ئيسلامێ دكن، ئيسلام پێ كەنوكێ وايە.

(٥) حەديسە قاسدێ خودا دبێژە ل دووڤ مدە بشيرا ل ستووێ هەڤ نەدن هەڤدوو نە كوژن ئەڤێ حەديسێ بڤێيا بيت ناس بكن.

(٦) موسلمان ئەوە كو مسلمان ژ شەڕێ زمانێ وى و دەستێ وى ب سەلامەت بن، ب زمانێ خوە و دەستێ خوە زەرەرى نەكت.

ژ عالـــــەمـــــەكـــێ هـــاتن ئـــەڤـــێ عالـــــەمـــێ

ب چ ئـــــەم مـــــژوول بـــــوون د وێ عالـــــەمـــێ[٢]

ڕوحـــــێ دونیـــــەوێ و بـــــەرزەخـــــێ و ئـــــوخرەوی

وەكـــى یـــەك نـــەهـــن تـــو نـــەبـــە ضـــدێ وی[٣]

ئـــەزەل بـــۆ نـــەهـــن لـــێ ئـــەبـــەد بـــۆ هـــەیـــە

كـــە جـــەوهـــەر بـــەسـیطە نـــە جـــورمێ مـــەیـــە[٤]

چـــاوا صـــەوت بـــەسـیطە و لـــەطیفـــە فـــەنـــا

مـــەحالـــە چونـــانكى نـــە جـــورمێ فـــەنـــا[٥]

دەمـــا صـــەوت ژ مـــەســـموعێ خـــۆ بـــت جـــودا

دگـــەهـــە ئومـــەتـــا تـــەڤـــى تـــەســـبیحێ خـــودا[٦]

چ دەرســـــەك غـــــەریبـــــە ژ علمـــــێ قـــــەدیـــم

بـــۆ وە مـــــن دەرانـــــى ژ كیتـــــابێن عـــــەظـــیم[٧]

---

[١] ژ چاخێ دبە و ژ قەدەرێ ئەم نەزانێن تەنە یا قەدەر بسەردا تێتە من كو بەرچوو گانا دكەڤە و كەگوكێ دیسا ئەمن.

[٢] ژ دەڤەرەكى عالەمەكى هاتن ئەڤێ عالەما هەیا دنێ ئەمن ئەم دەمى د وێ عالەمێ دا بوون گەلو ئەم بچڤە مژوول بوون.

[٣] ڕۆحێ دونیایێ و یێ بەرزەخێ و یێ وێ دونیایێ نە وەكە هەڤ تو نەبە دژى ڤێیا هە هەر یەكى دوارەكیدایە.

[٤] ڕۆح نە ئەزەلیە كو هەر هەبوو بت لێ ئەبەدیە وێ هەر هەبت ژبەر چاخێ نەهاتى ڤێ دنێ و دەما بچێ ژى هەر یەكە لێ حالەتێ وى نە وەكى هەڤن.

[٥] چاوا دەنگ ژ هەڤ كەر نابە و ناخوەیە و فەنا نابە ئەو ژى وەسایە ژبەر كو نە تشتە خۆیا بكە كو جورم بت نەخوە فنا نابە.

[٦] دەمێ دەنگ ژ جهێ بهیستنێ وەرە دەر دگەهە ئومەتا هەمیا تەسبیحا خودا یانى هەر تشتەك وەسایە د بهیزە تێكدا زكرێ خودا دكەن.

[٧] ئەڤا هە ژ دەرسەك خەریبە ژ زانینا بەرێ من بۆ وە دەرا نیە ژ پەرتووكێن مەزن.

کالێ هەشتێ سالێ پیرێ هەژهەژووک
ژ لەذائذێ دونیێ کیتاب دیتە بووک[1]

سیتار نەکێ د عامێ دی بم مەثەلە
تو ڕەحمێ نەکێ ل من دێ بم بەهدەلە[2]

ب علمێ مە ناسین ژ وی حوسن و ظەن
ژ ویلایەتێ ژی توهمەتەکی ژ من دەبن[3]

تەنێ تو دزانێ عەمەل من پەطۆت
مە حەمد و ثەنایە بۆ کەسێ تە نە گۆت[4]

د تەقریر و نەقلان قەلەم کاغەدن
د ڕۆژا حەسابێ بۆ من شەهەدەدن[5]

بەرێ ڤان ب ڤان ڕا ژ من کار پیس
مە غەرنووق بەردان ژ هەر چارێ چیز[6]

کە تەنها مە دەر سووج خەطا و هەوا
وە ئبلیس و نەفس و دونیا ئەوا[1]

---

(1) دبێژە ئەز پیرەمێرەك هەشتێ سالیمە بۆ مە هەژهەژوك ژ خوەشی و لەزەتێ دونیایێ دەرباس بۆمە من پەرتووك ژبۆ خوە دیت وەکە بۆ کێ ئەز ب وێڤە مژوولم.

(2) ئەگەر دناڤ عامیدا من ستار نەکی هەر کەسێ ژ من باخڤە هەکە تو ڕەحمێ ل من نەکی ئەزێ ببم بەهدەلە و رسوا ببم.

(3) زەننا خەلکێ دبارا من دە گەلەك باشە ب وێ من داناسین دبێژن مرۆڤەك چاکە هندەك زەننا ویلایەتێ ژی ژ من دکن ئەو توهمەیە دبن.

(4) خودا تو تنێ دزانی کریارێن من نە سەڕاستن پەتوتن خوە ژ هەڤ بەردایە وەکە ئەو دبوارێ خلوخە بێ سپاس بۆ تە یا خودا تە بۆ کەسێ نە گۆتیە ئەو ژی ژ مەزناهیا تەیە.

(5) هەکە تەقریرەك یان نەقلەك گوهەستنەك خامە و کاخەز پێویستە دڕۆژا حەسابێدە ئەو ئەو بۆ من شەهدێ بدن.

(6) بەری ڤان و دگەل ڤان ژ من کارێ نەباش و پیس مە قولنگ بەردان ژ هەر چارێ دی یانی ئەم ژ ڕەڤێ مان.

د سیمائێ صالّح کە شێخێ زەهی
نە دانین ب دلێ گورگێ دپۆ ستێ مهی[٢]

حەمد و ثەنا من بۆ تەیە من شەفەقەت پوڕ زێدەیە
کی بە دبێم را تە ڤیە ڕا حەق ئەڤە ڤێ بەرنەدەیە[٣]

یووسف تو بگرە هەدیە و سیمایێ ڤان
قورئان تە فەصیح نە شبی پیلە بان[٤]

ملك و مەلەکوت ژێ وەکی یەك نەهن
عەذابێ مری ژی چاڤ لێ نا گەهن[٥]

ب قیر و بڤیژن مە حس پێ نهن
ژ خودا ڕەحمەتە بۆ مە ئەم نا بهن[٦]

ڤێ دەعواێ مەکە کوفریا تان مەکە
ژ ڕەیبێ ڤەگەر زوو تو چاڤان ڤەکە[١]

---

[١] وەکە قولنگ ژ ڕەفا خوە بمینە کو ئەز تەنێ مە دڤان خەتا و سووجا دە و ڤیانا نەفسێ و شەیتان و نفس و دونیا وا.

[٢] دروچکی یێ چاك و سالّح شێخە زاهد پەهرێزگر ئەوا نەدانیە بێ دل گورگ دکەڤە یێ مهێدا.

[٣] سپاسی و سەناییێن من بۆ تەیە شەفەقەتا من گەلەك هەیە ئەو گۆتنێن ئەز بۆ کێ ببێژ وەکە راییێن تەڤیێنە و ڕێیا حەقە ئەڤێ بەرنەدە یا ڕاست ئەوە.

[٤] یووسف تو ڕێیا چاکا بگرە و سیمایێ ڤانا بگرە قورئانا تە ڕاستە فەسیحە نە وەکە یا مورك فرۆشایە.

[٥] ملك و مال نە وەکە مەلەکوتێیە، مەلەکوت هەبینا عەرد و عەسمانایە مەلەکوت بابەتە بۆ خودا ملك بۆ هەر کەسێ دبە نە وەکە هەڤن. عەزاب دانا مریا ژی چاڤ نابینن تشتەك نەدیارە غەیبیە وەکە عەزابێ قەبرێ.

[٦] دکن قیر و هەوار لێ ئەم پێ ناحەسن ئەو نا بهیزن و عەزابێ وانا بهن ئەو ژی دلۆڤانیا خودا بۆ مە هەکە مە بهستی با مە مری نە د ڤەشارتن.

ل (البقـــرة) فكـــره دوو پـــەرێ بچـــووك ســـەری
(يؤمنــــــون بالغيــــــب) ئيمـــــان بـــــاوەری[٢]

ژ ڤـــەبـــدێ تـــا ڕەحشـــەرێ جـــەهـــەنـــەم جينـــان
ژ غـــەيبێنـــە تـــەڤ وان ببينـــە عـــەيـــان[٣]

تـــو ڤـــی عالـــەمـــێ كـــە دەليـــل و نيشـــان
ب ئيقـــرار و يـــەقيـــنم ب خـــالقێ ڤـــان[٤]

چيـــا كـــو ئـــەوی گـــۆت تـــو بـــارەربكـــە
عيبـــادەتكـــی پـــاك تـــو پێـــرا بكـــە[٥]

وەحـــی ژی ژ غـــەيبـــێ يـــە صـــەجـێن گـــوزين
ئـــەكثـــەرێ وان نـــە دينـــە جبريلـــێ ئـــەمـــين[٦]

ب وان موتـــەمـــەثـــل بـــە مـــويێ ڕەد نـــەكـــە
نـــە ڕەشـــك و شـــوبهێ چـــوو كـــوفرێ نـــەكـــە[٧]

---

(١) ڤێ دەعوايێ و داخازا ڤێ نەكە كو تو بێژی ئەز وانە ديار دزانم كوفری نەكە ژ تشتا شكێ ڤەگەرە هەكە تە هەبت زوو ژێ ڤەگەرە تو چاڤێت خوە ڤەكە ڕاستیێ ببينە.

(٢) ل سورەتێ (البقرة) ب فكرە يا ئەوێ ڕوويێ وی وەكە ڕوويێ پەريايە رندە و سەرێ وی بچووكە كو دبێژە دڤێت باوەريا وو ب تشتا نەديار هەبت أيمان باوەر بە.

(٣) ژ كوری حەتا هەرە حەشرێ و دوژەهێ و بەهەشتێ هەموو ژ تشتێت نەديارن غەيبن، ڤانا هەميا بێنە بەر چاڤێ خوە.

(٤) تو ڤێ عالەما هە ژبۆ خوە بكە و دەليل و نيشان و باوەر بكە و يەقين بكە ب خالقێ ڤا.

(٥) چ تشتا ئەوی گۆت تو باوەر بكە و كريارەكا پاكژی پێرا بكە عيبادەت ژێرە بكە و خودان باوەرە.

(٦) وحی ژ نەديارايە ژ غەيبێ يە پڕانيا سەحابا ژی جبرائيلێ ئەمين نەديننە جارنا كەتيە درەنگی وا دە.

(٧) ژی توحووەكی ژی ڕەد نەكە نەچە شكێ و زەنێ و چوو كوفرێ نەكە.

عیبادەت تە نا مەیە د دەست تەدا
دێ بت شەهدەنامە سەنەد دەست تەدا[١]

د قەولەکیدا شەڕطێ ئیمانێ عەمەل[٢]
ل نك هندکان پارچێ وێیە عەمەل[٣]

بزان فەرضە تەصدیق ڕەد ردتە
بەلغابان بگر سونەتێ شدەتە[٤]

هن دزانن کو نزانن ئەو بەلا سەیدا بگر
ئەو نەزانێ دبێژە زانم ئەحمەقە ئەو بێ فکر

سێهر جوع و صومت عەزل و صدقا زەمین
تەوەکول صەبر و عەزیمە و یەقین[٥]

مەگەر شێخ نە بت ئەی موریدێ ئەمین
ب ڤان تو عەمەل کە تا شێخی ببین[٦]

ژ فەتوحاتێ مەکی ژ شێخ (محي الدين)
مە تەرجەمە کر ئەڤە بۆ شەخصێ گوزین[١]

---

[١] کریارێن چاك تە نامەیە ددەست تەدە ئەوا ببە شەهدەنامە و سەنەد ڕۆژا ڕابوونێ دەست تەدا.

[٢] سەنەد مرۆڤی نەبت مال نادەنە مرۆڤی. ل سەر گۆتنەکێ شەڕێ ئیمانێ باوەریێ کریارێن چاکن عەمەلە.

[٣] د گۆتنەکیدا کارکرن ژ ئیمانێ یە.

[٤] بزانە فەرزە باوەرکرن (تەصدیق) ڕەدا وێ ردەتە مورتەد بوونە بلغابێن دەڤێ خوە بگرە سونەتێ ڕێکا قاسدی خودێ قاهیم بگرە.

[٥] بێ ژنی برساتی بێ دەنگی ژ مرۆڤا دوورکەتن و ڕاست گویی تەوەکول خوە ب خودێ گرتن، بێهن فرەهی. ل سەر خوە بوون و باوەری.

[٦] هەکە شێخ نەبوو یەکی بۆ خوە شێخەك وەسا کو ڕێیا ڕاست نیشا وی بدە پەیدا نەبوو یا سوفێ باچاك بڤا یێن مە گۆتین کار بکە، حەتا شێخەك پەیدا بوویی.

سەیدایێ مەکی (احمد بن حجر)
د فەتاوا حەدیثێ دا و چەند پەر(٢)

ژ ئادابێ شێخ و مرید و ذکر
ژ ئوصولان دەرانی بۆ مە ذکر کر(٣)

ژ ڤان عالمێن د علم دا وەك ئەنبیا
من تەفصیلاتێ دین ژ ڤان ئەولیا(٤)

ئەگەر ژ ڤان نەچێبا ئەڤ ئادابێ پوڕ
ژ شرۆطێن نمێژان ب جەمع و قەصڕ(٥)

ژ فروضێن زەکات و حەج و ڕۆژیان
ژ ڤان بەیع و بازار و ڤان وەصیان(٦)

ژ نیکاح و حوودودان جراح و جیهاد
شەهادەت و ڕەجم و دەعاوای و قوضات(١)

---

(١) ژ پەرتووکا فتوحاتێ مەکی ژ شێخ محیەددینێ عەرەبی کو دبێژنێ شێخێ مەزن ئەڤا هە من وەرگێرایە ژبۆ ڤان کەسێن من گۆتین.

(٢) هەروەسا سەیدا مەکی ئەحمەدێ کورێ حەجەری د پەرتووکا فەتەوا حەدیسێ دە چەند لاپەر.

(٣) د ڤێ بارێدە ژ ئادابێن شێخ و مریدا دە بۆ مە گۆتیە و بەحس کریە ژ پەرتووکا ئەساسی دەرانینە و گۆتیە.

(٤) ژڤان زانایێن دزانینێدا وەك ئەنبیانە مە ڤەکرنا (تفصیلا) ئایین ژ ڤا وەلیا گرتیە و ئەم فێربوونە نە ژ مەلایێن فەیسبووکا.

(٥) هەکە ژ ڤا ئەڤ ئادابێن هە چێنەبوونا ئەڤێن کو پرن. ژ شەرتێن نڤێژان بکۆم (جمع) کرن یان کورت کرن.

(٦) ژ شورۆتێن زکاتێ کا دچدا چەند هەیە . پەز دەوار دەڤە. و دراڤ و دەخلو دان . کا حەج و ڕۆژی چاوا تینە کرن و گرتن ژ ڤا ژی کرین و فروتن و وەصیەتا.

ژ نەص و سونەتێ كەنگی ئەم دەردخن
ژمە ڕا تێنە موجمەل ئەم دەرنائێخن[٢]

(العلم سلاحي).. حەدیثە ژ نەبی
ژ حەقیقەت هەدیە یووسف بۆ وەبی[٣]

ڕوحێ من فیدایێ تە سەیدایێ دین
موجاهدێ ئەكبەر وەك وی مە نە دین[٤]

بۆ سەلەفێن صالح نموونە و میثال
ل (فاصدع بما تؤمر) نعم الدلال[٥]

نكارم مەدح كم ژ وا یێن بەری
ڕەهـ و شاش و وەجهێن تە یێن ئەنوەری[٦]

شەب و ڕۆژ د ذكر و حضورا خودا
ب الله نەفەس هەر ددا[١]

---

(١) ژن مارەكرن و تخووبا (حدود) حەدێ كوشتنێ حەدێ زنایێ و یێن دی ژی برینداری و جهاد شەهدە دایێ، بەر باراندن. دوز و دادوەری.

(٢) مە ئەڤێن هە ژ پەرتووكا پیرۆز و سونەتا نەبی مە یێ چاوا بزانینا ژبەر كو بۆ مە نەهاتنە ڕۆهنكرن، ئەم نكارن ڤان ژ هەق دەری نن.

(٣) قاسدێ خودا دگۆت زانین چەكا منە ئەڤ ژی ژ حەقیقەتێ ژ یووسف دیارینە بۆ هەوە.

(٤) دبێژە رحێ من ببە فیدایێ سەیدایێ من ملا ڕەمەزان هارۆنی گوندی جێلەكا باڤێ زانایێ شەهید ك موحەممەد سەعید ڕەمەزان ئەلبۆتی. مەلا ڕەمەزان سەیدایێ مەلا یووسف بۆ دەمێ چووی بەر دلۆڤانیا خودا ئەڤ چەند بەیتێن هە سەر گۆتنە.

(٥) موجاهدێ مەزن وەكە وی من نە دیتیە ژبۆ سەلەفێن سالح خوەش نمونە بۆ و مەسەلە بوو. خودا پیك تانی خوەش نشان دان بۆ
ورێ ناس بوو.

(٦) ئەز نەشێم وەكە بابەتی وی بت پەسنێ وی بدەم ئەو ژی ژ وا یێن بەرێ بۆ ڕهـ و شاش و ڕووێ وێ یێ ڕۆناهی ژ نورهێ.

سنا برق و علمه فى نشره
سنا برق سبحان في نشره[٢]

ئیلاهی ژ ته ڕەحمەك عەقل ژی د بی
هەمی عالەمێ ژی عەفوكە د بی[٣]

تابعێ حەقێ حەلیفێ حالم ب (هدى النبي)
ما تێ وەك نۆشێ ڕەوانی بی[٤]

مە داخازێ ب دینداری نەمین خالی ژ حەق یاری
د ناڤ ئاثارێ ڕەحمەتدا دز و زیندان گولا گەشبی[٥]

(وفينا كنت محمودا) ب جومەردی دناڤ مە مەحموودی
ژ بریندار ڕا تو مرهم بێ ژ نەخوەش ڕا هەر وەها خوەش بی[٦]

مەحەبەت ئیلاهی نەبت حوب نەهن
نیفاقی و مەلاقی ثەمەر وان نەهن[٧]

دیا نەتكی بێ سیاسیەت دڤێم
براتیكێ پاك بێ ڕیاسەت دڤێم[١]

---

[١] شەڤ و ڕۆژێ د زكر دا بۆ و دحزوڕا خودا دەبوو گۆتنا هەر الله الله بۆ حەتا داویا نەفەسا خوە.

[٢] ڕۆناهیا (زانینا) وی وەكە برۆسكێ بۆ دبەلاڤكرنێدە وەكە بروسكێن چیایێن سپانی خەلاتێنە د ڕۆناهیدانێ دە و بەلاڤبوونێدا، سوبحان داغ.

[٣] یا ئیلاهی ژ تە دلۆڤانی زانین ژێرە چێ دبە، تو هەمی عالەمێ ژی عەفو بكی ئەو ژی دبە.

[٤] هەڤالێ حەقیێ بە سوند خارێ حالێ من بەریكا نەبی ما تو وێ وەكە نوشی ڕەوان بی د وەك هەڤیێدا عەدالەتێدا.

[٥] مە دخازی ب دیندارییێ ئەز نەمینم ڤالا ژ هەڤالەتیا حەقیێ حەق دێ یار بت.

[٦] تو دناڤا مە دە یەك وەسایی سپاسیا تە تێتە كرن مەرداهیێ دناڤ مەدە مەحموودی، بۆ بریندارا تو وەكە مەر هەمێ بی ژ نەساخارا هەر هولی خوەش بی.

[٧] حەژێكرن ژلایێ خوداڤە نەبت حەژێ كرن ژی وێ نەبە . ب حەژێكرنا ئیلاهی پەیدادبە . دەڤ و دل نە وەك هەڤ بخو ب دەڤ خوەش كرن فێ كیێ وێ نینە بێ نامە.

ب فـــــەضـــــلا خــــۆ توڤـــا لێڤـــا بـــۆ چـــەنـــا
بكـــە باســــفيك بكێشـــە حـــەمـــد و ثـــەنـــا[٢]

وەكـــى پـــالوكێ قـــەت ســـەكـــن بـــۆ نـــە بـــى
وەكـــى فابريقـــا (كـــن) دەوام بـــۆ هـــەبـــى[٣]

شـــبى فـــەلـــەك و چـــەرخ و دەورێـــن ســـەمـــا
د فـــەرمـــان و كـــاردە ب ذكـــر و عـــەمـــا[٤]

تـــو كـــەليمـــا شـــەهـــادەت ژ مـــن نـــەبـــڕى
د دەڤـــى منبـــە تـــا نـــەفـــەســـا ئـــاخرى[٥]

حصـــولا دنـــێ قـــەط تـــەمـــام نابـــە قـــەط
(ألا بعملـــي صـــالحي) نـــە ســـەقـــەط[٦]

شـــئووما گونـــەهـــان خيـــرا دنـــێ و ئـــاخرەتـــێ
تارومـــار كـــرن بگـــرە ڤـــێ ســـيرەتـــێ[٧]

---

[١] ئايينـەك بـێ سياسـەت ڕاسـت و درسـت مـن دڤێـت و براتيـەك بـێ مـەزناهى وەك هـەڤ مـن دڤێت.

[٢] ژ كەرەما خوە تو ڤان لغابا و چەنا ژ هەر دوو لايێن دەڤى مرۆڤى ژێرە دبێژن لغاب يان لخاڤ. چەن دبێـژن ئەرزين بكە وەكە دەريا پاس فيكێ دا هەر حەمەد و سەنا بۆ تە بكەن.

[٣] وەكى پالوكێ (مەعمەلێ) سەكن راوەستان بۆ نەبت.

[٤] وەكە چەرخ و فەلەكا ئاسمانا بت نە ڕاوەستێ هەر و هەر دفەرمانا تە دابت بزكر كرن و كاركرن.

[٥] تو پەيڤا شەهادەتێ ژ من نە برِى د دەڤێ من دا بت حەتا نەفەسا داويێ ئەز بدم.

[٦] بەرهەڤكرنا دنێ و مالێ وێ قەد تەمام نابە قەت، ئيلا ب كريارێن چاك كو نە سەقەت بت، هنگى مرۆڤ دونيايە دا كريە.

[٧] شومەتيا گونەهان خێرێن دنێ و ئاخرەتێ تارومار دكە ئەڤێ رێكا هە ژ خوە ڕە بگرە بەر نەدە.

دەرهەمەك ژ مالێ عیبادا هەشت هەزار چار صەد نمێژ

ژ ڤێ نەبە مەغرور ب حەج و طاعەتێ شەڤێن درێژ[(١)]

د ترازیێ شەرگرانن خێیر سڤك تێنە دیار

ژ ڤێیە یەك درهەم حەرام ئەڤ قاس نمێژكر تارومار[(٢)]

ئایەتا (لاتبطلوا صدقاتكم بالمن والاذى

وەك ڕیاء غشا غاش سەبەبێن حەبەطا عەمەل[(٣)]

دلگورێ د پۆستی مهێدا ب حەرام سەر خۆش و گێژ

پوڕ خەشیمە یێ ب بێژە دینێ من یەك حەج و مێژ[(٤)]

(ئەن) موهیم تەركا گونەهان بێ خەطا كەس نارە (نار)

(لايعذب أحد منا بلا بذر (البوار)[(٥)]

هەم (أتدرون من المفلس) د صەحیحا موسلمە

خۆی حوقوقان مێژ زەكاتێن وی ژڤاندن ئاملە[(١)]

---

(١) یەك دەرهەم ژ مالی عەبدا مرۆڤ بنەحەقی خار بە ڕۆژا حەسابێ هەشت هەزار و چار سەد خیرا نڤێژێ دكەڤە بەدەلێ وێ. دەرهەمێ ژ ڤێ نەخوە ب كریارێن خوە یێن شەڤێ درێژ پێ نەخرڕهە خوە پێ مەزن نەكە.

(٢) شەڕ گونەهـ ژ خێرا گرانترن خێر سڤك دیار دبن ژ ڤێیە یك دەهەمی حەرام ئەڤ قاس نڤێژا تارومار دكە ژناڤ دبە.

(٣) ئو ئایەتا (لاتبطلوا) هوون خێرێن خوە بەتال نەكن نخوەشی و منەت كرنی ل سەرێ هەوە خێر پێكری. وەكە ڕوومەتیێ حیلا حیلەكاری ئەڤێن هە دبن ئەگەرا ژ ناڤ چوونا خێر و خێراتا.

(٤) ئەو كەسێ دلێ وی وەكە دلێ گورە دپوستێ كەڤەلێ مهێ دایە. ب حرامی و سەرخوەش و گێژە گەلەك نەزانە ئەو كەسێ بێژە ئایین نڤێژ و حجەكە.

(٥) یا گرنگ نەكرنا گونەهانە بێ سووج و بێ خەتا كەس نا چە دوژەهێ نایێتە عەزاب دان یەك ژ مە بێ توڤێ نەباشیێ و ستەمێ كرنێ.

سەیدایێ مەکی د حەقێ فاعلی غش دا گات
(لا صلاة ولا صوم ولا حج و زكاة) [2]

ئبلیس ژ من دوورکە تو وێ دەمێ
ڕۆحێ من ب تەوحید ڕە ژ ڤێ عالەمێ[3]

دگەل من بە ئەو ئەحەدی ئەبەدی
(ترفیع) من بە ل ملێ من گەدی[4]

وەیە ل بەر چاڤا پڕ بچووك تێتە چەن
وەلی ژ قودرەتێ (قل، دل و فن)[5]

بەدەن تلفزیون پشتا قوف مە عوود
ژ هەمهموو نال و نالە دل مەستی بوود[1]

---

[1] حەدیسا (( هوون دزانێن یێ موفلس کیە ژ مرۆڤا هەڤالا گۆت یا قاسدێ خودا ئەم دبێژن موفلس ئەو کەسە نە زێڕی وی و نە زیڤێ وی هەیە. قاسدێ خودێ گۆت نە ئەوە بەلکی ئەو کەسە یێ تێتە بەر حسابێ نڤێژ کرنە، ڕۆژی گرتنە و خێر کرنە لێ مافێ عیبادی ل سەر هەیە دەعوەچی دهێن خێرێ وی ژبەر حەقێ خوەڤە دبن خێر تێرا وان ناکن، گونەهێن خوە داتینن سەر گونەهێن وی ئەوە مفلس)).

[2] سەیدایی مەکی دەربارەی ی حەقێ ئەو کەسێ حیلە کارێ دکە گۆتیە تە نڤێژ نینە تە ڕۆژی نینە تە حەج و زەکات نینە ژبەر کو دعوە تە هەنە تە مالێ ڤی خاریە تە ستەم کاری کریە هەمی خێرێن تە دگەهن وا کەسا ئەوێن کو دەعوەچینە.

[3] شەیتانی ژ من دوور بکە ل بەر مرنێ تو وێ دەمێ رحێ من ب یەکیتیا خودا ڕە ژ من وەرگرە ژ ڤێ عالەمێ دەرینە.

[4] دگەل من بە ئەو خودایێ تاك و تەنیا ئەوێ کو یەکە و هەر هەیە وێ هەر هەبت ئەپلەیا من ل سەر ملی من بە دگەل ڤی گەدەیێ بە.

[5] وەیە ل بەر چاڤا چەن گەلەك بچووك یێ ژ قودرەتێ ((قل و دل وفن)) ئەڤا هەر سێ وانا مەعنا د خوە دە دگر هندکە یێ کورە و تەژیە.

ب قاس ذەڕە نوورێ ڤەناکە مە لەب
وە هەر یەك ب زمانێ تەڤان ڕوز و شەب[2]

ل سەر سەیدێ عالەما تە ژ عەرەب
وە ئال و صەحابان و ئەهلێ ئەدەب[3]

صەحیح ئەڤە عالم ئەمرێ ب عوڕف بکە
د گەلەك نەهی و مونکەر چەندا ئەو نەکە[4]

بێ سووج و خەطا ئەنبیاء و ڕوسول
عالم دێ ب بێژە نە بێژ کا عەمەل[5]

سەری (البقری) درو پەری کچك
خودا گۆت د ڤێ (کیتابێ) نینە تو شك[6]

هیدایەتە بۆ موتەقین
ب غەیبێ ئیمان و باەری[7]

نمێژێ بکن مالدار مالی بدن
(کیتابێن) مونزەل ژێ تەصدیق بکن[1]

---

[1] لاشێ مرۆڤی وەکە تەلەفزیونێیە پشتا مرۆڤی ئەوا قوف بوویی سەر هەڤدە خوەهر بوویی وە دەزگاهێ عودێ یە ژ هم هم و نالە نالێ دل مەست بوویە.

[2] هنگە زەڕێ ڕۆناهیێ سپاسی مەندەڤی و هەر یەك ژ وان ب زمانێ ڕۆژ و شەڤ.

[3] ل سەر سەیدێ عالەما نەبت ئەو کو عەرەبە و ل سەر ئەهلێ مالا وی و هەڤالێن وی بن ئەوێن کو ئەهلێ ئەدەبێ نە.

[4] یا ڕاست و درست ئەڤە زانا فەرمانێ ب باچاکیێ بکە. دگەل فەرمانا بنەکرنا یا گەنەهـ ژی چەندا ئەو پێك نەینە ڤێیا هەژی.

[5] بێ سووچ بێ خەتا ئەنبیا و قاسدێ خودا و زانایێن ئایینی دڤێت ب بێژن بلا نە بێژن ما کا کێ بێ عەمەل دکە.

[6] شاعر ژ سەرێ سورەتێ (البقرة) تاخڤە ب بوەزن تەفسیر دکە د ڕوپەلێ بچووك دا خودێ گۆتیە دڤێ پەرتووکێدە تو شك تێدە نینە.

[7] ڕۆناهیە بۆ وا کەسێن کو ژ خودا دترسن بتشتا نەدیار بباوەرن.

ب ئاخرەتێ ژی باوەری وان هەبە
ئەڤان موهتەدینە (فلاح) دێ هەبە[٢]

ژ غەیبێ مەلائیکەت و ڕوسول و کیتاب
وەکی (حق تعالی) د قەبرێ عەذاب[٣]

جەهەنەم و جەننەت قیامەت و حەشر
مەحکەمێ کوبرا تەڕازی و پر[٤]

قورئانا سەماوی شەلیتە ژ ژوور
د وارێ کورایە ل سەر ڕیا دوور[٥]

ل ڕاستیێ تە (قورئان) ل چەپ سونەتە
صیڕاطا سەویە ئەوێ بەرنەدە

نە حاکم و میرم بێ چارە فەقیرم
دە بۆقان و قیرم ل پێپلکێ دەر[٦]

---

(١) نڤێژا دکن و زکاتێ ژ مالێ خوە دەرتینن و باوەریا وا ب پەرتووکێن پیرۆز هەیە، هەر چار پەرتووکن.

(٢) باوەریا وا بوێ دونیا دی تینن ئەڤێن وها بن ڕێکا وان ڕاستە ل سەر هیدایەتێنە.

(٣) ژ تشتا نە بەرچاڤ و نەدیار ب باوەرن وکە مەلەکا و قاسدێن خودا و پەرتووکێن پیرۆز و خودا عز وجل. وعەزابێ دگوریدا.

(٤) دوژەهـ و بەهشت و ڕۆژا ڕابوونێ و بەرهەڤ بوونا مرۆڤا ل بەر حەشرێ و دادگەها مەزن و مێزین و پرا سیراتێ.

(٥) پەرتووکا ئەزمانی قورئان وەرسێ خودایە راستە و درستە ژ ژورێ هاتیە عەردێ ژبۆ کو مرۆڤێن کور رێ نەناسی پێ ڕێیا ڕاست ببینن. ل ڤی واریە ئەو ژی یێ کورایە ور دوورە.

(٦) ئەز نە دادوەرم و نە میرم مرۆڤەکێ بێ چارەمە و فەقیرم دەبوقانم دەبوقان مادەك دەبوشە بدارا مازی ڤە چێدبە بەرێ تانین چێدکرن ل بەر چووکا ڤەددا چوك پێ دگرتن ل چیایێ کوردستانێ هەیە کر نە مەسەلە ما تو دەبوقانی ژ من ڤە نابی قیر ژ خوە ناسکریە. ئەز ئەوم ل بەر پێپەلانکا دەرێ تە ڕانابم.

به سازى مه ئاواز ڕەباب ژى دبەر
تلێن موطربێ تە د لەزن ل سەر[1]

ل من تا نە بێرى چڕا من نە دى
نەفەس تا هەبيتن ڕا نابم ژ دەرى[2]

مە ئازەر ببينە ژبۆ مصحەفێ
موبلغێ وێ بم د ڤێ مەتحەفێ[3]

تو جامعێ جەمعا ويكە د حەوصەلى
تووى ژى بەردم ژ ئاخر ئەوەلى[4]

مە سينە تژى بە ژ موهيماتێ دين
ب ڕاستى و دروستى ب بێژى و بخوين[5]

مە بەردەڤكێ ويكە ژ هەر دەم خەبەر
شەب و ڕوژ د خەباتێ رێ ناسێ بەشەر[6]

د علم و حكمەتێ باسفيكێ تە بم
ددانێ دا طوبايێ و فيكيێ تەبم[7]

---

(١) ساز و ئاواز و بلور ئەڤێن هە هەمى ب من ڕا نە و ل بەر دەريێ تەمە يا ڕەب تلێن من بێ تە د لەزن ل سەر وا ئاميرا.

(٢) هەتا تو تەماشە من نەكى بو چ من نابينى هەتا ئەز ساخ بم رانابم ژبەر دەرێ تە.

(٣) من بكە ئازەر ژبۆ قورئانێ ئەز وێ بێژم د ڤێ موزەخانيدا يان قەڕواشێ وێ بم.

(٤) تو هەر تشتێ كۆم دكى كۆم بكە و دانە دقركا مە دە ئەوى ژ ئەوەل و داويێ ڤە بەرنادم.

(٥) مە سنگ پر بە ژ وا تشتێت گرنگ د ئايندە ب ڕاستى و درستى بێژم بخوونم.

(٦) مە بكە بەردەڤكێ قورئانێ ژ هەردەمى ئەز باخڤم شەڤ و روژ د خەباتێ ڕێێ ناسيێ مرۆڤا بم.

(٧) علمى حكمەتێدا دا ئەز پا سفيكا تەبم د دانێدا وەكە دارا توبايێ بم هەرفيكى ئەز بدم تو با وفيكى يێ تە بم يارەب.

جهـ ژ فـوڕات حـەتـا ب گورجـان
دیـم پـەری گـەردەن ژ مـەرجـان[١]

صـەد غـەبینـە ئـەو ژ قـەنجـان
مـا بـووی ڕووسـی فـەسـاد[٢]

ژنـا گۆتـە جیهـاد گـەشـتە صـەحبـێن گـوزین
بـۆ مـە ژی نهـن ئـەو ڕەسـولێ ئـەمـین[٣]

جـەواب دا جیهـادا وە قسـمێ ژنـان
ئیطاعـەت مێـرە ژ کێلـەکـا وان[٤]

ژنـا بـێ ئـذن چـوو ل جهـەك دی بنڤـە
ژ مـەلائیکـەتـا لـەعنـە ل وی تاڤـەصـڤە[٥]

ژنـا پـەردە یـا حورمـەتـا خـۆ دڕانـد
ژ حوڕیـەتـی کـەتـە وەحشـەتـێ هلفرانـد[٦]

تـەختـێ بـەلقـیس ب ذڕاعـێ ئـادەمـی هـەشـتی و چـل
ژ سـەبـە ئاصـف ب علمـێ د طـەڕەف ئـانی نـە ب مـل[١]

---

[١] وەلات ژئاڤا فوڕاتی و حەتا بگەهە گورجستانێ مرۆڤێن وا وەکە لێ پەریا و گەردەنا وا تژی مەرجان تێدە هەنە.

[٢] سەد حیف و مخابن ئەو ژ چاکانە مە نە بۆ ڕووسیێ فەساد.

[٣] کۆما ژنا گۆتنە قاسدێ خودا هەڤالێن تە یێ چاك ژبۆ جیهاد برن کا بۆ مە نینە قاسدێ خودایێ ئەمینی.

[٤] بەرسڤا وا دا گۆت جیهادا هەوە یا ژنان ئەوە هوون گوهداری مێری خوە بن ل ڕەخ وابن.

[٥] ژنا بێ دەستورا مێرێ خوە چولجهەك دیێ نڤست ژ مەلەکا لەعنەت ل واتێتە کرن هەتا د بەسبە.

[٦] ژنا پەردا ئا حۆرمەتێ ژبەر خوە ڕاکر، دڕاند، ئازادیا وێ ناچنە دەرکەڤە و وەحشەتێدا ژ ناڤا کۆما مرۆڤین چاك دەردکەڤە.

ل خودێ خۆ نە نێری بیاوی نەکر
ناموسا مێر پێرا خوەیتی لێ نەکر[٢]

ژنا گۆتە مێر قەت مە خێر و خۆشی
ژ تە من نە دی وەیل ل من بەخت ڕەشی[٣]

چوو کوفرانێ نیعمەت سەر قەدەرێ
نە سەکنی ژ ئەمرێ خودێ خودەرێ[٤]

ئەڤن یێن نەبیێ مە دیتن د نار
عەذابێ د کێشن هەوارە هەوار[٥]

دەر حەدیثێ ئەهلێ فەضلی تا هەبن هوون ب خێر و پاک
تا کو ئەو چوون بۆ موساوات ئومەتێ دین دەر هیلاک[٦]

یەعنی ئەهلێ فەضل و خۆفێ تا هەبن نابت خودا
ب ڕەحمەتێ ل عامێ دنێڕە ب دوعا خاصێن خودا[١]

---

[١] تەختێ مەلکا یەمەنێ کو نافێ وێ بەلقیس بوو ژ سەبەئێ وەزیریێ نەبی سولەیمان بوو ل قودسێ بزانین و عیلم د حدودێ چاڤ نە قازدنەکردا ئامادەکر.

[٢] ئەو ژنێن ل خودا یێ خوە تەماشە نەکرن ژبۆ دەستورا وی نەگوهداربوون ناموسا مێرێ نە پاراستن لێ خودان دەرنەکەتن.

[٣] ژنا گۆتە مێرێ خوە هەتا نها من خێر و خوەشی دبن داریێ تە دامن نە دیتیە ویلی. قرکێ ل منێ من ب ڕەشیێ ئەز بەخت ڕەشی بووم کو ئەز کەتم بن دارێ تە.

[٤] گازندا چاکیا کر ژ قەدەرێ نەڕازیبوو ل سەر نە سەکنی، ژ فەرمانا خودایێ خوە دەرکەت ونە ڕازیبوو بنەسیبێ خوە.

[٥] ئەڤێنی وەهانە قاسدیێ خودا دەما چووی عەسمانا دیتن و یێ تێنە سزادان و عەزابێ د کێشن هاوار هاوارا وایە.

[٦] د حەدیسێ دا هاتیە حەتا مرۆڤێن چاک و خودانێن خیر دناڤ هەوە دابن هوونێ بخێر و پاک بن دەمێ ئەو ژناڤ هەوە دەرکەتن و چوون نەمان هەمی بوون وەکە هەڤ ئاینیێ ئومەتێ وێ بێتە ڕابوون و چوون.

ئـــەو ئـــەون طـــەنگيـــا دا عـــامێ ئيلتيجـــا وانـــە ب وان
ژ دەئێينـــا وان دگـــرن شـــيفا خـــۆ هـــەم ژ ئـــەخلاقـــێ وان[٢]

هـــەم د حـــەديثـــێ ب خاطـــرێ وان صـــالحان تۆڕحـــەمـــوون
ب عـــالێ جـــاهێ وان خـــەواصـــان تـــو مطـــەڕونـــە تـــورزەقـــوون[٣]

(ولاتنظـــــر الـــــى الاســـــباب نهانـــــا الشـــــارع عنـــــه)
ئـــەگـــەر وان تـــو بكـــى فاعـــل بـــەلاڤـــن فكـــره ونداب[٤]

كـــوفر ژی ل بـــەر تـــە دێ ڕابـــە ب تـــەوحيـــد ل بـــەر تـــە دێ ونـــدا بـــە
موســـەبـــب يـــێ كـــو ئـــەو دا نـــە بـــووی ڕوو نـــە بـــووی ڕابـــە[٥]

قياســـا ئـــاخرەتـــێ ل دونيـــێ نـــەكـــە ب عـــەقلـــێ تـــە دەرناخـــە
خـــودا قـــادرێ هـــەر تشـــتێ ب ڤـــێ دێ بـــە نـــەڤـــی نابـــە[٦]

دەمـــا عـــەقلـــێ تـــەك بـــوو حيـــرەت و عـــەجـــزا تـــە تـــەوحيـــدە
ب دەلـــيلا ســـەمعـــێ خـــۆ بگـــره ب عـــەقـــل و ڕەئيـــێ ئـــەڤ نابـــە[١]

---

[١] يانى خودانێن چاكيێ و ترسا ژ خودا حەتا هەبن، خودا ب چاڤێ ڕەحمەتێ وێ تەماشە وە بكێ ب دعايێن چاكێن خوە بۆ هەوە.

[٢] ئەو چاك ئەو كەسن د تەنگاڤيادە خەلك خوە دسپيرن وان بۆ خو ژ دوعايێن وا شفايێ ژێ وەرگرين و ژ وا ئە خلاقژی ڤێردبن و گەلەك تشتێ ديژی.

[٣] هەروەسا دحەديسێدا هاتيە ل سەر خاترێ وان چاكان ڕەحم ل هەوە تێتەكرن ب شەڕەفا وايا بلند يا وا چاكا خودا بارانێ سەر وە دە د بارينە و هوون تێنە خودان كرن، رزق دان.

[٤] تەماشە نە بال ئەگەرا ڤەبكە ئەوێن كو خودا، شارعى. گۆتيە مە نەكن ئەگەر تو وا ئەگەرا بكى فاعل، كروك، ئەو بەلا ڤەنە فكرا ئەو بێ وندا ببە.

[٥] كوفر ژی وێ لبەر تە ڕا بە. بە بەر ييێ ب تە ڕە بكە، يەكيتيا خودا ل بەر تە وێ وندا ببە، ئەو يێ ئەگەرا وێيە ئەو چێكريە. گوهێ خوە بدە وی ب وی ڕابە ب وی ڕوونە كو خودايە.

[٦] ئاخرەتێ وەكە دونيايێ حەساب نەكە ب عەقلى تە دەرناكەڤە، عەقل ژ گەلەك تشتا نابرە. نكارە وا ژ هەڤ دەرينە. خودا كارێ هەر تشتێ ب ڤێ وێ ببە نە ڤێ نابە فاعلێ مختار ئەوە.

بۆ هەر تشت یەك وەصف نسبەت یا خالق سۆڕەتێ ئیخلاص
تەژی ئەوصاف و تەوحیدە شبی دەریایە هەو نابە[٢]

تو فکرە سورێ (الخناس) چ ئافاتە ژ دەستێ و وەسواس
ل پێ نەڕەوەکی گەلەکان تە د بە کوفرێ چ کەذابە[٣]

حەدیث و ئایەێ بگرە دلێ خۆ ل وان بسەکنینە
کی ئەو علمێ ئیلاهینە ژ وی زاناتر تو کەس نابە[٤]

علمێ مە بنسبەت علمێ خودا چویك نوقطەکی ژ بەحرێیە
هلینە هندك وی دامە بلا قورئان تە سەیدا یە[٥]

نەزانان ژ ڤان جنایا تو قیصاص و حەد و ڤان فەڕضان
تەحەمول نەکرن ژ بن بار ڕەڤین گۆتن بلا هابە[١]

---

[١] دەما عەقلێ تە کو هەبوو ژ تشتێ نە بڕی ئەو حەیراندن و نە کارینا تە د بەیەکیتیا خودا. هنگی ب دەلیلا کو تە بهیستی یە ب وی کار بکە عەمەل بکە ب عەقل ل و ڕەئیی چێنابە تو پێ عەمل بکی. "قل هو الله احد" (اخلاص: ١).

[٢] ژبو هەر تشتی یەك وسفێ وێ هەیە دبێژن وەك فلان تشتیە یا خودا سورەتێ (قل هو الله أحد). ئەڤ سورەت تەژێ وەسفێن خودا و یەکیتیا ویە وەکە دەریایە هەو نابە و خلاس نابە.

[٣] تو بێژە سورەتێ "قل اعوذ برب الناس" (الناس: ١) چ ئافات و نەخوەشیە ژ دەستێ شەیتانی. وەسواسێ. ل دووڤ وێ نەچە وەکە کو گەلەك ل دووڤ دچن وا دبە کوفرێ چەند دروزینە (کەزابە).

[٤] ل دووڤ حەدیسێ و ئایەتێ هەرە وا بگرە پێ خوە ل سەر وان ڕاوەسینە ژبەر کو ئەو زانینێن ئیلاهینە ژ وی زاناتر کەس نابە و نینە.

[٥] زانینا مە بەرامبەری زانینا خودا هەر وەکی چیچکەك. چ ڤیکەك نکلی خوە ل دەریایێ بدە و دەرینە کا چ ئاڤێ ڕادکە یێ مە ژی هندەیە زانینا مە گەلەك هندکە ل بەر یێ خودا، بلا قورئان ژ تە ڕە سەیدابە.

ئیبن خلدون سەر ئیمانێ خەبەر دا ب وەجهەکی ئەحسەنە
ژ مەئالێ وێ یووسف ئەڤ پەندێ مازن ناسکە نە وندا بە[٢]

دبیم هەر تشت خودا دایە وەسواس گۆت ما کێ ئەو دایە
مەشەهدا خو ئانی من گۆت: مەلعوون ب قەشتە ژ هر ڕابە[٣]

یەك نەزانە بخۆ نزانە هەم قەبوول ناکە نەزانە
ئەحمەق بێ دەرمان و دانە کەنگی دین کامل دبە

چاڤ نە دە وان سەد نیازێن تە ب وان سەیر و صەفا
مەڕحەبایێ نە دە کەیفا ل تە ببت جەور و جەفا

ژ ئەزەل دا پڕۆژە خودا دانیە
حەکیمە دەرمانێ هەر کەس ذانییە[٤]

ما ژ قیاسا ڕەحمەتی ئەڤ باسفیك یەك قەطرەتێ
کەون و مەکانا عالەمێ ل بەر ڤی موحیطێ ذەڕتێ[٥]

---

(١) مرۆڤێن نە زان ژ ڤان کریاران وەکە یەك ژبەر یەکیڤە بێتە کوشتن یان یەك عەرەقێ ڤەخوە شەلاقا لێ بدن وەکە چل دارا یان فەرزا و نڤێژ و ڕۆژی و حەج و زەکات. نەکارین ژ بن ڤی باری دەرکەڤن گۆتن هەما بلا وهابە دەست ژی بەردان.

(٢) زانایێ مە ئیبن خەلدون خودانی پەرتووکا (المقدمة) د بارا باوەریێ دا ئاخاڤتیە ب ڕەنگەکی گەلەك باش ژ وانا وێ من ئەڤ دە رانیە وەك شیرەتەك مەزن ناس بکن نە وندابە.

(٣) من گۆت و دبێژم هەر تشت خودا چێکریە شەیتانی گۆت ما کی ئەو چێکریە، من شەهدا خوە ئانی من گۆت مەلعوون ب قەشتە ژ هر ڕابە هەرە. ل فر شولیێ تەنینە.

(٤) ژ ئەزە لڤە خودا پڕۆژە دا نیەکا چاوانە هەر تشت وێ چاوا بت دەمێ وێ چەندە . زانایە حەکیمە دەرمانێ دەردێ هەر کەسێ زانیە.

(٥) ما ژ قیاسا ڕەحمەتا خودێ هەکە مرۆڤ بدە بەرهەڤ دەریا باسفیکی یەك دلۆپە ژ ڕەحمەتا خودا هەبین و مەزناهیا ڤێ عالەمێ ل بەر دەریا موحیتا ڕەحمەتێ وەکە زەرەکیە.

فرەهیا ڕەحمەتا باری تعالی
ژ نەصێ بۆ مە ببێژەنە ژ قیل و قالا[١]

(وسعت کل شيء) د مەصحەفێیە
نڤینە هەم نیڤانا عالەمێیە[٢]

ب تەقوا بلباسین بین مەسطەڕە
ل ڤیدێ ل وێ دێ نەبن مەسخەرە[٣]

ب موحیطا ڕەحمەتێ تو مە ستارکە
د فیردەوسا بەری دا مە ب قەڕارکە[٤]

بزان هەر کەسێ حالەتەك وی هەیە
ل نك ڕەبێ عالەم حوضوورەك هەیە[٥]

ژ قورئانا ژۆریە (خلق النبي)
سەلەفێن صالح ژی ژ صەحبێن نەبی[٦]

---

[١] فرەهیا ڕەحمەتا خودا تەعالا ژ پەرتووکا پیرۆز نە ژ گۆت گۆتا ئەڤ بێژێت هندە ئەو بێژە هندە مەزناهیا وی.

[٢] خودا دبێژە فرەهیا وێ هەر تشتی د خۆ دە دگرە وەکە نڤینەکیە مرۆڤ ب خودا بدە و وەکە نڤانەکیە هەر تشتێ د خوە دە دگرە وەکە نڤینەکیە مرۆڤ ب خودا بدە و وەکە نڤانەکیە هەر تشت د کارە هەرە تێدە هند مەزنە.

[٣] مرۆڤ ب تەقوایێ جل کریبە مرۆڤ دبە نموونە ل ڤێ دنێ ول وی دنێ ژی مرۆڤ نەبە جهێ پێکەنینێ.

[٤] یا ڕەب ب فرەهیا ڕەحمەتێ مە ستار بکە د بەهشتا بەرین دا مە بجھ و وار بکە.

[٥] بزانبە هەر کەسێ حالەتەك یێ وی یێ تایبەت هەیە لبا خودایێ عالەمێ حوزوڕ هەیە ئەو پێ دزانە.

[٦] ئەخلاقێ قاسدێ خودا ژ پەرتووکا پیرۆزە ژ دایکا عائشە پرسینە گۆتنە ئەخلاقی قاسدێ خودا چاوانە گۆتیە (خلقه القرين) ژ قورئانێیە سەلەفێن چاك ژی ژ هەڤالێن وینە. ئەو ژی بەهرە مەزدن ب وی ئەخلاقی.

عولەمائێ سونەتێ ژی ل پێ ئەڤان
ژ ئیجماعێ قیاسە نەبە ضدێ ڤان[١]

ژ هەر چار ئیمامان قەڕار مە ئەوە
حەدیث گەر صەحیح بە مەذهەب مە ئەوە[٢]

نەبی گۆت: فەقیر ئەمانەت یێ ڤەشارت ژێڕا عیبادەت
یێ دیارکر وی خۆ کر بار سەر برایێن مسلمین[٣]

مە ڕزقێ خودا خار شکودار نەبوون
د دەفتەرا خێرا ڤە ئەم قەید نەبوون[٤]

شبی پیرا شخرا عومر ل هەشتێ
ژ نوو ڤە د خەباتێ و ڕۆژێن مە چوون[٥]

---

[١] زانایێن ئومەتێ ژی یێن تابعێ سونەتێ ل پەی ڤانە. ژ کۆما وان قیاس چێبوویە نەبە دژی وان.

[٢] ژ هەر چار پێشەوایێن مسلمانا بریار مە ئەوە هەکە حەدیس درست بە مەزهەب ئەوە.

[٣] قاسدێ خودا نەبی گۆت بۆ یێ هەژار، فەقیر و قەلندەرە. ئەڤ ئەمانەتەکە کەسێ ڤەشارت ژێ نە ئاخڤت نە گۆت بۆ خەلکی ئەز فەقیرم. ئەو فەقیر ژیرە خێر تێتە حەسابی. کەسێ دادەر ئو چو مروڤا ڕە گۆت ئەوی خوەکرە بار ل سەر مسلمانا دڤێت وی خودان بکن.

[٤] ئەو ڕزقێ خودا دایی مە مە خار لێ شوشکرێ وی ل سەر نەکر. کو ئەڤ ڕزقێ بەلاش دایێ مە دەفتەرا خێرا دە ئەم نە هاتن نڤیساندن.

[٥] وەکە پرا شخرا عەمرێ من چووە هەشتێ سالا ژ نوڤە مە دەست ئاڤێتە خەباتێ لێ ڕۆژ مە نەمانە و چوون. مەسەلا پیرا شخرا ل گوندەکی پیرەك و کەچا خوە هەبوون، هاڤین هات بۆ دەمێ شولی و بەرهەڤکرنا قوتێ زڤستانێ. پیرێ گۆتە کەچا من ما ئەمێ ژ چرا شول بکن تو وێ مێر بکی و ئەز ژی وێ بمرم پیر بۆ تە هاڤین خلاس بوو کەچێ مێر نەکر پیر ژی نەمر. بەرێ فەقیر دچوون ل قاتێ وەستیێ گەنم کۆم دکرن ژ خوە ڕە زاد ژێ د کرتن هلتانین ل قات ژی نەما ژناڤ زەڤیا پێ دەوارا شخرە د کشاندن

مە عەیبەك هەبیتن یێ بۆ من ببێژ
مە بۆ وی تەشەكور ژ مە بر ئەو قرێژ[١]

مە خاكێ زەمین خالقێ وێ خودا
وارثێ صالحینن خەلیفێن خودا[٢]

سەر وەضعا ئیلاهی قورئان ئاخرەتێ
نە ل سەر ڤان دونیا و ئاخ و خەتێ[٣]

مە وارث بگیرە حەدیثێ نەبی
ل عامی ب ڕێژم كە رەغدێ نەبی[٤]

د نمێژێدا (ایاك نعبد نستعین)
بمینە نە ب حیل و غەرەض دەرەوین[٥]

ب خالق ڕا سوزێ د دە طاعەتێ
من بۆ تە تنێیە وە هەر حاجەتێ

---

پیرێ گۆتە كەچا خوە ڕابە ناقەتە چوون سەریا شخرە چیا لێ بێ فەیدە بوو ئەو بووبە مەسەلە دبێژن وەكە پێرا شخریە.

[١] دبێژە هەكە من عەیب بۆ كیماسیەك هەبت یەك بۆ من بێژە ئەڤ كێماسیی تە هەبە ئەز سپاسیا وێ دكم ژبەر كو ئەوێ قرێژ ژ من ڕاكر، هەكە یەك كیماسیا مرۆڤ بۆ مرۆڤی بێژە دڤێت مرۆڤ كەیف خوەش بە نەك تووڕە بە.

[٢] ئەڤ دونیا هە چێكەر و یێ ئافەراندی هەر خودایە. میراتگەرێن وێ مرۆڤێن چاكن ئەوێن خەلیفێن خودا نە ل سەر ڕوویێ ڤێ دنێ "ونجعلهم الوارثین".(القصص: ٥).

[٣] قورئان پەرتووكا پیرۆز ل سەر دانینا خودا وئاخرەتێە نە ل سەر ڤێ دونیا فانی و چاوا كەیفا وا بێت وەسا بێتە خوەندن، ئەو نابە.

[٤] یا ڕەبی من بكە میراتگرێ حەدیسێن قاسدێ خوە دا ئەز بۆ خەلكێ ببێژم وەكە تو دخازی و تە دڤێت

[٥] د نڤێژێدا پەیڤا "ایاك نعبدوا وایاك نستعین" (الفاتحە: ٥) سۆز و پەیمانە بۆ خودا ب حیلە و غەرەز عەرن و دەرەو نابە. دڤێت ڕاست و دروست بە ئەو سوند ئەو پەیمان.

خودا ناڤ ل قورئانێ کر
ل ئیتقانێ فکره ئەوی ذکر کر[۱]

خالص ژ تە تنێرا عیبادەت دکن
مە زوو زوو ل بەر تە بۆ کەسدی نەکن[۲]

ڕەبم نەدا من پێشەهیەك
دەعوا نە دونیا و بەلشەفیەك[۳]

د دیندا ببوو ما پێشەهیەك
مورشد و سەیدا وی دەلال[٤]

سەیدا تەجریبە لیبە علمی وی ژێ نەبی بە
شبێ ئەبی هورەیرە تو لازمێ ئەوی بە[٥]

سەیدا ژ شروطێ دینە ب وی تو ڕابە و ڕوینە
علمێ ژێ بکە خەزینە پرسا تە هەر بۆ وی بە[٦]

جاهل نە بێژە تشتم ب ئاگر و ب خشتم
کەرامەت یا نە مەکرە ل پێ سونەتا نەبی بە[۱]

---

(۱) خودا پێنجە و پێنج ناڤ ل قورئانێ کرنە، د پەرتووکا (إتقان) دە هاتنە گۆتنێ هەرە ل وی بنێرە تو دێ ببینی.

(۲) ب تایبەت ژبۆ تە ئەم تەنێرا عیبادەتی دکن بێ ڕومەتی خور و زوو بە زوو مە ل بەر تە و ژبۆ تە ژبۆ کەسەك دێ ئەم ناکن.

(۳) خودا پێشاهیەك ل ڤێ دنێ نەدایە من دوزخاز ژی من نینن یێ دنێ نە دە فکرین نە باش وەکە بۆلشەفیا.

(٤) هەکە د ئایندا ببووما پێشاهیەك ڕێبەر ومورشد یەکی باشی ئو دەلال من وەسا دڤیا.

(٥) سەیدایەك خودان ئەزموون و تەجریبە بت زانینا وی ژیا قاسدی خودێ بت وەکە ئەبی هوڕەیرە چاوا هەر دگەل قاسدێ خودا بۆ تو ژی وەسا لگەل سەیدا بە.

(٦) سەیدا ژ شەرتێن ئایینە بۆ وی تورا بە و تو ڕوینە پرسا تە بلا ب وی بە زانینا تە عیلم ژ وی فێرببە ژبۆ خوە بکە خەزنە پرسا تە هەر بلا ب وی بە، گۆتنەك شرینە.

نـه بێـژه سـەیـدا بـێ سیما وەك مـن بـەشـەر و كیمـا
بـێ جیـنس و ئـەصـڵ و فـەصـڵە یـان نـه ژ مـەیـە غـەریبـە[٢]

علمـێ وێ بـۆ جـەمالـە عـیش سـیرەت و مـەقالـە
شـەمسـا سـەمـا میثالـە دبـن ڕوهنیـا ئـەوێ بـە[٣]

(یـا ایـه هـذا السـاقي جهلـك مـن شـقاق)
عـالم حـەیاتـا بـاقی بـێ عـالم بـێ طـەبیبـە[٤]

دیـن كـوور و هـوور و دووره ژ بـێ علـم ڕا زێـده زۆره
ژ عـالم تـو قـەت نـەبـووره دەوسـا تـه ل دەوسـا وی بـە[٥]

ژ تـه بـێ سـەیـدا تـه تـەكبـە بـلا ژ هـزار ڕا یـەك بـە
دا ئـەو وەجـا تـه بگـره شـێو ڕا تـه هـەر ب وی بـە[٦]

ژ عومـەر ب زەهـری شـیرین تـا سـونەتـی نـه بـەردن
دەولـەت هـەر دێ ب ظـەفـەر بـه كـیم ناكـه وێ قـەوی بـە[١]

---

[١] یا نەزان نەبێژه ئەژی تشتەكم ئاگرێ من هەیه خشتێن من هەنە هندەك شێخ ئاگر ب كارتێن یان خشتا ل خوه یان ل خەلكێ ددن و بخوه نەزانن و جاهلن كەرامەت بێ یان مەكر و حیله بێ دووڤ ڕێكا قاسدێ خودا هەره..

[٢] نەبێژه نه ڕنده وەكه من ئەو ژی مرۆڤه و كیماسیێ وی ژی هەنە و بێ مرۆڤه و بێ عەشیره ژ كو یه خەریبه بیانیه نه ژ مەیه.

[٣] عیلم و زانینێ ڕندیا ویه عیش، ڕیبازه و ئەخلاقه وپەیڤ و گۆتنه وەكی ڕۆژ ل عەسمانایه تو دبن ڕۆناهیا ئەوی دابە. دا تو ژ خوه ڕه فەیدێ ژێ ببینێ.

[٤] با ئەوێ ئاڤێ ده نەزانینا ته ژ ژێك ڤه بوونێه تو ژ زانا دووركەتی یێ زانا ژیانەكا ئەبەدیه یێ بێ زانا بت ئەو بێ نوژداره.

[٥] ئاینی كوره و دووره و هووره بێ زانینی نەبه یەك جار زۆره تو ژ زانایێ قەت دوور نەكەڤە بلا ڕێكا ته ل دووڤ ڕێچا وی بت.

[٦] هەتا ژ تەبێت بلا سەیدایێ ته یەكەم بت دناڤ سەیدا ده ژ هەزارا بلا یەك دا ئەو ب كێری تەوەره شێورا ته هەر بلا بۆ وی بە.

عەقیدێ بۆ خۆ ناسکە نە جادە یە پێ باسکە
پیەك ل دەوسا پیکی پێ تە ل پێ نەبی بە[٢]

ئیمان باوەریا قەلبە ئیسلام شولەکی غەلبە
ئیختیلاف بۆ مە رەحمەت نە مونکەرێ ئەوێ بە[٣]

مە سونەتە و جەماعەت ب عەقیدێ ئەشعەری نە
(أم ما تریدی) حەقن هەفتێ و دوو باطلینە[٤]

چویکێ گۆتە دەما تە گرت بەرنەدە
دەما کو تە بەردا ل پێ نە کەڤە[٥]

---

(١) ژ ئیمامێ عومر کورێ خەتابی خودا ژێ رازیبە ب دەڤێ خوە یێ شیرین دگۆت هەتا رێکا قاسدێ خودێ نەێ بەردان دەولەت هەر دێ سەرکەڤتیبە کێم ناکە و وێ قاهیم بە.

(٢) عیلمێ عەقیدێ ژبۆ خۆ ناسکە داتو بزانێ چاوانە نە رێکا وەسایە هەر کەسێ سەردە هەرە وەکە جادێ بت بەلکی وەکە پێ باس کایە. ل سەر ئاڤا دە مرۆڤ د سەر وا دە دبوورە وەکە چەند بەرابوون دگۆتن وا پێ بازك پێ یەك ل دەوسا پیەکی دهاتە دانین پلا پیێ تە ل پیێ دەوسا پیێ نەبیبە.

(٣) ئیمان باوەریا ب دلە مسلمانی کارەکی سەر دەستە بارەك گرانە. نە وەك هەڤیا ئومەتێ رەحمەتە تو نەبە دژی وێ نە مونکرێ وێبە.

(٤) ئەم ئەهلێ سونەت و جەماعەتێنە. عەقیدە ئەشعەرینە ئەم و ماتوریدی راستن و حەقن هەفتێ و دووێ دی باتلن نەراستن نە درستن ل سەر گۆتنا قاسدێ خودێ دگۆت یەهودی بوونە هەفتێ یەك فرقە نەصارا بوونە هەفتێ و دوو فرقە ئومەتا من وێ ببن هەفتێ و سێ فرقە هەمی د ئاگردانە ژبلی یەکێ. ئەو ژی ئەوێن رێکا قاسدێ خودا بە و هەڤالێن وینە جەماعەتا مسلمانا.

(٥) چووکێ گۆتە دەما تە گرت بەر نەدە، دبێژن چیچکەك کەتە تەلها یەلید ئەوی ژی گرت چوکێ گۆت هەکە تو من بەردی ئەزێ شیرەتا ل تە بکم ما کوشتنێ من وێ چ فەیدا تە بدە ئەوی ژی بەردا چووك چو سەرێ دارێ گۆت هەکە تە گرت بەرنەدە و هەکە تە بەردا پەیی نەکەڤە هەر تشتی باوەر نەکە. هەکە ئەز سەرژێ کرباما دوورەك هنگە وەقیکی دگەورریا من دەبو تە دێ ژ خوە رە ببرا.

یا بووری نە بێژن نە دن ڕوو هەڤال
ژ خەبەر دا نا ب جهدا نە چن قیل و قال[1]

قەویتی یەکیتی جەمع ڕەحمەتە
ل عەکسا ئەڤانان عەذاب فرقەتە[2]

پاڕ طێ پەڕ طێ ژ هەڤ وەریس چەند سەرێ
ئەڤ ئیسلام نمیشێ نانێ چەند گرێ[3]

پار گێ مللەت و دین ژ هەڤ پەرطی
نکاری نەیاری چکو چەند قەتی[4]

کەڤنە مێرێ هەشتی ساڵی ژ مەقاما خۆ ڤەدا
ژ وە و خودا ڕا ئەڤ خەباتە ها دچم گور و هەدا[5]

هود هودم کانی سولەیمان من نە هار و نوو وەزیر
(ان القوم استضعفوني أنت لي نعم النصير) [6]

---

(1) زەلام دووڤ کەت چوکێ گۆت تو گەلەك بێ عەقلی چ زوو ئەو شیرەت تە ژبیرکرن پا چاوا ئەزێ بخوم کێشا من وەقیەك تێنینە. تە چاوا ژبیر کرد تشتا بووری نەبێژن نە دنە ڕوویێ هاڤالێ خوە ژ ئاخاڤتنا د جهدایە دا نەچێ گۆت کوتگا.

(2) قەوییا یا من یەك بن یەك بۆ کۆم ڕەحمەتە ژ هەڤ قەتاندن ژ هەڤ ڤەبوون عەزابە.

(3) پارتیتی تشتەك پەرتیە خوە ژ هەڤ بەردایە وەکە وەریس خوە ژ هەڤ پەرددەدبە چارسەری یان چەند سەری . ئەڤ ئیسلام نمونا نانیێ چەند کەریە.

(4) پارتی ملەت و ئایینی ژ هەڤ دوو د پەرتینە، نکاری نەیاری ژبەر کو چەند کەرە. نە هەڤ گرتینە، وەکە مە کوردا.

(5) پیرەمیرێ هەشتێ ساڵی دبێژە من ژ خوە مەزناهیا ڤەدایە ژبۆ هەوە و خودا ئەز ڤێ خەباتێ دکم، ئەڤە ئەز دچم گورێ و هەدا.

(6) ئەز وەکە هود هودێمە لێ ما کا خودانێ من سلیمان. ئەز نە هارۆنم و نە وەزیرم، هارۆن برایێ مووسا وەزیری وی بوو. هارۆن رەشید ژی هەبوو عەباسی بوو. خەلك من کێم دکن من ژار دبینن. تو هاریکارێ منی تو خوەش هاریکاری.

ژ حەدێ شەرعێ زێدە ظولم و ئیعتیدا
گەرکە موشرك بە (بمثل ما اعتدا) [١]

ئەگەر ئەم گهابوونا صەحبێن مەزن
ئەوان دێ ب گۆتا وەرن ئەڤ دزن [٢]

ئەمان نەبە مشکێ عەمبارا خودێ
ژ شەرعێ نە دزە توبە ژ ڤێ سدردێ [٣]

مەذهەب ژ مەذهەبێ دی تەعەصوب نەکر
چ وەیلە بی پارطیطێ دین دا ڤەکر [٤]

بۆ مە رووڤیێ ئور ئارای ب قیر و قیژ بالا تە خار
ئەڤ گوناهـ ل من بۆ نە میکروب ئەی خودا من ل تە هەوار [٥]

غەرنیکا تۆ پێ لەیستی کوزکا شەرێ بشار
مەڕحەبایێ نەدە کەیفا ل تە بزڤڕە بزەرار [٦]

---

[١] ژ حوودودێ شەریعەتێ زێدەتر نە بنە یاری خوەکر ئەو دبەستەم و زێدەگاڤیێ ژ مافێ خوە. هەکە یەکی مشرك تشتەك ب تە کر بە مافێ تە هەیە هنگە وی تو ژی ب وێ بکی نە زێدەتر.

[٢] هەکە ئەم گەهابوونا دەورا وە صەحابێن مەزن وێ گۆتبوونا وەرن ئەڤێن هە دزن بۆ ئاینێ خوە.

[٣] ئەمانەت نە بە مشکێ عەمبارا خودێ بۆ دزیێ ژ ئاینێ وی بکی ژ شەریعەت نە دزە توبە بکە ژ تەڤی قوڕەڤێ.

[٤] مەزهەب ژ مەزهەبا نە د عەنرین سل نەبوون. نە بۆ چ وەیلە مرۆڤی پارتی د ئایندا ئەڤ حزباتی ڤەکرن.

[٥] ئەز بۆ مە وەکە ڕووڤیێ ئور ئارای ب قیر و قیژ بەژنا تە خاریە ئەو گوناهـ ل من بوونە مکروب یا خودا هەوارا من هەر تو وی.

[٦] ئەوا تەبری تو پێ لەیستی ما وەکە کو زکا بشارێ چەتووە. نەدە ئەوا کو ل تە دزڤڕە مەرحەبایێ ئەو کەیف نە تو کەیفە.

د حیسابێ خودێ ژی دبێژه جاهلا
ته ژ عالمی نه پرسی ئەیا غافلا[1]

نەبێژ ئەڤ ئاڤ و دەڤە ژ بەری عەقل نا بڕە
یەقین کە خودێ چ ب ڤێ قادره[2]

ما تو خوەیێ عالەم وەك خان خۆی
د کێشی خەیالا خۆ هوو ژ چی[3]

ڕیا قورئانێ بوویە شەوك و دەغەل
نە تەجوید قیرائەت نە حوکم و عەمەل[4]

بەرەکەت ژ وان عولەمائێن بەری
ژ علمی موحیطی وان ژ پێغەمبەری[5]

ژ عوروج و بروجان ژ فەلەك و مەلەکان
قەڕاردان ب هەیڤێ چوونا ئاسیمان[6]

---

(1) د ڕۆژا حەسابێدە خودا دبێژە یێ نەزان و جاهل تە بو چ ژیێ زانا پرسیار نەکر داتو د ئایندە زانا بیایی یا نەفام وغافل.

(2) نەبێژە ئاڤا نەبی مووسا کو دارێ خوە ل بەری دا ئاڤ ژێ دهات و صالح پێغەمبەر هێشتر ژ بەری دەرانی عەقلێ من ژێ نابڕە. باوەر بکە خودا چ بڤێ بت د کارە بکە.

(3) ما تویی خودانێ عالەمێ وەك خانخویێ نوکەتی ناڤ خیالا دە هو دکێشی تو کولەیەك زەعیفی زانینا تە چیە و چەندە.

(4) ڕێیا زانینا قورئانێ بوویە شەوك و ستری و گلوگیا نە تەجوید مایە نە خوندنەك درست و نە حوکم پێکرن نە کارپێ کر و عەمەل.

(5) بەرەکەت ژێۆ وا زانایێن بەرێ بت ژ زانینا وایا بەرفرەهـ کو وا ژ قاسدێن خودا وەرگرتبوون.

(6) ژ چوونا وا با عەسمانا ژ برج و فەلەکێن عەسمانا و ژێ مەلەکان. ژ ڤێ بریاردان ب چوونا سەر هەیڤێ ل عەسمانا، ئەڤ مەسەلا چوونا سەر مانگی بەرێ سەدا سالا زانایێن

هنان صەد کیتابێن چەند جلد چێکرن
سەیدایێ نابلسی چار صەد چێکرن[1]

ل نك وان هەبوو علم (ما تشتهي)
ژ حەدیثان و تەفسیرا ئەمر و نەهی[2]

دەما دەرێ سەدێ ل یەئجوجا ڤەبوو
علمێ مە یێ پڕ د بەغدایێ بەرزە بوو[3]

بە توبێ تە ناسین مە پاقژ بکە
وە ئەم ڕوو سیاهی مە ڕوو سپی بکە[4]

ب علم تەنێ دبێ سەر و پادشاهـ
ئادەم ب علم ناجح وە بۆ سەجدەگاهـ[5]

دێ زمان ل وەحیێ ب نێرە
ئەو نە عیشێ کەیف و قیمێ[1]

---

مسلمانا گۆتنە مومکنە چوونا سەر مانگێ لێ ژیان تێدە نینە. تەماشە تەفسیرا (تەنتاوی) بکن.

[1] هنان ژ ڤا زانایان سەد پەرتووك دانانە هنا زێدەتر سەیدا نابلسی چار سەد جل پەرتووك چێکریە.

[2] ئەو زانینا مرۆڤ ب خوەستا هەبوو ژ حەدیسێ و تەفسیرێ و شەریعەتێ لبا و سەرف، نحوی، مەنتق، بەیان، حیکمەت، عەقیدە، مەعانی، عەرۆز و گەلەکێن دی.

[3] دەمێ دەرێ بەنداڤا یەئجوج مەئجوجا ڤەبوو یانی دەمێ هجوما مغول و تەتەر چەنگیزخان و هولاکو و تەیمورلەنگ و جەغتایی ب سەر مسلمانا دەهات ئەو زانین، عیلم ل بەغدایێ بەرزەبوو پەرتووك هەمیی ئاڤێتن دیجلەدا دبێژن ئاڤا دجلە ڕەش بوو ژ حبرێ.

[4] ب توبێ تە دناسن یا ڕەب مە پاقژ بکە ژ گونەها ئەم ڕوو ڕەشن ژ گونەها مە ڕوو سپی بکە.

[5] بزانینێ تەنێ، ب عیلم، مرۆڤ دبە سەرۆك و پاشا و باڤێ مە ئادەم سەرکەڤت و بو هێژایێ وێ یەکێ مەلەك ژێرا سەجدێ ببن.

ئیبراهیم چەند رۆژا د ناڤ ئاگر دەما
(بردا وسلاما) نازل بوو ژ سەما[٢]

سەلامەت و خۆشیا ژ وی ئاگری
مەدیتی نە دی من د عومرێ بەری[٣]

د ئاگر دا چل رۆژ مایا پێنجیان
خودا ئەو جەحیم کر نەعیمێ جینان[٤]

صەڵات و سەلام سەر نەبی وەك تەڤین
وە ئال و صەحابێن ل وێ د جڤین[٥]

د ڤام ئەز ببم شەخصەکێ عالیشان
ئیبلیس نەهیب ئەز کرم دەردەغان[٦]

یووسف چکەت ب حوسنێ کو وی نەظەر ل خارە
خەر طەبعەتە د ئەبلەهـ چ نێرگز و چ کەر بەشە[١]

---

(١) رێزمان لەوحیێ بنێرە ئەو نە کەیف ڤیانێنە، هەما بێژە من وەها دڤە ئەز وا ژێ دزانم ئەزێ وەها بخوونم نابە.

(٢) قاسدێ خودا ئیبراهیم دەما بوت و سەنەمێن نەمرود شکاندن ئەوا ژی ئیبراهیم هاڤێتن ناڤ ئاگریدا خودا گۆتە ئاگر سارِ ببە و سەلامەتیبە سەر ئیبراهیم ژ عەسمانا ئەڤ فەرمان هاتە خارێ.

(٣) ئیبراهیم دبێژێ خوەشی و رەحەتیا من ژ وی ئاگری دیتی د ژیانا خوەدایا بووریدا من نە دیتیە، هند خوەش بوویە.

(٤) دناڤ ئاگردا هندەك دبێژن چل رۆژا هندەك دبێژن پێنجیی رۆژا مایە دناڤ وی ئاگریدا خودا ئەو رۆژە کرە خوەشیا بەحشتێ.

(٥) دلۆڤانی و سەلامەتی سەر نەبی بن وەك تە دڤێن و هەروەسا ل سەر ئەهلێ مالا وی و هەڤالێن وی ئەوێن لێ دجڤیان بن.

(٦) من دڤیا ئەز ببم مرۆڤەك ل شول و کارێ وی بلند بکەم شەیتانی ئەز تالان کرم ژ هەڤ بەلاڤ کرم.

ل سەر موروڤ سەعیە دیا نەفع تێ هەبە
بەلێ نە ل سەرە دا هەر موساعد ببە[2]

ئەگەر کو نەبوو نامە ئەڤ ئێش و تا
ئینسانی ب دەڤ گوشتێ خۆ بکەتا[3]

ئەگەر کو نەبوونا بلا و قەزا
ئینسانێ بچەهڤ ب دنان و گەزا[4]

جەزمەن تو یەقین کە میعراج نەبی
یێ ئیسرائێ ئینکار کە مورتەد دبی[5]

خودا عالەما ژۆری نیشا تە کر
مە تەصدیقا ئەمرێ خودا ژ تە کر[6]

ژ تەبلیغا تێرا تە ئەو کر ڕەسوول
مە ژی ئەو ب قاصد ژ خۆ ڕا کر قەبوول[1]

---

(١) دبێژە خوە یووسف چ بکە ب جوانیێ کو بەرێ وی ل خارێیە خوییێ وی تەبعەتێ وی یێ گوهـ درێژیە نەزانە لبا وی چ نێرگز بە چ کەربەشی بە تو فەرقی و جوداهی نینە. خوەشی و نەخوەشی ژ هەڤ جودا ناکە، وەسا نەفسا خوە شکاندیە و خوە کێم کریە.

(٢) ل سەر مرۆڤ پێویستە کوششێ بکە ژبۆ یا ب سود بت بەلێ ل سەر وێ نە لازمە هەر ب دەست خوەڤە بینە هەکە ژێڕە لەڤ نەهات.

(٣) هەکە ئەڤ ئێش و ژان و نەساخی نەبوونا بۆ ئسنانی مرۆڤ وێ دەڤ باڤێتا گۆشتێ خوە، وێ هار ببا.

(٤) ئەگەر قەزا و بەلا نەبوونا مرۆڤ و ب دەڤ و ددانا وێ ب چویانا هەڤدوو، ئەگەر ل هەڤ بدانا.

(٥) چوونا قاسدێ خودا بۆ عەسمانا تو ژ دل باور بکە ئەو کەسێ هاتنا وی یا شەڤ ژ باژارێ مەکەهێ چوو بۆ بەیتول مەقدسێ بێژە نەوەیە ئەو ژ ئاینی دەردکەڤە ژبەر کو دەڤا قورئانێ پێ هاتیە."سبحان الذي اسرى" (الاسرا: ١) تا داوییێ.

(٦) خودا عالەما ژوری عەسمانا وێ شەڤێ نیشا وی کریە بەهشت دوژەهـ و ڕوحێ قاسدێن خوە و مەلەك و گەلەك تشتێن دی ژی. مە ژی گۆتیە ڕاستە فەرمانا خودا.

چیا وی بۆ مە گۆت ژ تە گۆتیە
ل بەر قودرەتا تەما میعراج چیە[٢]

ڕەوح و ڕاحەت د بەهشتێ
ددنێ کەسی قە نەدی[٣]

نە ژ مە ڕایە نە ژ تەڕا یە
تو کەسا کەیف تێ نە دێ[٤]

ئێ رێ کودایا مالا وی کر
وەك مە کارەك ژێ نەدی[٥]

چاوا تە ئەمرێ مە کریە ب (فاستقم)
ل سەر صیڕاطا موستەقیم ئەز بچم[٦]

عیلاجا هەر تشتی دبێژم بەلێ
یا ئینسانێ سەر ڕەش نابێژم بەلێ

تو کەسەکێ نەطرسینە عەقل گەر بچە
یان جارەك دی تێیە و یا دچە و دچە[١]

---

(١) خودا گۆتە قاسدێ خوە فەرمانا من بێژە بۆ عالەمێ بو وێ کرە قاسد مە ژی باوەری پێ ئانی و مە ژبۆ خوە قەبوول کر.

(٢) چ تشتا ئەوی گۆتی ژ تە گۆتیە نە ژ کیس خوە گۆتیە، ل بەر قودرەت و مەزناهیا تە میعراج چێبە. ئەو گەلەك کێمە، بچووکە.

(٣) خوەشی و ڕەحەتی دبە هەشتیێ دا هەبە دڤێ دنێدا کەسەکی خوەش یا تەمام نەدیتیە.

(٤) ئەڤ دونیا نە ژبۆ مەیە نە ژبۆ هەوەیە تو کەسا کەیف و لەزەت تێدە نە دیتیە.

(٥) ئەو کەسێ ڕێیا مالا دونیایێ کو داندی یانی هەر قەستا وێ کری وەکە مە تو فەیدە ژێ نە دیتیە.

(٦) یا ڕەب، تە چاوا فەرمان ب مە کریە ب ڕاست بن، ل سەر رێکا ڕاست من سۆزدایە ئەز بچم.

یووسفی خۆ د هلاتێ د مێرییدا ده خەباتێ
وەك دەوارا نەقلیاتێ ژ ڤێ دەرێ بدە وێ دەرێ[٢]

د موحبەتێ جهکی ب من دی
نورلو پارلاق شوبهێ فندی[٣]

د شیوەئێ ئەهلێ وەفائێ
نە د نمیشێ ڤێ دنێ[٤]

سپەحیە یا هەو یا ژێرا شەهەدە دا
فەضڵ ژی یا نەیارا پێ شەهەدە دا[٥]

قەدەر قدرە دیزکا دەڤ نخوون
زەمان ژی زەمانە زمانێ بخوون[٦]

خۆزی لاو و جوان بام بە سەیدای پاك
ب علم و ب حکمەت نە بام ژ نقشا پاش[٧]

---

(١) ئەبو عەلی سینا دبێژە کەسەکێ نەترسینە هندەك جارنا خوە ل بەر هندەکا د ڤەشێرن پێخ دکەنە ئەو، وان دهترساندن ژبەر هەکە وی مرۆڤی عەقلێ خوە ونداکر. یان جارەکێ دێ ئەو عەقل تێتە جهێ خوە یان نابێت ئەڤە زیانەك مەزن گەها وی مرۆڤی.

(٢) دبێژە یووسف درۆژهەلاتیدە وەکە میریا ل خوە دکە خوە بەردده عەردێ وەکە دەوارا نەقلیباتبێ پێ دکن تشتا پێ ڤەدگوهێزن ژ ڤێدیێ بدە وێدەرێ.

(٣) د حەژێکرنا خوە دە جهەکی بدە من ڕۆناهی بت وەکە فندێ ب شەفەق بت.

(٤) وەکە مرۆڤێن ئەهلێ وەفا یێ نە وەکە ئەهلێ دونیایێ بن.

(٥) تشتەك ڕندە هەوی ژهەویا خوە رە شەهدا باشیێ چاکیێ بدەن مەزناهی د وێدەیە نە یار شەهدەکیێ بۆ چاکیا نەیاری بدە.

(٦) قەدەر وەکە دیزکێیە دیزکا سەرنخوون کریێ کا دبندا چ هەیە نایێن زانین زمان ژی وەسایە هەکە نە ئاخڤە مرۆڤ نزانە کا چاوانە.

(٧) دبێژە خوزی ئەز لاوەك جوان بووما وسەیدایەك چاك من هەبوویا بزانینێ وحکمەت بوویا ئەزباما ژ ڤی نفشی پاشی.

نــــه مـــــهرد گــــهر بـــــده هنـــــدکی دیَ بــــده
خــــودا گــــهر قــــهبـــوول کـــــه دیَ گـــهلکــــی بــــده[1]

نـــــه هیَــــژا مــــه ڤـــــیَ نیعمــــــهت و صـــــهحــــــهتـــــیَ
ب حظـــــــوور و داخــــــیَڤم د درهم صـــــــوحبهتـــــــیَ[2]

مــــــه طــــوبا کـــــــه بـــــهرخـــــۆر ب خیَــــر ب بــــهر
د ئاســــــیا درهخـــــت بــــــه ژیَ فنـــــد و فــــــهنـــــــهر[3]

نــــــهبـــــه دهســــــتهکــــــا شـــــــهیطـــــان و ظالمــــــا
ئــــــهون ئـــــیَن تــــــه ژ خـــــــۆڕا بکــــــن وهك شـــــما[4]

د ســــــــهیـــــــرا ســــــلوکیَ موحــــــــهبـــــــهت د ڤـــــــیَ
ئیلاهـــــــی نــــــــه بیـــــــتن کـــــــوفر دیَ کـــــــهڤــــــیَ[5]

ســــــهیـــــدا کــــــی ئیلاهـــــــی ب شـــــهڕط و شــــــرۆط
سمســــــــاریَ ل ســــــــهر ڕیَ د ڤـــــــیَ دل هـــــــهڤـــــــۆت[6]

علــــــم ویَ دهر مـــــــههـــــدیَ زهمــــــین تـــــا فـــــهلــــهك
یـــــا تــــاخیَ وی یــــهك مــــــهرشـــــکا ڕهش بــــهلــــهك[1]

---

[1] ئەو نەمەر دە ئەویَ هندکیی بدە هەکە هندکی بدە خودا ئەویَ گەلەکی بدە وی هەکە قەبوول کە.

[2] ئەز نە هیَژا مە ڤیَ خوەشی و تەندورستی (صەحەت) ب حوزوڕ داخڤم دچم جڤاتا خودا.

[3] من بکە وەکە دارا توبایێ بەرگربم بەریَ من بیَتە خارن دەرەك بەر ئاسیاییَدە ببم فند و فەنەر.

[4] نەبە دارو دەستەکیَ شەیتان و زالما ستەمکارا، ئەویَن تە ژ خوەرە نەرم بکن وەکە شمایێ لیَ بکن چ بیَژن تە تو بیَژی بەلیَ.

[5] د دووڤ ڕیَیا چاکا دەسلوکیَ بکی حەژیَکرن دڤیَت هەکە نە ژبۆ خودایی بت ئەو حەژیَکرن کوفرا بکەڤە تیَدا.

[6] سەیدایە خودایی ببی ب شەڕت و شڕوت مرۆڤ هەبت وەکە سمساریَ سەر ڕیَکا بت و دل ب سوژ بت.

(أنا) ئەز ئەزم مويە من ئەو قەتاند
ژ ڤێ بۆمە سەيدا فەصاحەت ڕەڤاند[2]

جيهادا ب (امرت) نەبيێ مە ب مەدا
خۆ نوو مال حەمان دژمن دەما شەهدەدا[3]

نەبيێ ژ ئيلاهى چ ئانى ژ مەرە
ب سەمع و ئيطاعە ب ئيقرار و باوەرە[4]

مە قورئان ئيمامە حاكم ژێ ئەڤە
ژ موخالف بەرى ئيمان ئيسلام ئەڤە[5]

ب ڤێ بذرێ دين تە خوونا خۆ حەماند
عەمەل ب ئەمر و نەهيان تە دين کەملاند[6]

د تەرکا نمێژێ وەعيدێن مەزن
د ئاى و حەديثان پڕن موئتەمن[1]

---

[1] عيلم و زانينا وى ژ سەر ڕويێ عەردێ هەتا فەلەکێ بت. جهێ ڕا زانا وى يەك مەرشك بت ئەو ژى ڕەش بەلەك بت. يانى نە دوشەك و تەخت بن. وەکە سەيداييێن بەرى بت. لدەڤەرا مەيا بوتا ئەڤ زۆر بوون.

[2] ئەز ئەزم منە خوە ناسکر ئەڤاهە وەکە مويەکى بۆ من ئەو قەتاند ژبەر ڤێ ئەز بۆ مە سەيدا زمانەك درست من ژ خوە ڕە ڕەڤاند.

[3] جيهاد ب کو ئەز هاتمە فەرمان کرن شەڕ بمروڤا ڕە بکم تا شەرە بدەن مێژ و ڕۆژى و زەکاتێ بدەن و حەجێ بکن هەکە ڕێکا وا خوەش بە.

[4] قاسدێ ژ خودا چ ئايينە بۆ مە گوهدارکر و وئيتاعەت کر و مە باوەر کر ب هەمى ڕەنگا مە پەسەندکر.

[5] قورئان بۆ مە پێشەوايە و دادوەرە ئەم ژ موخالەفەتێ بەرينە باوەرى و ئيسلام ئەڤە.

[6] ب ڤى توڤى ئاينى ب خوونا خوە پاڕاست حەماند ب کارکرن (عەمەل کرن) ب کرنا تشتا چاك و نەکرنا يانە باش تە ئاينێ خوە تەمام کر و کەملاند.

چ دەربەك مەزن ئیبلیس ژ یەك سەجدە خار
تە چەند سەجدە بەردان تە غەم ژێ نە خار[2]

ئەو قنیاتا دا بەر دلێ تە ڤرە
نەیارە ژێ باوەرنەكە ئەو گورە[3]

ئیلاهی ب جاهێ حەق تە ل سەر مە كی
مە ژ شەڕی وەسواسێ خەناس حیفظ بكی[4]

ب تەوحیدێ سینەم بە خالی نەما
وە كەوكەبێ نوڕێ ل ژێری سەما[5]

لیباسێ تەقواتیێ ستارە ژ خودا
لەعنەت ل دەورا ڕووتی و ظلوتی ب مەدا[6]

سەیدای ئەلیفبایێ من ناس بكن
ئەلحەمد وئەشهەدێن خۆ ب من ڕاست بكن[1]

---

[1] د نەكرنا نڤێژا دە گەڤێن مەزن هەنە د ئایەت و حەدیسادە ئەڤ پڕن یا ئەوێ خودان باوەر.

[2] تەماشە بكە شەیتانی چ دەربەك مەزن ژبەر كو یەك سەجدە ژبۆ ئادەم نە برخاركا تەماشە بكە تە ماشە بكە تە چەند سەجدە نە برنە و بەردان ژ خوە نە خەما تەیە و تە خەم ژێ نەخاریە.

[3] ئەو قنیات و خوەش خوە شوكا ددە بەر دلێ تە ئەو ڤرن ژبەر كو ئەو نەیارە ژ وی باوەر نەكە ئەو گورە.

[4] یا خودا تو بشەرەڤا وی مافێ خوە ئەوێ ل سەر مە هەیە بكی مە ژ وی شەرێ وەسی واسی ب پارێزی.

[5] سنگا من ژ یەكیتیا تە مایە ڤالا وەكە ستێرا ڕۆناهیێ ل عەسمانا ب یەكیتا خوە سنگا من نە هێلی ڤالا ژ زانین و خوەندێ وەكە ستێرا ڕۆناهیی دبن قوبا عەسمانا دە.

[6] جلا ژ خودێ پەرسیێ مە ستار بكە لەعنەت ل ڤێ دەورا ڕووسی و تازیەتێ یە كو دبێژن بۆ یێ ڕووسی زەلوت وە ڤان ژیێن ڤێ دەورێ.

ما هەر كەس سەيدايە هوون پێ نا حەسى
فەصيح بوويە عەنقانە ل پێكا كەسى[2]

ژ حەقيقەت و حەقى مە دەفتەر تەژى
ئيلاهى عەفوكە مەجازێن مە ژى[3]

عەمەل ل وەفقا شەرعا ڕەسولێ خودا
نەبت ئەو قەبوول نابە ئەى جان فيدا[4]

شەرطێ د دوێ صاف بەريا و شرك نەبە
ب ڕەحيم و غەفورى تو مەغرور نەبە[5]

پڕۆژا عەمەل ژ كيتابێ بگر
ب قەولێ قەوى خۆ ب ضەعيفى نەگر[6]

---

[1] دبێژە ئەز سەيدايێ فێركرنا ئەليف بێتكا مە من بۆ خوە وەسا ناسى بكە قاتيحە و تەحياتێن خوە من ڕاست بكن. عەدەتێ سەيدايى ئەوە هەر ملايەك بهاتا جڤاتا وى وێ ب گۆتا كا گوهدارى فاتحا من بكن پاشى وێ ب گۆتا واژى كا فاتحا خوە بخوينن، گەلەك نە دوێرا بێنە بالێ.

[2] دبێژە ما هەر كەسى سەيدايە هوون پێ نا حەسەن و نزانين سەيدايێ فەسيح بوويە وەكە عەنقايێ ناڤ هەيە ئەو بخوە نينە (پرندا سيرمەخ) نە پێكا كەسێ مە.

[3] ژ ڕاستى و درستيێ دەفتەرا من تەژيە يا ڕەبى وايێن نە ڕاست ژى تو عەفو بكە لەوا كێماسيا ببوورە.

[4] عەمەل كريارێن مە مرۆڤى دڤێت وەكە شەريعەتا قاسدێ خودا بە هەكە ئەو نە وەسابە قەبوول نا بە يا ئەوێ جانفيدا.

[5] شەڕتيێ د دوويێ ژبۆ قەبوولكرنا عەمەلى دڤێت ئەو كريار خور و يێ ڕومەتى بۆ خودا بت و شيريكا تێدە چێنەكێ هەكە بێژە خودا غەفوور و ڕەحيمە و بەسە ئەو نابە دڤێت خوە پێ نەخرينە.

[6] پڕۆژا كريارێ چاك ژ پەرتووكا خودا ژ خوە ڕە بگرە خوە بگۆتنا قائيم بگرە ب گۆتنا زەعيف خوە نەگرە.

ئەمانەت ژ دەستێ خۆیێ خوە دەر
کەتە دەستێ یێ ئەو نە ئەهل و نە سەر[1]

ژ ماهر و هوستا بگر موستەعید
نامە د طوقی گەردەن د کیانێ بەرید[2]

حەقە ل سەر سەما و سەر زەمین بگر خوون
دەور مەعکوس دونیا کرنە دین[3]

ئەنانی نە دانی تەکەبور کیان
غالبێ ئەهلێ دەوریێ ژ ڤێ ئومەتێ مان[4]

تەحەمولا زانا و فەصیحی نەکر
ئیمامێ ضەمین ئیفسادا مێژێ کر[5]

مە دەست ڕا بەرێ تە شەب و رۆژ هەر دەمێ
شەرمیزار نە گیری مە دناڤ عالەمێ[6]

سەلامەت د ڤێتن بن عولیێ ژ خودا
وەطەن کە عاکفخانە و طۆبا برا[1]

---

[1] دەمێ ئیمانەت ژ دەستێ خودایێ خوە دەرکەت و کەتە دەستێ وی یێ کو نە بابەتە ژێرا و بکێر پاڕاستنا وی ئیمانەتی نایێ هنگێ قیامەت ((إذا سود الامر الى غير اهله فانتظروا الساعة)) حەدیسە.

[2] ژ هوستایەك زیرەك ماهر فێرببە یا ئەوێ ئامادەیە بۆ فێربوونێ مرۆڤا دکەڤە د گەردەنا وا دە وەکە وی یێ پوستێ دگەرینە.

[3] وەسا پێ هاتیە حەقە ژ عەسمانا و سەر عەردێ خوون ڕۆپوش بکە ژبەر کو دەور بەرۆڤاژی بوویە دونیا کەتیە دەوسا ئاخرەتێ بوویە ئایین.

[4] ئەز ئەزێ تە دانی خوە مەزن کر گەلەکێ ئەهلی ڤێ دەورێ ژ ڤێ ئومەتێ مان.

[5] تەحەمولا مرۆڤێ زانا و فەسیحێ نەکر. پێشنڤێژێ کو زامە نە نڤێژ نە ڕاست کر و خراب کر.

[6] مە دەست ڕابەری تەیە یا ڕەب شەڤ و رۆژێ مە شەرمەزار نەکی دناڤ عالەمێدا.

برجس و گوناهێن مە طاهر بکە
تو تەوبێ فەضڵ کە مە پاقژ بکە[2]

ما یینێ قەضایێ ل تە خست ژ دەست نە ڤەرەست
ژ تە بووری ل هەڤال دا نە خەلەت ڕاست درست[3]

دەرسا ئینی عەفوە نە فەرضە نە دی
ژ ئیمام ئیستیحسا نە یەجوز و مە دی[4]

ل ڤیدێ و ل وێدێ رضا تە مەرەم
ژ کوفرێ و نیفاقێ ب حەمینە دەرەم[5]

دبن مە ژ کەری بم خەبات ب نان و طلێ
نەیێ ژۆرە و مەقاما نەئێ وێ جلێ[6]

وەلی ئیمتیڤالا دخازم ژ تە
قەنوط من نە گێڕی ب ئاوازم ژ تە[1]

---

(1) مە دڤێت ئەم بسەلامەت بن بلا جهێ من جن عولێ بت نەقانا ژور بت. وەتەن بلا جهێ ئیعتیکافێ بت بۆ کۆما برارا.

(2) ئەم ب گوناهن و نەباشیتە مە پاك بکە پاقژ بکە. تو تەوبێ کەرەم بکە ئەوا مە پاقژ بکە.

(3) نارنجوکا قەزا ئو قەدەرێ ل تە کەت درست نە ڤەرست ژ تە بووری ژ هەڤالا دا نە خەلەت ڕاست درست.من ئەڤ باش فێم نەکریە.

(4) دەرس گۆتن عەفو ژێرا هەیە نە فەرزە دورستە ژ پیێشەوایێ هەکە بێژە د پەرتووکا دە هەیە. ڕۆژا ئینێ. نها ژی گەلەك مسلمان ڕۆژا ئینیێ دەرسێ ناخوونن.

(5) ل ڤرِ و ل ورِ یانی دنیا و ئاخرەتێ هەر رازیبوونا تە مەرەم و مرادە مە ژ کوفرێ و دوڕوتیێ و نیفاقێ مە بپارێزە.

(6) هەکە ئەز ب نان و زکێ ئەز خەباتێ بکم د گۆتن وا مەکەرەچیێ ئەوێن بەلاش د چوون سوخریێ. ئەز بۆ وێ باشم ئەز بگەهمە مەقام و جهێن بلند. نامە و ئەز نەیێ وێ جلێمە یا ڕەبی.

دەما ڕێ ل وە طەنگ بوو ل وە بۆ قەتل و خوون
ئیمدادێ ژ مێژێ وە صەبرێ دەرین[٢]

ئازادیێ نە دی من کێ من خوەیی بکە
پێ پەلکا دەرێ تە بەسی من دکە[٣]

ب ئەهلێ علم و فەضلێ حەیاتا دنێ
مەماتا ئەوان مەماتا دنێ[٤]

د قەضا و قەدەر را ئێش بەلا و شەك پەكا
ل دەرێ خۆ قەویکە نەرم دەرنەکا[٥]

د تەبلیغا ئەمر دا ل ژۆرێ پوڕ ئوجۆر
بەلێ ل ژێرێ مللەت ل تە دبن مار و مۆر[٦]

عالم یانی خزمەتکارێ عالەمێ
ب ڕەئفەت و ڕەحمەت د ناڤ عالەمێ[٧]

وەراثەتا نەبیا خوون پاقژ دکرن

---

[١] یێ ئەز ژی د خازم تو من بێ هیڤی نە هێلی ئەز ب ئاوازم ژ تە یا ڕەبی خوە گرتنا ب ئەمرێ تە.

[٢] دەما ڕێ ل وە تەنگ بۆ ل هەوە بۆ کوشتن و خون ڕاژاندن هەوارا خوە ژ مێژێ و سەبرێ دەرینن. هوونێ بوا خلاس ببن.

[٣] هەکە تو یارەبی ئازادیێ نەدی من کی هەیە من خودان بکە پێ پەلکا دەرییێ تە بەسە بۆ من یاخودا. بلا منەتا تە بت.

[٤] ب خودانێن عیلم و زانینێ دونیا زندیە ب مرنا وان دونیا مریە (موت العلم موت العالم).

[٥] دەمێ قەزا و قەدەر و ئێش و بەلا و شەك و پەك و هاتن دەرێ خوە قاییم بکە نەچە دەرێ ڤەنەکە. یانی نە بلا کر بە بەلایێ نەخازە.

[٦] د گۆتنا فەرمانا خودا دە ل ژۆر عەسمانا خێرا مەزن هەیە یێ ل ژێرێ ل عەردێ مللەت ل تە دبن گورك و مار و مور.

[٧] زانا خزمەت کارێ عالەمێ یە ب دل پیسی ژی و دلۆڤانی ناڤ عالمێدا.

د گـــــوّتن ڤـــــان عــــــهفوكـــــــه چكــــــن جـــــاهلن[١]

وهصـــــيهت دهوامـــــــه بـــــلا غــــــهفلــــــهت نــــــهبـــــه

تـــــا ئـــــهڤ مێـــــژ هــــــهبـــــه د ڕێكـــــێ دى هــــــهبـــــه[٢]

غــــــهبينـــــــهتـــــا مينبـــــــهر و ميحـــــــرابێن عـــــــهزيـــــز

مــــا نــــه بـــــوّ ڤــــا دهورێن(الثــــغ) بــــێ تـــــهميـــــز[٣]

دونيــــــــا ديـــــــن نـــــــــه پيـــــــرا توالــــــــهت ميثـــــــال

نـــــانێ مێـــــژ نـــــه ڤێـــــڕا بــــــه ئـــــهڤ ســــــر و حـــــــال[٤]

حــــــــهمــــــوو لــــــێ ئـــــــهمانــــــهت نــــــهيـــــێ وێ جلـــــى

د پوّســـــــتێ هــــــــهســــــپكێ قوللــــــــه بـــــــارێ دولــــــدولى[٥]

تـــــو شــــــكرێ مــــــهزن ڕزقـــــێ مــــــن كــــــه ب قــــــهبـــــوول

ب شـــــــــهھـــــــدا (اللــــــــه واحـــــــد محمـــــــد رســـــــول)[٦]

بێهنـــــــا ســــــير پيڤـــــــازێ ژ گوّنــــــــهھـــــــا دووهـــــــهبــــــا

جهـــــــــێ مـــــــــن د ئاڤاهيـــــــــا دا داوى نـــــــــهبـــــــــا[١]

---

[١] وارسێن قاسدێن خودێ وهسا بوون بوّ مروّڤا خوون بكهتا سهر وا پاقژ دكرن دگوّتن ڤا عهفو بكێ ئهڤێن هه نهزانن جاهلن.

[٢] وهسيهت ههر بهردهوامه ژێ غافل نهبه ههتا نفێژ ههبه ڕێيا خودا ژى وێ بهردهوام به.

[٣] حهيفا منبهر و ميحرابا ئهوێن پيروّز ما نه بوّ وان كهسێن زمانێ وا نه فهصيح بێ حوروفا ژ ههڤ ڤه قهتينێ.

[٤] ئهو دونيا دين ئايين نه پێرا به وهكه تو وا له تێيه(ئهدهبخانه)، نانێ مێژ نهڤێرا به ههر ئهڤ ڕهنگه و ئهڤ حاله.

[٥] هلگرێ ئيمانهتى تو نه يى وێ جلى يێ. خودا دبێژه ((وعرضنا الامانة)) مه گوّته عهزمانا و عهردێ و چيا ڤى ئهمانهتى هلگرن هلنهگرتن ئينسانى هلگرت ستهم ل خوهكر و نهزان بوو. ئهڤ بارهك گرانه وهكه بارێ دول دولێ تو ل ههسپێ قولهيێ لێ بكى.

[٦] دڤێت مروّڤ شكهرهك مهزن بكه ژبوّ ئهو رزقێ خودا دايێ دا قهبوول ببه ب شههدا الله يهكه و كو موحهممهد قاسدێ ويه.



Zakho Centre for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخو بۆ ڤەکۆلینێن کوردی

ئیمامی حلوانێ دبێ صوند د خووم ب خودێ
بێ دەستنمێژ تجا من دەست نە دا کا غەزێ[٢]

سەر دنێ نەسەکنە ب بووره ژ وێ
غەریب و موسافر لەعنەت کە ل وێ[٣]

نەفس و عەقل و دین مال نەسەب غیرەتی
سەر تە واجبن حفظ بکی ئەی فەتی[٤]

ب صاڵح و ڕوسولا ل من مێزەکە
عەفووی تو دەریێ عەفو وی ل من ڤەکە[٥]

پەریشانی ڕۆز و صالان هەوەسی
نوقەك کۆر ل من دان ل صەدێ پێ د حەسی[٦]

بێ حەد و حیساب بۆ تە شوکرێ مەزن
سەر وان نیعمەتێن ژ فەضلێ تە دانە من[٧]

داخازا متێ تە کاتب قەید دکە
خودێ وێ د دە یا عەبد باوەر نەکە[١]

---

(١) دبێژه هەکە بێهنا سیرا و پیڤازا و دو ژ گونەها هاتبیا جهێ من وێ ئاڤاهیا دە نەبوویا.

(٢) ئیمامێ حلوانی دبێژه ئەز صوند دخوم تو جار بێ دەستنڤێژ من دەست نە ئاڤێت یە کاغەزێ.

(٣) سەر دونیایێ نەسەکنە ببووره نە جهێ ڕاوستاینە مرۆڤ غەریبە و ڕێڤنگە نە خوە جهییە.

(٤) پاڕاستنا ل سەر نەفسێ و عەقلی و ئایین و نەسلی و مالی سەر مرۆڤی واجبن دڤێت ئنسان ڤا هەر پێنج پیرۆزاهیا بپاریزه (مقدسات خمسة).

(٥) تو چاوا تەماشە چاکا و قاسدێن خوە دکی وەسا تەماشە من ژی بکە تو عەفوو دەرگەهێ عەفوا خوە ل سەر من نە گره بۆ من ڤەکە.

(٦) ڕۆژ و ساڵان ئەز پەریشان کرمە و هەوەسا نەفسا من ژی، نوقەك کور ل من دانە ل سەد ساڵێ ئەز نوکا پێ دحەسم.

(٧) بێ هەژمار ژبۆ تە سپاسی و شوکر یێن مەزن ل سەر وا چاکیێن تە دایین من ژ کەرەما خوە واجبن ئەبکەم.

مه حەوجە موتەکەلفینا نەکە
طەعامێ وا دەردە نە تو دەر نەکە[2]

وەعیدین شەدید ڕەشەکێن پوڕ مەزن
خودێ دانە ئین ئەو بێ خاطڕ کرن[3]

دهستینم ژ وە وێ کەون و نیعمەتێ
ئەزێ وە رەذیل کم د دنێ و ئاخرەتێ[4]

تو ئیدارە ب ئاگر ڕا نا بە خودا
ب ڕەحمان و ڕەحیم تە ناسین خودا[5]

ل با پرتەقالێ چین چین دەر دخە
دبێ مەحکەم مە چێکر کەرەمکە ب خوە[6]

ب لبۆ و بەلێ مە ژ تەڕا هەر دەمی
لێ تو ل خۆ نەیاری گەلەك بێ خەمی[7]

---

(1) داخازا من تێتە نڤیساندن و قەیدکرن ژ لا نوسەر ڤە کۆمەلا ئێکەتیا خودا وەسا ددە کولەیێ خوە یا ئەو باوەر نەکە.

(2) مە حەوجەی وا کەسا نەکە ئەوێن بەخیلن و کوندن ب خوە نکارن مالێ خوە بخۆن خارنا وا دەردە نەساخی ژی چێدبە. نە تە جهە. مونەزەمە کومیتە. (درنك) تورکیە.

(3) کەسێن خودا بێ خاتر کرین خودا گەفێن مەزن ل وا کرنە وەعدێن دژوار بۆ وا دانە.

(4) خودا دبێژە ئەز ژ هەوە وەر دگرم وا هەیین ونعمەتێن من دایین هەوە ئەزێ هەوە رەزیل بکەم دونیا و ئاخرەتێدا.

(5) تو دەبار سەرەدەری ب ئاگر ڕا نابە یا خودایێ مە تو ڕەحمان و ڕەحیم ناسکری تو ڕەحمێ ل مە بکە یا خودا.

(6) لبا پرتەقالی چینی چینی چێکریە ژ ناڤ هەڤ دەردکەڤە خودا دبێژە مەحکەم مە چێکریە ژ هەڤ بینەدەر بخوە.

(7) بلبۆ بەلێ مە ژ تەڕا هەردەمی لێ تو ب خوە ل خوە نەیاری، ژلایێ خوداڤە و ها بۆ عیبادی تێتە گۆتن.

غــــەيبــــا دنــــێ نــــزانن چيـــا خێرتــــێ هـــــەيــــی
مويـــــەســــــەر بكــــە تــــو وەكيلــــێ مــــە يـــــی[١]

غــــەيبــــا ئــــاخرەتــــی تــــە ژ مـــــە ڕا گۆتيـــــە
بــــێ شـــــەك وێ دزانــــــن مـــــە بــــاوەر پێيــــە[٢]

ژ صـــــيفاتێ خودائيـــــــە عــــــەفـــــوا عيبــــاد
چــــــەنــــدی قـــادرە ل ســـــەر عـــــەذابــــێ عيبــــاد[٣]

غـــــەيبــــێن ئــــاخرەتــــێ د قورئــــانێ هاتنـــــە
بــــێ شـــــەك دزانــــــن وان يـــــەك و يـــــەك چنـــــە[٤]

د بوخـــــــاری دا مـــــــدەتــــــێ فتــــــرەتــــــێ
شـــــەش صــــەد ســــاڵە عــــەفـــوا خـــودا ژ وارە تـــێ[٥]

ژ ئيبــــــراهيم تـــــــامورەت موســــــلمانێ حــــــەق
ژێ تــــا بــــەعثــــەتــــێ فــــەتــــرەت و عفــــوا حـــــەق[٦]

فــــەتــــرەت يــــا ئــــەصــــەح ســــاڵ وی شـــەش صــــەدن
د قــــەولــــەكــــێ دا ٥٦٠ يــــەكــــێ چــــار صــــەدن[١]

---

[١] ئەم تشتەكی ژ غەيبێن دينێ نزانن كا چ قەبوول بوويە يان نە مرۆڤ چاكە يێن نە ڤێجا چيا خێرتێدا هەبت تو وێ ژ مە ڕە سەهل بكی تو وەكيلێ مەيێ.

[٢] ئەوێن غەيبێن ئاخرەتێنە تە ژ مەرە گۆتنە بێ شك ئەم وا دناسن و مە باوەری بوا هەيە وەكە قيامەت، حەشر، ميزان، بەهشت، دوژەه و يێن دی ژی.

[٣] يەك ژ سفات و ناڤێ خودا عەفوە يا كولێن خوە عەفو بكە خودا د كارە عەزابی نەدە عيبادی.

[٤] غەيبێن ئاخرەتێ د قورئانێدە هاتنە بێ شك ئەم وادزانن يەك و يەك چنە و چ تشتن.

[٥] د بۆخاريدا هاتنە كو زەمانێ فترەتێ دناڤ بەرا دو قاسدێ خودێدا شەش سەد ساڵن. ئەوێن د وێ ناڤ برێدا خودا وانا درە د عەزابێ د بێژن وا ئەهلی فترەتێ.

[٦] ژ زەمانێ ئيبراهيم (سلاڤ ل سەر بن) حەتا دگەهە مورە مسلمانێ حەقن سەر ئاينێ ئيبيراهيم بدن ژ مورەت هەتا هاتنا قاسدێ خودێ كو موحەممەدی دەمێ فەترەتێيە ئەو ژی عەفونە حەقە.

تـــــەوحيـــــدا ئـــــەجـــدادێن نـــــەبيـــا ئيتيفـــــاق
تـــــەقـــــەوەلا ســـــەر وان دبـــــە كـــــوفر و شـــــيقاق[٢]

بـــــەعثـــــەت تـــــەبليغـــا ئـــــەمـــرێ ئيمانـــــا ب ڕەســـــوول
دگـــــەل (اللـــــە واحـــــد) قورئـــــان مـــــەقـــــوول[٣]

د نـــــۆط و نـــــەهێـــــدا ئيســـــحاق چيبيـــــە
سـارەت ژێ عـــــەقـــيم مـــا بحـــەملـــە نـــە بوويـــە[٤]

بـــــێ كـــــێش و بـــــێ پيڤـــــان حـــــەلالـــــێ وە بـــــى
بـــــەلـــــێ عـــــەمـــــەلـــــێ صـــــالّح ژێ پيـــــرە بـــــى[٥]

دونيـــــا جهـــــێ خـــــەبـــــاتێ و جهـــــێ بـــــەرهـــــەڤى
هـــا ســـەوق مـــەئمـــورى بـــێ بێـــژە تـــێ دەركـــەڤـــى[٦]

نـــــەقليـــــات و ئـــــەرزاق ژ تـــــەڕا پـــــوڕ دەڤـــــى
ڕێيـــــا تـــــە نـــــە قامـــــە چـــــوارا دكـــــەڤـــــى[٧]

غـــــەمـــــێ ژ پـــــاش ڕۆژێ ب خـــــۆەنـــــە بێـــــژە ژ چـــــرە
يـــــێ بـــــێ وەر نـــــەهـــــن بـــــێ خـــــيلاف كـــــافرە[١]

---

[١] دەمێ فەترەتێ ياڕاست شەش سەد سالن د گۆتنەكيدا (٥٦٠) ديەكيدا (٤٠٠) سالن.

[٢] ب تفاقا زانا يان باڤ و باپيرێن ئەنبيا خودا ناسن نەخۆ شركە.

[٣] هەر كەسێ گۆت گۆت كا ب وا ڤە دەيەنە كوفرە و سقاقە.

[٤] ئيبراهيم نۆت ونەهـ سالى بۆ خودێ ئيسحاق دايێ، سارە بێ چووك بوو، نە تانين ب حەمل نەدبو ئەڤە ژێ موعجيزەيە.

[٥] خودا دبێژە ڕزق بێ كێشان و پيڤان بخون خوەشى حەلالێ وە بت بەلێ عەمەلێن چاك ژێ پيرە بكن. نەهوون بخون و گونها بكن ئەو پرسيار ل پەى هەيە ڕزق ژێ نە بەلاشە.

[٦] دونيا وارێ كرنێ و خەباتێيە و بەرهەڤ كرنا خێرايە، دەم دەمێ وەخت هاتيە مەئمورێ بێژ وەرە با مە دبە تو وێ دەركەڤى ژ ڤێ دنێ نەوارێ ئەبەديە.

[٧] ژ ڤڕ حەتا ئاخرەتێ بۆ تە ئازوقە و پەرگال لازمە. ڕێيا تە دوورە نە ل قامێيە چاوا بوارا سەبرا تەيێ.

طاعـــــەت ناســــنامە د عـــــەمــــــەل دا ئـــــەمـــــەل
بــــێ طاعـــــەت نــــە ناســـــە ژ مـــــالیێ بـــــی ئـــــەمـــــەل[٢]

ســــــەودانیــــــێ کـــــەیـــــف و صـــــەفایـــــا دنــــێ
تــــــە ئـــــــەو ڕوح و ڕەیحـــــــان د علـــــیم داتنـــــێ[٣]

موهندســــــیا عــــــەمــــــەل ژ علمــــــی بگـــــر
حــــوکمێ نـــــە ئیلاهـــی ئـــەو حیلـــەیـــە و مـــەکـــر[٤]

لـــــــــذەت ئـــــــەوە عــــــالم ژ علمـــــــێ دبـــــــین
نە ب عـەمـەل دەری جـەنـەتێ بـەلکی عـەمـەل کریە سەبەب[٥]

دیانـــــــەت ب ئـــــــیخلاص سیاســـــــەت نـــــــەبـــــت
ل شـــــــەرعـــــــێ موافـــــق موخـــــالف نـــــەبـــــت[٦]

ببــێ خــەلاق دێ دیــن قــەوی کــە ئــەڤ ئــەحـادیثێن صـەحـیح
ب فەضلێ بووکە من موئەیەد گەر چی ئەز ڤەبم ئەز قەبیح[١]

---

[١] غەمێ ژ باشی ڕۆژا خوە ب خوە نەبێژە بو چ وچرا، یێ بێژە نە وەیە تو ژێرە ناڤێ یان باوەریێ پێ نەینە ئەو کافر دبە.

[٢] تاعەت ناسی نامەیە بۆ مرۆڤی دزانە کو کولەیە کریار نڤێژ ڕۆژی، عەمەل ئەمەلە هێڤی یە بۆ مرۆڤی بێ تاعەت ناس نامە نینە نەناسە ژ کریارێ و مالێ بێ هیڤیە ئەمەلا وێ نامینە.

[٣] ئەو کەسە و دالیێ بۆ کەیف و لەزەتا دینێ، بزانبە ئەو رحسەیێ و خوەشی د عیلم تنێدە هەیە یا دینی پوچە.

[٤] ئەندازیاریا عەمەل ژ زانینێ ژعلمێ بگرە و فێر ببە ئەو حوکمێ نە خودایی بت ئەو حیلە و مەکرە. نە ڕاستە

[٥] تام ولەزەت ئەوە یێ زانا ژ زانینێ وەردگرە ژ وێ دبینە نە ب عەمەل دچە بەهەشتێ بەلکی عەمەل کرن ئەگەرە بوچوونا بەهەشتێ.

[٦] ئایین دڤێت خالس بۆ خودا بت نە سیاسەت بت دڤێت وەکە شەریعەتی بت نە وەکە وێ بت.

ژیێ من چقا درێژکی نەذرە بۆ تە بم
د دەرسا شەهدە و فاتیحێ و قورئانا تەبم[2]

صالّح چوونە ئەهلێ فەضلێ ژێ تەبا
ژ وان ما نە سیما و قەباء و عەبا[3]

خودا گوهـ زمان ژ زەمین سطاندیە
(لایبالیهم بالە) دانیە[4]

ژ ئیبلیس و دنێ ژ نەفسی و هەوا
مە توبا نصوحە ژ کەیف و خەوا

ب جیما جەهولی تو نەرە وەحشەتێ
کتابێ نە بەردە تێ رێ غەلەتێ[5]

ڤێ جارێ کەبیرا عەفووکە خودا
جارەك دی نەرەم وا مە سۆز بەرتەدا[6]

---

(١) هەکە تو چێ کور بێ تو وێ دین قایم بکی ئەڤ حەدیسێ درستە ب فەزلێ چاکیێ هەکە خودا فەزلێ ل من بکە ئەز دبم وەکە بوکێ رند دبم چەندی ئەز نە رندم ژێ.

(٢) دبێژە یا رەبی تو ژیێ من چەند درێژ بکی ل سەر من نەزر بت ئەز بۆ تە بم ئەز دەرسا شەهدێ و فاتحێ و قورئانێ بێژم.

(٣) مرۆڤێن چاك چوونە ئەوێن خودانین باشیێ ژی بوارە چوونە شوون وا ڤەمایە ئەوێن تێنە بەحس کرن سەروسیما و کورك عەبا.

(٤) خودا گوهـ و زمان نەدانە عەردێ، ژ وێ ستاندنە دەوسا وێ دە (لایبالیهم بالە) دانیە. یانێ قیمەت نەدایێ هەر وەکی ڤێ حەدیسێ کو دبێژە چاك چوون یێن دەستێ بەرێ ئەڤێن مایین بن بێدەرن وەکە یا چەو خورما عەفارا وامە، خودا بچاڤێ رەحمێ تەماشە واناکە.

(٥) ب گەلەك نەزانینێ تو نەچە وەحشەتێ پەرتووکێ نەبەردە هەکە تە بەردا تو دێ بچی خەلەتاهیێ. سیفامونا لەغەیە.(جهول) گەلەك نەزان.

(٦) یا رەبی تو ڤێ جارێ گونەهێ من یێن مەزن عەفو بکە جارەکا دی سۆزبت ئەز نەچم بال گونەهاڤە.

ڕۆژا خەسفێ من کە کەرێ مەکەرێ
نەقلیاتێ ژ ڤێدێ بدەم وێ دەرێ[1]

ڕۆژا رەم دۆژێ ژی کافر نەبم
ب ئیمان و تەوحیدێ عەبدێ تەبم[2]

حیکمەت چالەتا موئمنە و لەقطەتە
ئەخذ دکە و نا نێڕە ژ کێدا کەتە[3]

کی وارثی نەبی بە (علیه البلاغ)
بە منبر ومحراب لە لا مساغ[4]

بۆ وە ڤان هەڤالان دڤێم پێشمەرگە بم
د هەر ئێش و بەلایان فەدایێ وە بم[5]

کوفر چقاس پڕ بە ئیسلام پڕ ترە
دوو کەلمێ شەهادەت سەری وێ دبرە[6]

گوناه چقا مەزن بە عەفو مەزترە
دەنز پاسفیك ژ ڕەحمەتێ یەك فڕە[1]

---

[1] ڕۆژا پفکرنا سورێ کو مرۆڤ رادبن دچن بەر حەشرێ من بکە گوهـ درێژێ سوخرێ (مەکەکری) ئەز تشتا بگوهێزم ژ ڤڕ بوور.

[2] یا ڕەبی ڕۆژا تو من باڤێژی دوژەهێ ژی من کافر نا ڤێژە تێدا بلا باوەری و تەوحید من هەبت ئەز عەبدێ تەمە. یا خودا.

[3] حکمەت زانست وەکە تشتەکا وندابوویا باوەرمەندیە ل کو ببینە بلا راکە نە بێژە ل کو بۆ و یاکیە. (الحكمة ضاله المؤمن) ـ حەدیسە.

[4] کی میراتگرێ نەبینە ل سەر وی واجبە ل سەر وی گۆتن و دڤێت زمانێ وێ بۆ خوەندنێ ڕاست بە منبەرە و میحرابە نەبوو یێ فەسیح بە.

[5] ژبۆ هەوە ڤان برایێن مسلمان و هەڤالێن باشی من دڤێت ئەز ببم فدایی ژبۆ کار و شولکەرا ئەز گوری وەبم.

[6] کوفر چەند پر بە ئیسلامیەت ژ وێ پڕترە هەر دوو کەلیمێن شەهادەتێ سەرێ کوفرێ دبرە.

تـــو تـــەوابـــیٚ ئیحســـــان کـــــە توبــــا نـــــەصـــوح
ب ئـــــەســــــمائێ حوســـــــنا موقـــــەدەس کـــــــە ڕوح[2]

د ســـــەوقیـــــاتێ ســـــاق ل ســــاقێ د حـــــەبلـــــە
بـــــارێ گونـــــەهــــــان ژی ل پشـــــــت و ملـــــــە[3]

تـــە چـــاڤ هـــەر ل شـــوغول بـــە نـــە خـــەو خـــارنێ
یـــێ ئـــاخرەتــــێ ئـــەوەل پاشــــی یـــێ دنــــێ[4]

ب تـــەدبیـــر بـــە ئـــەمــردار تـــەوەکـــول ب خـــودێ
ب قـــەدرێ خـــۆ نـــەگـــره ب مینـــی ژ مـــەقصــــەدێ[5]

بـــێ حـــەد و حیســـاب شـــاکرم تـــە نـــە گـــۆت
نـــك مـــن بـــێ حـــەضــووڕە بـــلا قـــەت نـــەبنـــی[6]

یـــەك ڕەحمـــەت ل دنـــێ نـــوط و نـــەهـــ ل ئـــاخرەتـــێ
دەنـــــز باســـــفیك یـــــەك نوقطـــــە ژ ڕەحمـــــەتـــــی[1]

---

[1] گونەهـ چەنـد مـەزن بـن و زۆر بـن عـەفوا تـە ژ وا مەسـترە، بـەحر و دەریـا پاسـفیکێ ژ ڕەحمەتا تە یەك فرە فرەکا ئاڤێیە.

[2] یا ڕەبی تو تـەوابی تەوبـەك نەسوح بکـە بارا مـن ب خـاترێ ناڤێن خوە یێن حوسنا کـی ڕۆحێ من پیر و موقەدەس بکە.

[3] دڕۆژا ڕابوونێدە (قیامـەت) لنگـێ مرۆڤـا ل هـەڤ د حـەبلن ژ ترسـێ خـدا "والتفت الساق بالساق" (القیامە: ٢٩) باری وی ژ گونەهان گرانە ئەو ژی پشتا ویە و ل سەر ملێ وی یە.

[4] بلا چاڤێن تە هەر لکرنێ بە نە ل خوە و ڤەخارنێبە. بەراهیکێ بۆ ئاخرەتێ پاشی بۆ دنیایێ. ژبەر ئاخرەت گرانە.

[5] بزانبە تو دبن فەرمانا خودا دەیی تو فەرمان بەری بلا هەمەتا تە سەر خودا بە. نەك تو هەر ب خوە قەدەرێ بگری ژ مـرادا خوە بمێنـێ پاشـی ڤە قدەر هەر هەیە لێ دڤێت تو ژی بزاڤەکی بکی.

[6] بێ هەژمار و بێ حەساب ئەز شوکردارم مانە تە کەسێ بێ پەرگال بلا قەت نەئێ، دڤێت مرۆڤ ب پەرگال هەرە حوزورێ.

دما يەعنى دا جەهدێ بكە ماه و سال
موەفەق بەدا نەرێ قيل و قال[2]

دبێ ژ بارانێ ئاڤێن دنێ وەك فوڕات
يا تيهێ بەنى ئيسرائيل ژ كوڤە هات[3]

موسا ژێ كەليمە نە وەك مە ب دەنگ
مينا ديتنا وى وە نە ب كەيف و كەم[4]

كيتابا ژ ڤى علمێ هوور كر نە سكۆت
بلا هوون نەزانبن و خەير دەر سكۆت[5]

يووسف ئوذون و خەيرەگايێ وەيە
ل نەقلێن وى نانێڕن دبێ وەسواسەيە[6]

گۆهێ دايە يووسف توجا بۆ وە نەدا
ژ وەڕا ئەز گەلەكم وە تو ب من نەدا[1]

---

[1] يەك ڕەحمەت هاتيە سەر ڤێ عەردێ نوتو نەهـ مانە ل وێ دنێ ئاخرەتێ وێ ل باوەرمەندا بێتە خەرج كرن. ما دەريا ل بەر ڕەحمەتا تە چيە.

[2] ب وێڤە مژوول بە ئەوا بۆ تە مراد مەخسەد ب مانگا و سالێ تێدا كوششى بكە دا تو موەفەق ببى دا تو نەچى گۆت گۆتگا.

[3] دبێژن ئاڤێن سەر دنيايێ ژ بارانێ پيك تێن و كەروبارێ فوراتى و شەتێ جزيرێ و خابوورى و زێ مەزن و بچووك. ماكا ئاڤا بەنى ئيسرائيلا دەمێ دتيهێ دا بوون ئەو ژ كووڤە هات. كو نەبى مووسا دا رێ خوە ل بەريدا و ئاڤ د هەركى. ژ قودرەتا خودا دهات هەميژى وەسانە.

[4] نەبى مووسا ئاخاڤتيە بخودارە لێ نەوەكەمە ب دەنگى خوداديتيە ل چ تشتى نەدچوو، يانى نە ب دەڤ و زمان، و نهێنێ خودا ژ وا دوورە.

[5] پەرتووكا ژ ڤێ زانينێ خوە دوور هور كرنە ژێ نە ئاخڤتنە بلا هوون ژى د ڤى عيلمى دە نەزان بن خێر دنە ئاخاڤتنا وێ دايە مرۆڤ ژێ نە ئاخڤە باشترە.

[6] يووسف ژبۆ هەوە تشتا خێر دبێژە ماكايێ بێژە وەيە لەوا دەرێن ژى ئاينى نانێرن دبێژن وەسواسە.

د کیتابێن ئیلاهی دا صەد مادەنە
میصداقێن نبوەتا نەبی یێ مە نە[٢]

تو من ژ موتەقیێن ئیمان باوەری
ب غەیبێ بگرە تە یێن باوەری[٣]

ب ئەسمائێ حوسنا موقەدەس کە ڕوح
تو تەوابی ئیحسانکە تەوبا نەصوح[٤]

ل من سۆز بە ب تەڕا بم بتە ڕوونم ب تە ڕا بم
د ئەمرێ تە دابم من ل تەوبا نەصوح[٥]

کەلیمێ خودا یی تو دەنگێ خودا
چووادکی نکاری جەوابەك بدا[٦]

ژ وان یێن ب غەیبا تە ئیمان ئەز هەبم
ب ئیقاما صەلاتێ دبن ئەمرێ تە بم[١]

---

[١] ئەو گوهـ و بهیستنا کو دا یە یووسف نە دایە هەوە ژبۆ هەوە ئەز گەلەکم یێ هەوە چوو ب من نەدا هەوە قەدرێ من نەزانی.

[٢] د پەرتووکێن خودا سەد ماددە هەنە هەمی ل سەر ڕاستیا نبووەتا نەبیێ مە نە هەمی دبێژن قاسدێ خودایە.

[٣] یارەبی تو من ژ وا کەسێن کو باوەرمەندن بغەیبێ نە ژ وێ بێ باوەر من حەسا بکی.

[٤] بناڤێ خوە یێن حوسنا ڕۆحێ من پیرۆز بکی تو تەوبێ قەبوول دکی کەرەم کە تەوبەك باش بدە من یارەب.

[٥] من ژی سۆز و وعدە بە ئەز دگەل تەبم و ب تەڕابم و ب تە ڕۆن و ژ گۆتن و فەرمانا تە دەرنەکەڤم.

[٦] تو بخودارە ئاخفی "ایاك نعبد وایاك نستعین" (الفاتحة: ٥) ئەڤە ئاخفتنا کو تە دگەل خودا. خودا ژی گازی تە دکە گەلەك جارا، تو چاوا دکی نکاری بەرسڤا خودا بدی. ئەمرو نەهیا پێك بینە. ئەڤە تە بەرسڤ دا.

ئەهلێ تیهێ ژ مصرێ دەما دەرکەتن
ئەو شەش صەد هەزار بوون ژ غەیری ذوریێن[٢]

د دونیایێ ستار تە ل گونەهێن مە کر
د عوقبایێ دیسا بکی هەر شکر[٣]

ئینسانێ جەهولم نان کورێ کەنوود
نە ڕاست و درستم بەلێ تو وەدوود[٤]

سەر نەفسا خۆ ڕەحمەت نقیساندیە
یەك دایە دنێ نۆد و نەهشتییە[٥]

ژ تلبیسا خەبیثا ڕدەت چێ دبە
دیسا هاتمە ئیمانێ وەرژی دبە[٦]

نە وەك یا زەمانێ مرییێن بن هەدا
گۆهداری وێ نینە دین ب دونیا خودا[١]

---

(١) یارەبی من بهەژمێرە یەك ژ وا یێ کو ب غەیبا باوەریێ ئانینە بکرنا نقێژا و دبن فەرمانا تە دەبن.

(٢) قەومێ مووسا ئەهلێ تیهێ. کودبن مژێدە مان چل سالا ژ وارە دبێژن ئەهلێ تیهێ، دەما ژبەر فیرعەون دەرکەتی ژ مصرێ شەش سەد هەزار بوون ژبلی زارۆکا.

(٣) د دونیایێ تە ستار کر گونەهێن مە کرین د ئاخرەتێدا ژی دیسا ستار بکە ئەمێ شوکرێ بکن.

(٤) ئەز مرۆڤەك گەلەك نەزانم و مرۆڤەك نان کورم و چاکیا نابینم و نە ڕاست و درستم یێ تو وە دودی. و ب ڕەحمی دلۆڤانی.٠

(٥) تە ل سەر نەفسا رحمەت دلوڤانی نقیساند و ئەوی دلۆڤانی کریە سەد. کەر، یەك تە دا دنێ نوتو نەهـ مانە ل ئاخرەتێ.

(٦) ژ تێکلبوون پیسا خەبیسا ژ ئایین دەرکەتن پەیدا د بە ئەڤە ئەز دیسا هاتمە باوەریێ ما وەسا ژی نابە، یاخودا.

بــۆ هــەر نــەفــع و ضــەڕێ ڕەبــێ عالــەمــێ
بــەســی عالــەمــا خــۆ ڕەبــێ عالــەمــێ(٢)

ب حــەقــی وی وی ناســی کــە تــو بــەنــی ئــەوی
تــەقــواتیێ لیبــاس کــە ڕوح و جــان دە ئــەوی(٣)

تــە کــەیــف کــەیفــا وییــە نــە ل کــەیفــا خــوەبــە
ســەر و مــال تــەیــێ وی جنــەت بــۆ تــەبــە(٤)

عیبــادەت تــو سســتکێ موحــەقــەق خــودا
مــەعیشــەت دێ طــەنــگ کــە عــەذابــێ خــودا(٥)

خــودا حــەق ببینــە حــەقــێ وی دەرینــە
وە جاهــل نــەمینــە قــەنــج نــاس کــە خــودا(٦)

ل جاهــل کــە هلهلــو حــەلقلــی نــە بــین
ل ســەر هــەر موکــەلــەف تــەجوید فــەڕضــە عــەیــن(٧)

---

(١) نە وەك یازمانێ وا مرییێن کەتین بن هەدا تو کەس گوهداری وا نینە ئەو چوون ئەوا ئاییێ خوەدا نە ب دونیایێ هاوار و گازیاوا. کەسی گوهـ لێ ناگرێ.

(٢) ژبۆ هەر مەنفەعەتێ و هەر زەرەرێ ژی هەر رەبێ عالەمێیە خودا بەسە بۆ عالەما خوە.

(٣) تو مافێ وێ ناس کە تو بەنیێ وی جلا تەقواتیێ ل خوەکە ڕح و جانێ خوە بدە خودا.

(٤) تە کەیف بلا کەیفا خودا نە تشت بلا وەکە کەیفا تەبت کەیفا تە گەلەك جارا خەلەتە نە وەکە یا خودا یە. سەر و مالێ تە یێ ویە ژبەر ڤە بەهشت یا تەیە. [ان الله إشترى من المؤمنين أنفسهم وأموالهم بأن لهم الجنة] (التوبه: ١١١)

(٥) هەکە تو کریارێن چاك سست بکی موحەقەق خودا ژی وێ ئابووری و دەربارا تە کێم بکە ئەو سەزایێ خودایە بۆ کولەیێ وی.

(٦) خودا حەق ببینە بزانبە و مافێ خودا ژ ژیانا خوە دەرینە کو تاعەت و عیبادەتە. و نەزان نەمینە خودا باشی ناس بکە.

(٧) بێژەیێ نەزان و جاهل هلو هلو تو نە خودان مافی. ل سەر هەر مرۆڤەکێ تەجوید قورئان ڕاست خوەندن فەرزە.

عالم گۆتیە ئەز ژێ بەیان کم ب سۆز
کا دەعوا تە دایی کا ئەو دەعوا و دۆز[١]

عالم دەست نەدە یووسف دێ ڕەپیا
ئەو سونەتا عیسا پێ شاگرتیا[٢]

شەڤا مە یەکە لێ دزێن مە هەزار
ئینسان پڕ ضەعیفە مە شەیطان نەیار[٣]

ژ حەول و قووەتا غەیرێ تە ئەم
بەرینە و فەقیرێن تەنە دەم ب دەم[٤]

د ڕوویێ ئادەم ژ ژۆرێ هاتە خار
مە ژی دێ ب خاپینە بچنە نار[٥]

ئیلائێ خودێ مە ژ وی حیفظ بکە
د ئەمرێ خودێ بە بیا وی نەکە[١]

---

(١) یێ زانا عالم دبێژە من سۆز دا ئەزم بێژم و بەلاڤ بکم ئەوا من زانی کا ئەو دەعوە و دوزا تە دا یێ وێ بتە پرس کرن.

(٢) دبێژە یا زانا عالم دەستێ خوە نە دە من ئەز ماچ بکەم ئەزێ بچم ئەزێ هەرم یێ تە لنگێ تە ماچ بکم، وەکە نەبی عیسا (سلاڤ ل سەر بن) کو لگێن هەڤالێن خوە حەواریا ماچ دکر.

(٣) ژ گۆتنا مەزنا یە دبێژن شەڤ یەکە دز هەزارن. ئەو ژی دبێژە شەڤا مە یەکە دزێن مە هەزار. یانی نەیارێن مو گەلەکن و ئەم ژی گەلەك ژارن نەفس و شەیتان و دونیا وە هەڤالێ نەباش و گەلەك دی ژی نەیارن.

(٤) یا ڕەبی ژبلی تە مە چ هاریکار ژی نین و ئەم فەقیرێن تە نە هەر و هەر مە ژ تە پێ ڤە کەس مە نینە کەسێ مە تو وی.

(٥) د ڕووێ باڤێ مە ئادەم دا ژ ئەسمانا هاتە خارێ شەینان هەکە نەوە سابا نە دهات بەلا وێ ل مەنە دکەت. ئەم ژێ بو وی نەدهاتن خاپاندن، ئەم نە دچوونە دو ژەهێ.

چ تشـــــتا ببــــه ب ئـــــەمـــــرێ وی چـــێ دبـــــه
وەك ب ڤـــێ د (طرفـــة العـــين) ئـــەو دێ هــــەبـــه[٢]

نێـــــــزيكم وەرە بـــــەر دەرێ فابريقـــــا كـــــــن
د ئـــــەمـــرێ مـــەدا بــــە تــــە ئيمــــان ب مـــــن[٣]

دڤـــێم وارثـــى نــــەبـــى بــــم داعـــى بـــال خـــودا
مـــوەفــــەق تـــو مـــن كــــە ژ خـــوە ڕا ئـــەى خـــودا[٤]

(ســــمعنا واطعنــــا) هـــــەرى و تـــــا هــــــەبـــێ
ل ســــەر عـــــەهـــــد و ســــۆز و قـــــەڕارا تــــەبـــێ[٥]

لــــێ ئيبلــــــيس دنــــێ نـــــەفــــس و هـــــەوێ
نـــــەيــــارن مـــــه حفـــظ كـــــه ژ هــــەر ضـــــەڕەرێ[٦]

لاوينـــــى دينيتـــــێ ســـــتار تـــــه ل مــــــه كــــر
عـــــومرێ ئيختيــــــارى د وەعــــــــظ و ذكـــــــر[٧]

---

[١] هەكە خودا مە ژ وی بپارێزە نە خوە شولێ مە دگەل وی زۆرە. كو ئەم كارێن بيا خودا بكەن و دفەرمانا خودا دەم بن بەلكى ئەم ژ وی ڕەهابێن.

[٢] هەر تشتێ د ڤێ هەينێدا چێبە ب فەرمانا خودا چێ د بە وەكە وی ب ڤێ بت وەسا دبە هەكە بێژە تشتەكى ببە دچاڤ نقاند نەكر دا چێدبە.

[٣] خودا دبێژە كولەيێ خوە وەرە ئەز نێزيكم "واذا سألك عنى فأني قريب" (البقرة: ١٨٦) وەرە بەردەرێ كارخانا (كن) د فەرمانا مە دە بە تە باوەرى بمن هەيە.

[٤] من دڤێت ئەز ميرات گرێ قاسدێ خۆ دابم و داخازا ئيسناب كم بال خو داڤە تو يا خودا من سەر بێخە ژبۆ خوە يا خودا.

[٥] ئەز گوهدارێ فەرمانا تە مە هەتا هەبم و هەر و هەر تا هەبى. ئەز ل سەر سۆزا خوە مە ئەوا من بۆ تە دايى.

[٦] يێ شەيتان و دونيا و نەفس و ڤيانا نەفسێ ئەڤ هەمى نەيارن تو ژ وا من بپارێزە.

[٧] لاوينى ڕەنگەك يێ شێت بۆ نێيە تە ئەز ستاركرم عەمرێ پيريتى دزكر و تاعەتدا و وەعزێ دا دڤێت ببوورە.

## ويه نستعين

تخلـــــق بقـــــرأن شـــــفاء ورحمـــــة
ونـــــور مـــــن اللـــــه وخلـــــق محمـــــد[1]
فـــــآو اليـــــه هـــــو شـــــديد بركنـــــه
وفصـــــال احكـــــام بســـــيف مهنـــــد[2]
ولاتنســـــوا الفضـــــل مـــــن اللـــــه رفعـــــة
فيـــــامن أتاهـــــا هـــــاك ذافـــــي المـــــروءة[3]
اذا اولـــــه الشـــــيطان العبـــــد يطفـــــؤ
مـــــن القلـــــب أنـــــوار الحيـــــاء والفتـــــوة[4]

---

(1) (تخلـق) ب كـوردى (خـوى) پێويسـته مـرۆڤ خـويێ وى يـێ قورئـان و موحەمـەد بت ئـەو قورئـان چاكبوونـه و دلوڤانييـه و ڕۆناهييـه ژ بـال خوداڤه. چاخـى ئـەخلاق بۆ يـێ قورئانا پيـرۆز وێ دەمـێ ژ شـولێن نـەپاك دوور دكەڤـه د يـێ مرۆڤـەك چـاك. ژ دايكـا مسـلمانا عائيشێ پرسينه گۆتن: ئەخلاقێ پەيغەمبەرى موحەمەدى، چاوا بۆ گۆت: (خلقه القرأن) خويێ وى قورئان بوو.

(2) فێ و خوه بده بال قورئانێڤه بلا جهێ ڤەحەواندنا ئەوبت. ئەو ژ بنيات و بنه تورا خوه قەويه و ڤەكرنا هەمى دوزايه بشوڕەكى تيژ و برەك. بەرێ دگۆتن: ئەو سەريێ ب شورێ ئيسلامێ بيته بڕين تو ژێرا نايێ گۆتن: ژبەر كو حەقه يان تليا شەريعەت ببره خوون ژێ نايێ.

(3) بلا نەيێته ژبيركرن چاكى ژلايێ خوداڤه قەدرەك بلند ژێره هەيه خوەزيا من بێ كو ئەڤا ژ وي ڕە هەبت ژ جامێرێ.

(4) چاخێ شەيتانى شيا مه بلا ئينانى دا بال خوەڤه وێ دەمێ ڕۆناهيا (نوره) فهێتێ ژناڤا دلێ وى د ڤەمره ومێرانيا وى نامينه دكەڤه دبن فەرمانا وي دە.

ولا يملك النفس ولوذا وجاهة

ويلقيه في الشر مبادي الخصومة[١]

أنار مجوسي أفلس فلوسي

ستالين روسي سوا في العبادة [٢]

ودينار نار درهم هم غمها

وحبك هاتين كفى في المهانة[٣]

أما كنت مبنيا بتركيب قدرة

بأحسن تقويم بغيرتها فت[٤]

فياواله القلب الم يأن رجعه

فمن اين في اين الى اين يافتى[٥]

فلا تتخذ أخدان سوء لصحبة

عليك بأخوان الصفى والصلاحة[١]

---

(١) کەس نکارە ببێ خودانێ نەفسا خوە چەندان مروفەك بە شەڤ ژي بت نەفس دێ وی باڤێژێ د شەردە دەستپێکرنا د قەرەبالخیدا و قیرقیرێدا، ما چ فەرەق د ناڤبەرا ئاگر پەرستیدا هەیە.

(٢) فلوس پەرستیدا ئەڤ هەمی وەکە هەڤن د پەرستنێدا هەمی وەکە هەڤن ژبەر نە ژبۆ خودایە ئەو پەرستنانە ژبۆ خودا بت وەکە هەڤن.

(٣) دینار ئاگرە درهەم هزر و خەمن حەز ژێ کرنا تە بۆ ڤان هەر دووکان بەسن بۆ تە ژلایێ سڤکاهیڤە وکێم کەتن. مرۆڤ نابێ پەرە پەرەست بت. دێ مرۆڤ ببن ئاگری.

(٤) ماتو نە ئەو کەسێ کو خودا ژ تە نەبوونێ لێکدایی و گەهاندی هەڤ ب شیانا خوە (قودرەت) لاوترین پێك ئافین بێ کێماسی و سستاهی د چێکرنا تەدا نینە [وخلقنا الانسان في أحسن تقويم] (التين: ٤).

(٥) یا ئەو کەسێ خودانێ قەلبەك پاکە ما وەخت نەهاتیە کو تو ل خوە ڤەگەری ماتو ژ کو هاتی تو ل کویی تو بکووڤە دچی یا مرۆڤێ لاو و جوان و خورت، مرۆڤ دڤێت ل خوە بزڤڕە خوە چاك بکە بەس نزانبە بکووڤە دچە.

وكن يسلم عام لا ضرار ولا عدو
ويوسف صديقا لأهل السعادة[٢]

على حب دنيا أقبل الخلق جملة
وأن طاعة منهم فشرك وعادات[٣]

كمن في ارتداء جلد ضأن تمسكنا
وقلبه قلب الذئب غدر وغارت[٤]

أرى النار حرصا كهرمي الزمان
فهل امتلأت وهل من مزيد[٥]

فويل لعبد كنود لربه
اذا ما شكرتم فأنا ازيد[١]

---

(١) هەر نەفەس ژ عەمرێ مرۆڤی کێم دبە. هەڤالێ پیس نە باش ژخوە ڕە نەگرە د سوهبەتێدا پێویستە ل بەر تە هەڤالێن چاك و پاك ژ خوە ڕە بگرە بوارە بمەشە.

(٢) تو هەبە بۆ عالەمێ ڕەحەت و سەلامەتبە نەزەرەر بە و نە بەلابەنە (دەرد) بە ژبۆ خوە دبێژە: یووسف ڕاستگۆیە ژبۆ ئەهلێن چاکیێ ڕا.

(٣) ل سەر حەژێکرنا دنێ بەرێ خوە بدە هەمی ئافەراندیا (خلق) هەکە ژ وا ژبۆ تە پەرەستن پەیدابوو ئەو شریکاتیە و عادەتە.

(٤) هەر وەکی و یێ پوستێ مهیێ وەرگرتی ل خوە پێچایێ مە ژی خوە پێ گرتیی حالە حالە قەلبێ وی دلێ گورگیە ب خەدر و ئێریش کرنە ل سەر مرۆڤێت بێ گونەهـ. گەلەك مرۆڤ هەنە ل بەر چاڤێت خەلکێ وەسا خوە نیشان ددە کو وەکە مهیێ یە بێ زیانە. لێ دلێ وی هند ڕەقە وەکە دلێ گورگیە.

(٥) ئەز ئاگر دبینم گەلەك ب ڤیانە دڤێت هەر تشت هەبت و ئەو بخۆێ و بسوژێ هەر وەسا پیرەمێرێن ڤی زمانی هەر دڤن د دونیایێدا بن دونیا وا هەبت و حەژێ دکن خودا دبێژە دوژەهیێ ماتو تە ژی نەبوویی ئەو دبێژە خودا چەند هەبێ ومن دڤیت و ل من زێدە بکە تێربوونا و ي نینە.

ولا دلالة للمرء على شرف

بالمال والولد وسائر النعم[٢]

فجارنا وكذا الأبرار سائبة

منها فلا فخر بالمال على القدم[٣]

رياض العلم تفوق رياض عدن

هو الهادي الى ذاك المال[٤]

فان العلم معدن كل خير

يقربنا الى ذاك الجمال[٥]

فعلم المرأ هرغام العدو

سلاح العلم حسبك في القتال[٦]

فرأس المال للمرء العلوم

---

[١] وەیل نوالەك یا جەهنەمێیە دبێژە وەیل ژ وي كەسي ڕابت ئەوێ ژ چاكیێن خودایێ خوە ڕە چاڤ گرتي بت و وا نیعمەتا نەبێنیێ وا ئینكار بكە. چاخێ مرۆڤ سپاسیا داینێن خودا بكێ خودا چاكیێن خوە ل سەر مرۆڤ زێدە دكە [ولئن شكرتم لأزيدنكم] (ابراهيم: ٧).

[٢] تشتەك نینە كو بێژە شەرەفا مرۆڤي ب هەینێە ب مالە یان ب كور كەچانە یان ببە ژ نوو بالانە یان ب ئاخاڤتنایە یان ب جل و بەرگانە نەقەنجێن مە.

[٣] هەروەسا چاكێن مە ژی ژ وان زۆڕ دبێژن: گۆتنە خوە مەزن كرن ب مالی سەر (قيم) و ئەخلاقی و خۆیی ناكەڤە یا چاك بۆ مرۆڤان ئەخلاقێ پاكە ژ هەمی هەینا چاك ترە بووي مرۆڤێ ب شەرف.

[٤] قەدر و قیمەتێ باخچەیێ زانستێ (علم) زێدەترە سەركەفتي ترە ژ بەحشتا عەدنێ خودا پەسنێ و ێ دده، دبێژە: [جنات عدن تجري من تحتها الأنهار] (البينه: ٨).

[٥] زانست علم رێ خۆش كرنە بۆ ڤێ مرادێ وڤێ واتا هەبوویێ مرۆڤ دگەهێ ڕازیبوونا خودێ و بەحشاتا خودا پەسنێ وێ دایێ.

[٦] زانین ئنسانی نەیاری پاشدا دده و دشكینە، زانین بۆ تە چەك بت بەسە بۆ تەد شەڕیدە.

كذا الكتب كنوز من لأل[١]
فعلم المرء حمآء الذمار
وذو المال يقتل في الصيال[٢]
سلاح العالم العلم قرينا
كراديس اتخذت كنز مالي[٣]
وأفنى محاسني في العلم كرها
الى الجسم النحيل لا أبالي[٤]
تحصل في العلوم وكن جماعا
وعنوانا ويما في المثال[٥]
وكن كشاف غمآء الحياري
وفياضا وفيضا في الامال[١]

---

[١] سەميان، شكارتە يێ مالى بۆ مرۆڤى زانستە، علم و زانينەميانێ مالێ مرۆڤيە هەر وەسا پەرتووك ژى دەفينا مرۆڤايە ژ لوءلوئێ مرۆڤێ زانا پەرتووك نەبن بێ سەميانە.

[٢] زانينا مرۆڤى يان زانست بۆ مرۆڤى پاراستنە وهێزە بۆ خودانيێ زانستێ لێ خودانێ مالى ژبەر مالێ خوە تێتە كوشتن ئەو مال بەرگريێ ژێناكە. ئەو نوبەتێ ل مالي دگرە بێ علم نوبەتێ ل تە دگرە، زانست زيرەڤانيێ ل تە دكە بێ تو زێرەڤانيێ ل مالى دگرى.

[٣]چەكێت مرۆڤى زانا زانستە و زانينە ئەڤاهە هەڤالێ موهنكێ لاشێ منن دوو هەستك سەرێ وابگهەڤە هەڤ دبێژن: كەراديس (كراديس) من زانين ژ خوە ڕە كريە دەفينا مالێ خوە. دبێژێ من موهنك، موهڤكێ د لاشێ من دا هەنە من ب زانستێ شداندنە.

[٤] من د ڕێيا زانينێدا ڕنديێين خوە هەمى من خەلاس كرنە و پووچ كرنە (فنا) بێ حەمدێ و نە ژ ڤيان. من هايژ لاشێ خوەيێ زەئيف و ژار نينە دلێ من نە پيڤەيە. كو دبەر زانينيدا بووچ بێ.

[٥] ژبۆ تێگەهشتنا زانينان عولومان گەلەك كۆم بكە دەست خوەڤە بينە و گەلەك كۆم كەر ببە.

هو الدنيا وبدلها بعلم
تحمق من تعنق بالمزال[٢]

وكلم عالما حين التلاقي
بهل القلب في ذاك الخلال[٣]

هو الدنيا وبدلها بعلم
تحمق من تعنق بالمزال ذا زوال[٤]

وأياك وسمعا ليس سمعا
وقد ضل بذا أهل الضلال[٥]

دع الدنيا وهي أم الخطايا
هي الشوهاء قنال الرجال[١]

---

[١] كو تشتا كەشف دكن تو ببە ژ وان كەسان ئەوێن سەهلاهی یێ چێدكن ژبۆ وا كەسێ د شول و كارێ خوە دە مانە حەیری نزانن چ بكن تو ژی نیشا وا بكە، بلا چاكیێن تەپربن ژبۆ مرۆڤان تو فەیز بە ژبۆ داخوازین مرۆڤا و هیڤیێن وا بجهـ بینە.

[٢] ئەوێ دنیایێ بەدل بكە بگوهەرە ب زانینێ وعلمێ، ئەو كەس نەزانە ئەوێ دەست ب ستووێ ڤەبت ئەو تشتێت دچێ و نامینە ڤەدگەرە. دونیا ژی ژ وان تشتایە كو دوما وێ نینە و زائل دبت نەبەردەوامە.

[٣] چاخێ تو ڕاستا زانایەكی هاتی پێرا باخڤە وێ دەمێ دل ڕۆناهي دبە و گەش دبە وەكە گولەك وەرە ئاڤدان.

[٤] دونیایێ پاقێرە بگوهوڕە بزانینێ ئەو كەسە بێ عەقلە كو ئەوازە والاویێ هەبە دكەس و ترا خودە و ژێڕە كار دكە.

[٥] ل سەر تە بێ خوە پاراستن ژ وێ گوهدانا نە گوهدان گەلەك گومرەهـ بوونە بڤێیاهە خودانێ گوم ڕەهبوونێ. وندابوو خودانێ وەندابوونێ و ژ ڕێ دەركەتنە ژبەر گوهـ ل قورئانێ و گۆتنێن ڕەسول دبوون و گوهێ خوە نەد دانێ چوون ضەلالەتێ.

وهي لم يتخذ من خليلا
ومن أهواها منا في نكال[٢]

هي الدنيا تقول بملأ فيها
لك الخذلان يا من في حبال[٣]

وجاء جاهها لا خير فيه
كظل الاستواء في زوال[٤]

فطوبا ثم طوبا ثم طوبا
لمن بلغته ذاد ارتحال[٥]

ومهما زاد مالا زاد جوعا
وحرصا مثل سرحان الجبال[٦]

---

[١] دونیا یێ باقێره و تەرك بكە ئەو دیا گونەهایە ئەو وەك پیره ژنەكیە ئەوا رو قەرمچی وەكە پیرا مرۆڤ خورەمێر كوژه گەلەك مرۆڤ كوشتنە، وێ تە ژی بكوژه هایێ تە ژ تەهەبت.

[٢] دنیایێ ژ مە ژ خوه ڕه نەكریە دوست و حەز ژێ كەر چ كەسێ ژمە ڤیانا خوه بدە بال وێڤە ئەو د نەخوشییێدا یە و زەحمەتێ وێ ببینە دڤێت مرۆڤ مەیلا خوه ژی نەدێ بالڤە.

[٣] ئەو دونیا دبێژه ب هەمی تەژی بووناتێدا هەیە پوشمانی وكێماسی بۆ تەنە یا ئەو كەسێن كەتین د ناڤ وەریسێ من دا.

[٤] ئەو كەسێ خوه ب دونیایێ ڤەگرێ بدە ئەو كو شەرەفا وێ تێدە نینە و كەس نیڤێن ڕۆژێیە ژبەر كو نەبەردەوامە دچە.

[٥] خوەشی ودیسا خوەشی بۆ وی بت ئەوێ كو هەمی كریارێن وی وهەینێن وی ژبۆ زادی ڕێڤنگیا وی بن ژبۆ كو ژ ڤێ دونیایێ باربكێ بۆ چوونا وێ دنیا دی ئامەدەكاریێ بكێ ژێرا بت.

[٦] چقاس مال زێده بت برسیبوون ژی زێدەدبت وڤیانا وی بۆ دنێ زێدەدبت حرسا وی وەسا لێ تێت وەكە گورگێ چیا. گور ژی هند بحرسە چاخێ دكەڤێ ناڤ پەزدا دڤێت بكوژێ ناخوە. هەكە یەكی بكوژه و بخوە بەسی ویە.

فهـــــو يجمـــــع وذا يجـــــرح ينــــادى

كلانـــــا مبتلـــــى بـــــالجوع خـــــالي[١]

كمـــــا ذا يأكـــــل ســـــربا ولايـــــا

كلـــــن ذاك علـــــى تلـــــك المثـــــالي[٢]

تركـــــت لأربيتـــــى نجـــــوا وبلغـــــة

وخلفـــــت فـــــيهم مـــــاتفوق مجـــــرة[٣]

وهـــــي كتـــــب الـــــدين لهـــــا صـــــرت آزرا

ومـــــا دمـــــت حيـــــا لا افـــــارق مســـــرة[٤]

وبعـــــد وفـــــاتي ان اقمـــــتم بحقهـــــا

فباللـــــه نـــــادوني وان كنـــــت رمـــــة[١]

---

[١] ئەویٚ مالدار كۆم دكیٚ گورگ بریندار دكیٚ دبێژن: ئەم هەر دوو خودا بەلانە ب برچی بوونیٚ. خالی یا خالیٚ من مرۆڤێت دونیا پەرەست كۆم دكیٚ و ناخویٚ و گور ژی بریندار دكیٚ و د چەڤیٚ و ناخویٚ هەر دوژی دمینن برسی باندكن دبێژن: زكیٚ مە هەر دووكا ژی ڤالایە ئەم برچینە.

[٢] وەكە وی بیٚ گەلەكی دخوە و ئەوێن دی ناخون و نادە كەسی وەكە مرۆڤیٚ چرۆك و كوند.

[٣] من تشتەك زێدە پاش خوەڤە نە هێلایە من تشتەك وەسا من هێلایە كوببیٚ قوتیٚ رۆژیٚ و ئەوێن پاش مندا بمینین خلاس بوونا وا بت مالیٚ زێدە پاشی منڤە نەمایە. لیٚ من ئەو تشت شوون خوەڤە هێلانە كو ژ رێكا كادزا ئەوا كو پر ستێرتێدە هەنە ئەو من ژ وارە هێلانە.

[٤] ئەو ژی پەرتووكێن ئاینینە ئەز ژ وارە بۆ مە ئازەر، ئازەر باڤیٚ ئیبراهیم پەیغەمبەر بوو خزمەتا پوتا دكر. دبێژن: ئەز ژی خزمەتا پەرتووكێن ئایینی دكم هەتتا ئەز ساخ بمینم ئەز ژ وا ناڤەقەتم ئەو كەیف خوەشیا منە.

به أستعيذ من ضياع ذريتي
ولاحول لي شيئا ولا لي قوة[٢]
والا فلاتا تومزاري بفاتحة
ولا بيننا شيء سوى لا أبوة[٣]
جعلت للات الكفر آزرسادنا
على الرغم آزرني لكتبك خادما[٤]
حمدتك ربي أن جعلتني آزرا
لنور مبين لا كآزر صانما[٥]
الهي وما أنزلته لشقاوة
علينا به اسعدني وأن كنت ظالما[٦]
فيا يوسف اشكره وحدث بنعمة
فبالشكر تزداد ولائك كاتما[١]

---

(١) دبێژن ژ وا یێن شون خوەڤە هێلاین پشتی مرنا من هەوە مافێ وا پەرتووکا هەوە پێك ئانی هوون ژ حەقێ وا دەرکەتن وەرن سەر گورا من و ژبۆ خودێ گازی من بکن بلا هەستیکێ من ژی ریزی ببن، ئەزێ کەیفخوەش ببم.

(٢) ئەز داخوازی ژ خودا دکم میرات خوەرێن من نەبەردایی بن، ژبەر کو چو هێز و حەول من نینە تو تشتی ئەز نکارم بکم.

(٣) هەکە وەسا نەکرن بلا نەیێن سەر گورا من فاتیحا نەخونن تشتەك دناڤبەرا مەدە نینە ژبلی کور و باڤی تیێ دناڤبەرا مەدە نینە ئەم نەچووێ هەڤن.

(٤) سپاسی بۆ خودا کو تە ئەز کرم ئازەر ژبۆ وێ ڕۆناهیا مەزن (نورا مبین) نە وەکە ئازەر کو ئەو پوت پەرەست بوو.

(٥) تە ئازەر گەراند خودان ئایین ژبۆ پوتێن کو فیرێ. ل سەر دفنا وی تو من بکە ئازەرێ پەرتووکێن خوە ئەز خزمەتا وا بکم.

(٦) یا خودا ئەو تە نە هنارتی نە ژبۆ نەخوەشیێ ل سەر مە تو من بوێ چاك بکە هەر چەند ژی ئەز ستەمکارم.

فـــــــلا تعـــــــدل فهــــــو نــــــور و روح
واســــــــــــــتاذ و دلال المعــــــــــــاني[٢]
فيـــا ليتنـــي مـــت و كتبـــي علـــى قبـــري
أذا بعثــــر القبــــر وكتبــــي علــــى ظهــــري[٣]
اســــير بأثقـــالي مكبـــا علـــى وجهـــي
عســـى اللــــه ان يعفــــو عنـــي بذالحشــــر[٤]
تبــــرأت مــــن اهــــواء مــــن باتكـــــالهم
علــى الغيـــر فـــي وشـــل الحظـــوظ الهوالـــك[٥]
ومــــن يفتخــــر منـــــا بعظــــم رميمــــه
فلــــيس بــــذي عــــزم ولا ذي مســـــالك[١]

---

[١] يا يووسف تو شكرێ خودا بكه و بەحسا چاكیێن وی بكه ب سپاسیكرنێ تو دێ زێدەبكی خودا دبێژە [لان شكرتم لازیدنكم] (ابراهیم: ٧) ب سپاسكرنێ خودا چاكیێن خوە ل سەر مرۆڤ زێدە دكە، تو چاكیێن خودا نە ڤەشێرە.

[٢] نەبێژە وەكەهەڤن یێ خودان زانا و نەزان یێ زانا ڕۆناهییە و ژیانە و سەیدایە و وانا كەلیما دزانە و ئاشكەرا دكە.

[٣] خوزی چاخێ ئەز بمرام پەرتووكێن من هەمی دانیبوونا سەر گوڕا من چاخێ گوربهاتا ڤكرن ژبۆ ڕابوونێ بۆ قیامەتێ پەرتووكێن من هەمی ل سەرپشتا من بوونا.

[٤] ب ڤی بارێ گران ڤە ئەز ب مەشاما ورویێمن ل سەر عەردێ بوویا هێڤیامن ژ خودا ئەو بۆ ل من ببوریا ب ڤێ حەش راهە ئەوا ب ڤان پەرتووكا ڤە ئەز هاتبووما بەر حەشیرێ.

[٥] ئەز ژ وا كەسا نینم و نە ژ وامە ئەوێن كو ژیانا خوە بەردن سەر هندەكی دی ژبۆ پەیداكرنا پارەكي كێم ژبۆ تشێت مرۆڤا دبە مەلاكەتێ ئەو حەز مرۆڤی دبێ هەلاكەتێ. ئەو كەسێ ژ مە خوەب هەستیكێن باڤ و باپیرێن خوەیێن رزیین مەزبكە ئەو مرۆڤەك بێ كارینە وبخوە نەباوەرەونە خودانێ چو ڕێكایە و ئەو نەخودانێ چو بریارایە و وەزیفایە و ڕێكاوی نەڕاستە.

ومن يتكل بالغير بطأ بلغة
فلا أصل يسرع به ومن له ذالك[٢]

فطوبى لمن لم يلتفت غير كده
أذا العبد في عجز اندفاع المهالك[٣]

وكل امرء منا رهين بكسبه
ولا تزر وازرة وزرها لك[٤]

بينا اذكر قوما من الحسد
كأنهم حمر فرت من الأسد[٥]

يقولون لي اسمع قولنا غير مسمع
والا ترحل غدات بلا غد[٦]

---

[١] دڤێت مرۆڤ بێژیٚ ئەز ئەڤم نەبێژیٚ ئەز ژفلان بنەمالێمە و کوڕیٚ فلانیمە (عرب دبێژن: قل ان ذا ولاتقل ان بن ذا) وەکە هندەك کوڕێن شێخان، سەیدان، بەگان، ئاغان و مەلایان کوبکێری چو تشتی نایێن دبیژن: ئەم کورێن فلان کەسێنە.

[٢] کەسیٚ برها خوە بدە سەر یەکدی برها وی نە ل سەر وی بت درەنگ ویٚ بگەهە مەخسەدا خوە تشتەك نینە کو زوو ویٚ ببە بال مرادا ویڤە ئەویٚ ئەڤاهە مرادا وی بت.

[٣] خوەزی خوەشی بۆ ویٚ بت ئەو ژبلی زەحمەتا خوە پێڤە لیا کەس دیٚ نەنێڕیٚ و چاڤێت وی نە ل دەستیٚ کەس دی بت. ژبەر کو مرۆڤ نکارە نەخوەشیا ژ سەرخوە لابدە مرۆڤ د نەکارییێدایە نەکارن [خلق الانسان ضعیفا] (النسا: ٢٨).

[٤] ئەم هەمی وهەر کەس ژ کریارێن خوە بەرپرسە چو کەس گونەهێن کەسی هناگرە هەلاکا هەر کەسی بکریاریت ویە [وان لیس للانسان الا ما سعی] (النجم: ٣٩).

[٥] چاخیٚ ئەز مللەتەکی بیر تیم حەسوود بوون هەر وەکی ئەو کەریٚ، گوهدیژی. ژبەر شێر د ڕەڤیٚ ئەو ژی وەسا ژبەر ڕاستییٚ وحەقیقەتیٚ د ڕەڤن.

[٦] ژ من ڕە دبێژن گوهیٚ خوە بدە گۆتنێن مە ئەو گۆتنێن نەییٚ گوهدانێنە هەکە تو گوە نەدی باربکە د سحارەکیداهیٚ نە بوویٚ سبەهـ هێژ زو نە بوویٚ سحار و ژ ناڤ مە هەرە.

لقيـــــت عتيـــا فـــــي الأســــاءة اســــوة

ومتـــــرف يــــوم لايكـــــاد ليهتـــــدي[1]

وفضـــــله القـــى فـــي أمــــاكن ذلـــة

يهـــان بــــه الــــدهر اذا فيـــة يعتـــدي[2]

فشـــلت يـــدا دهــــر أجــــاد بمثلـــه

وزيـــاه بـــين النـــاس بالبخـــل يرتـــدي[3]

فـــذا عقبـــى حـــال المـــرء اذا كـــان مبتلـــى

بـــــأهواء دنيـــــاه تحمقــــت يــــاردى[4]

اذا اجتمــــع الـــدنيا لـــديك فـــذا الظـــي

لهيـــب لظــــاك الأخـــروي ولا تـــدرى[5]

ســـطور مـــن اللـــه كتـــاب امتحاننـــا

بغـــى لـــذى جهـــل مطـــى لـــذى حجـــر[6]

---

[1] ئەز ڕاستایەکی هاتم د نە باشیێدا نمونە بۆ گەلەك ستەمكار بوو نە قەنجیێ ڕۆژێ بۆ دروست بوونا وى ژى نە نیزیك بو یان هێڤیا چاکبوونێ نەدهاتەکرن.

[2] قەدروقیمەتێ وى دهاتە ئاڤێتن دجهێن سەرگودا زبل و خاشاك كێماسیێدا زەمانى ئەو كێم و چوونە حەسێب دكێ دچاخێ كو ئەوى خوەتێدا بلند و قیمەت دار دزانى.

[3] هەر دوو دەستێ زەمانى فەلج و شەل ببێ كو مەردیتیێ بیێ وەسا ڕە دكە ئەوێ كو كنجێ وى بەرگێن وى د ناڤ خەلكێ دا ب بەخیل تیێ د عەردێ ڕە دخشكە و درێژ دبە. بەخیل ئەو كەسە كو نەڤبت خوەشى ژ مرۆڤان ڕە هەبت.

[4] ئەڤاهە داویا حالێ شەخسیە چاخێ خودان بەلا بت ب ڤیانا دونیایێ ژێرە تێتە گۆتن تو ئەحمەق بوویى و نەزان بوویى، یا بێ خێر و پیس.

[5] چاخێ دونیا لباتە كۆم بو ئەو ئاگرە پێتا ئاگرێ تە یێ وێ دونیایە یێ ئاخرەتا تە و نزانى. ئەو دونیا كو حەقێ خودا ژینەدینن.

[6] پەرتووكا ئیمتحانامە هندەك ڕێزكن ژلایێ خوداڤەنە. ئەوێ دونیایێ كۆم دكن وپێ سەرخوە دچن ئەو خوەیێ نەزنینێیە ئەو ل حەرامى سووار بوویە و د مەشە.

فياعبد دنياه الم يأن رجعة

أجنتك دنياك ومنها لفي سكر[١]

عليك خصومات اذا لم تئودها

فلست بأواب ولا طائع الأمر[٢]

تأمر بأمر الله واعبده مخلصا

وخسران انسان لقد جاء في العصر[٣]

اترجو من الله استجابة ماتدعو

ومن قبل يدعو منك ترك المناكر[٤]

ذهبت رجال الدين لم يبق سوى

من لدنياه هواه وهواه هبل[٥]

يامن استهواه شيطان الم

يأن ان تصدر عما تعمل[١]

---

[١] يا ئەو كەسێ كولەيێ دونيايێيە ما چاخێ ل خوە ڤەگەرانێ نە هاتيە تو ل خوە بزڤرى ئو توبەبكى ما بەهەشتا تە دونيا تەيە ژبەر وێ تە هاى ژ خوە نينە و تو سەر خوەشى.

[٢] دەعوە و دۆز ل سەر تە هەنە نە چاخێ تو مافان نە دى تو نە توبەدارى و تو نە ژ فەرمانكرە ڕە ئامادەيى وەى ل حالێ تە.

[٣] فەرمان بەربە ب فەرمانا خودا و خودا پەرەست بە بڕاستى و خۆ زەرەڕكرنا مرۆڤى هاتيە د پەرتووكا پيرۆز دا د سورەتێ والعصر دا خودا دبێژە [والعصر ان الانسان لفي خسر] مرۆڤ د خوسارێ دەنە.

[٤] هەكە تە دڤێت خودا داخوازێن تە پەسەند بكێ (قەبوول) بەريا تو بخوازى ژ تە هاتيە خوەستن كو تو نە چاكيا بهێلى و تەرك بكى.

[٥] زەلامێن ئايينى چوون نەمانە ژبلى يێن كو هەوەسا وان ڤيانا وا دونيا وايە هەوەسا وا ژى وەكە هوبەلە. هوبەل خودايەك يێ عەربا بۆ ژێرا پەرەستن دكرن. ئەڤێن مايين ودبێژن ئەم مرۆڤێن ئايينينە وكەڤيانا خوە كار دكن ئەو ژى دووڤ هەوائا نفسا خوە د مەشێ ئەو ژى وەكە وانە ئەوێن عيبادەتێ (هوبەل) دكرن.

كيف تغدو تعشق الدنيا الدنى
لست تدري عضلها يا معضل[٢]
كاللظي في طبعها بل ازيد
اذ تملأ ولها لا تؤمل[٣]
كلما في شؤمها طال الكلام
فقليل وهو الفصل الأول[٤]
ان الهموم كثيرة وأجلها
كتبى بعد الموت أذ تتعطل[٥]
ترجو من الله الستجابة ما تدعو
ومن قبل يدعو منك ترك الناكر[١]

---

(١) يا ئەو کەسێن ڤیانا وا شەیتانیە. ئەو تشتێت شەیتان نیشا وا دکە ل دووڤ وێ دچن مادەم نە هاتیە ئەو کریارێن تو دکی ئەشکەری بکی کا تو بۆ کی دکی و بەیان ببن شول وکارێ تە بەیان ببت.

(٢) چاوا تو دکەڤێ سحارێدا تو عاشقێ دونیا پیسی خوەزی تەزانیبا ژ نەهێلانا وێ ژیۆ هەڤژینێ بۆ تە ( ژن و نەهێلانا وێ ژ زەواجێ. تو عاشقێ وێ یێ ئەو خوە ژ تە دپاریزە ناهێلێ تو تێکل ببی، ئا ئەوێ هاتی ئەرك کرن.

(٣) دونیا وەکە جەهنەمێیە د تەبیعەتێ خوەدا بەلکی زێدەترە چاخێ ئەو تەژی دبت لێ ژێرا نایێت هێڤی کرن.

(٤) چەند مرۆڤ بەحسا شومینیا وێ بکێ ئاخفتن درێژ دبێ و هەر ژی کێمە نو دبی دەست بێ کرنا ناڤبرا یەکی یا ئەوەل هندەدونیا شومەو پیسە چەند ژێ بێتە ئاخاڤتن هەر هندکە.

(٥) خەمێ من پڕن یا گران و مەزن پەرتووکێن منن کو پشتي مرنا من بمێنن بەتال و دەرێ وانەیێن ڤەکرن و کەسی نە بێ وان خوینن دبێژێ ئەز ڤێ خیالێ دکم.

مالى سوى عجزى والى صنعه
هولى الخليفة حسبي فيما أمل[٢]

فيوسف لم تخلف لعقبك ثروة
والا أسوة تلأم لئوم اللئيم[٣]

سوى أن تعهدت لهم من نفائس
من الكتب مايحيى الرميم من الريم[٤]

كال التريك واللكوس سنا برقا
تبلغ منجا من رياض النعيم[٥]

لكم أيها العمال يالعلم حقه
خلود نعيم في نعيم مقيم[١]

---

(١) هيڤيێ ته ژ خودێ ئەوە كو داخوازێن ته قەبوول بكێ، بەرى ڤێ داخوازا ته ژ ته ژى دهاته خوەستن كو تو ژ شكێن حەرام و پيس خوە ڤەدێ هەكە ته خوە ژ حەرامى ڤەدا بت داخوازێن ته ژى وێ قەبوول ببن.

(٢) ژبلى نه كارينێ چو دى بۆ من نينه ئەز چێكەرێ وێمە يانى خودا ئەز چێكرمە، شوون من ڤەژى ئەوە هەر دمينێ كافيێ منه د وێ تشتا ئەز هيڤيێ دكم دا ئەوە خودانێ هەمي تشتا ژ پەرتووكاره وێ چارەكێ ببينه.

(٣) ژبۆ خوە دبێژە يووسف پاش خوەڤە چوويە سەروەت و مال بو وارسێن خوە ميرات خوەرێن خوە نه هێلايە و قەدر و خوە پێ گرتنەك چاك ژى نەمايە كو دەڤێ لومەكەرا ژ لومێ بگرە نەمايە.

(٤) ژبلى ژ وارە من ژ تشتێت هەرێ خودان بها ئامادەكر ژ پەرتووكان ئە وێن كو بوا هەسنكێن رزيي پێ ساخ دبن ژ نەمانێ وبوچ بوونێ.

(٥) ئەو پەرتووك وەكە بەرمايێن وەشيانەژترى يان يێن خورمانە.ئەو پەرتووك وەكە لوكوسانە وەكە ڕۆناهيا بروسكێنە ژ باخچەيێن خوەشيا دفورهن تێنە دەر.

بلـــــو وليـــــت كـــــان يوســـــف مبتلـــــى

همـــــا فـــــى الهـــوآء مـــــن غـــــوى وعنـــــآء[٢]

بتينـــــك مغمـــــور ولســـــت بنـــــاجح

فكـــم لـــي مـــن شـــكوى وكـــم مـــن جفـــاء[٣]

أذا مـــــا اشـــــتد حرصـــــك فـــــى الســـــيادة

فخـــــذ ســـــين الســـــخاوة مـــــن هيمـــــام[٤]

وخـــــآء خيـــــرة مـــــن بـــــين قـــــوم

وواوا للمـــــــــــــــودة واحتـــــــــــــــرام[٥]

عطـــــــــآء غيـــــــــر مجـــــــــذوذ ببخـــــــــل

---

(١) ژ وەڕانە ئەوێن كو بزانن كاردكن بوێ شەكێ بابەت ئەو مرۆڤێن كو ب مافێ وێ عەمل بكن هەر وهەر دێ د خوەشيا دەبن د وا خوەشييێن ئەبەديدا كو بەحشتە و ڕازي بوونا خودايە.

(٢) تيالوێ وليت يێن خوزيانە، دبيژێ ئەز يووسف بلەوێ وليتێ موبتەلا بۆمە ئەڤ هەر دووكێن هەرهێڤێ مندانە ئەز ب ڤان هاتمە خاپاندن و بوونە قەستا من، دبيژن: دارا خوەزيا بەرپيڤە نايێ (لو كان كذا لكان كذا) (هەكە وها بيا وێ وها بيا) فايدا وا نينە.

(٣) مرۆڤ ب ڤان هەر دووكا ژی تێتە خاباندن و غراندن، مرۆڤ بسەرناكەڤە چەند من شكايەت هەبوون و چەند من نەرحەتێ هەبووە، ب ڤان نەهاتنە دەرمانكرن، بخوزيا كەس ناگەهێ مرادێ خودانێ خوەزيا دەست ناڤێژن قورمێ كەزيا(كونێن پيشيانە).

(٤) چاخێ تو پر حەژ مەزناهيێ بكی شيرەتا من بۆ تە ئەڤە بلا سينا (س) سەخاوەتێ (سخاوە) يامەرديتيێ ژ كوششا تەبت ژ موهماتی تەبت. يانی دڤێت تو مەردبی داینێ بكی مروڤێ چروك بكێر مەزناهيێ نایێ.

(٥) خائاوێ چاكيە و باشيە دناڤ وی گەلي دا. واواوێ (و) ژبۆ حەژێكرنێيە وقەدركرتنێيە. هەتا توببی مرۆڤەك سەركێش و رێبەر دڤێت د ناڤ و خەلكێ دا تو مەرد بی و تو ب خيرەت بی و تو حەژ وی گەلي بكی ئەو ژی حەژ تە بكن.

هو الترياق فى سقم السقام[١]

فيوسف مايود المال ألا

لتكشيف الهموم من عدام[٢]

ومع ذاما طلبت المال قط

سوى ماقد كفانى من قيوام[٣]

من الله دعائى كفاف قوت

وذا من شيم خير الانام[٤]

بخيل بآؤه من بآء بئس

وخآء خبزه المنشي السقام[٥]

ويآء يده المغلول عنقا

ولام لم مالى من طعام (ب خ ي ل)[٦]

---

[١] ئەو داينا كو بەخيل تى تەكێل نەبووبێ ئەو وەكە نوژدارێيە و ترياق ژ نەساخيا ڕە ئەو نەساخين پڕ چەتنن، دايين گەلەك دەردا دەرمان دكە دبێژە خوە.

[٢] يووسف توجا حەژ مالى نەكريە ئيلا ژبۆ ڕاكرنا خەمان ژ نەيينيێ من مال هند دڤێت كو هندەك نەخوەشيا و خەمان ل سەر من سڤك بكێ.

[٣] دگەل ڤێ يەكى ژى توجارا ژى من دخوازا مال نەكريە ژبل ويێ كو ئابووريا من بجهـ وەرە وببە هێز بۆ تاعەتى.

[٤] ژ خودا داخوازا من ئەوە كو قوتەك ئيدارە بدە من ئەڤا هەژى ژ ئەخلاقێ چاكترينێ مرۆڤايە كو قاسدێ خودايە (دگۆت: اللهم ارزقني رزقا كفافا).

[٥] دبێژێ بائا (ب) بەخيل ژبائابئس هائانين واتا وێ مەعنا وێ پيس.(بئس الرجل صدام) پيس زەلامە صدام. خيێ يا وێ خێيا خبزێيە يانى پێس نانە نانێ دەستێ يێ بەخيل دەرد ژى پەيدادبە.

[٦] يائا وێ (ى) ژيائا (يده) دەستێت وى گرێدايێ سەر ستووێ يەيانى نكارە داينێ بكە. لاما وێ ژ لاما (لم) يانى چما ئەز مالێ خوە بدم خەلكێ و بدم خوارن. دەستێ وى ناچە كو تشتەكى بدەخەلكێ.

لبئس الخبز خبز يد بخيل
المته من المال الحرام[(١)]

فمالهم معرضين عن تذكر قرآن
كأن حمر فرت من الأسد[(٢)]

ضلوا السبيل بما استهوته انفسهم
حرص الرياسة حرص ماله اللبد[(٣)]

تفهر في المال كأنه فأرة
تكنز مايجمع ولا يتقنع[(٤)]

فلو أنتمو ملكتموا كنز رحمة
من الفقر لا مسكتم ولن تتبرع[(٥)]

قميص غنى الوقت لاتعرفنه

---

(١) پیس نانە نانێ دەستێ مرۆڤێ بەخیل. کونو کوند قەلس کۆمکریە ئەو مال ژ مرۆڤێت بەخیل بت نانێ وی مرۆڤ نەخوت باشی ژبەر کو دەردە نەخوشیە، ژانە دبێژە: هەکە نانێ یێ کنوژ. چروك، تەخار لەزکە هەرە نانێ یەکیی مەرد بخوە داببت دەرمان ژبۆ تە ژبەر کو دلێ وی پێڤەیە، لیێ یێ مەرد نەوەسایە.

(٢) چ ل وا هاتیە کو ژ بیرئانینا قورئانێ پەرتووکا پیرۆز خوە لاددن و دڕەڤن هەر وەکی ئەو کەرێن ژبەر شێر د ڕەڤن. قورئان وەکە شێرە و مرۆڤێ نەزان وەکە کەرێ یە.

(٣) ئەڤێن وەسا ڕێ ونداکر نە ئەگەرا دووڤ نەفسا خوە چوونە نەفسا وا چ خوەستبت ئەوا ژی وەکە وێ کریە ژبەر کو گەلەك ڤیانا وا ژبۆ مەزناهیێ وسەروکاتیێ هەیە وڤیانا وا ژبۆ بەرهەڤ کرنا مالی کو دەینن سەرهەڤ هەیە.

(٤) ژ کۆمکرنا مالی ڕا گەلەك زانایە وەکە مشکیە مالی دکێ دەفینە خەزینە و ژێ تێر نابت و دلێ وی ژی قەناعەت نابێ.

(٥) هەکو هوون ژ دەفینا دلوڤانیا خوەدێ ژ خوە ڕە بگرن و بکن ملك وێ دەمێ بەلەنگازی و فەقیری یا کو هوون گرتن و هەوە نەکاری خێرا بکن ئەڤا هە بەسی هەوەیە.

سوى أن ببخل وبلؤم مرقع[1]
وذا عارض ممطرنا في خيالهم
واني لمال بل عذاب ممنع[2]
دني گهني من بمال تمعري
سوى ذى زكاء ومقامه تبع[3]
شهدت علي أحمد انه
رسول من الله باری النسم[1]

---

[1] دبێژیٚ کراسیٚ دەولەمەندیٚ زەمانی نائیته ناسکرن ژبلی کو ب بە خیلتیێ وب لومیتیٚ هاتیه پینەکرن. یانی دەولەمەندیٚ ڤی چاخیٚ مه نه مەردن دانیٚ ناکن و کنوژن و بلومن. حەقیٚ خودا و حەقیٚ فەقیر و ژارا نادەن وەکە قەومیٚ سمودن.

[2] د هزریٚ وا ده ئەوەکو ئەڤ مالیٚ کۆم کرین ژ واره وەکە ویٚ عەوریٚ ڕەحمەتێیه بارانا ژیٚ بێت هەمی د ناڤدا ماله وملکه ئەو نزانن کو سەزایه (عەزابه) و وا دوور دکیٚ ژ ڕەحمەتیٚ.

[3] دنیایه پیس و گەنیی و سفتو کفتو ئەو کەس گەنیه سفتویه کفتویه ئەویٚ خوه د ناڤ مالی دا د گەفزینه یانی مالداره و دەولەمەنده و چاکیان پیٚ ناکه و د ڕێیا نەباشدا خەرج دکه ژبلی وی کەسی نەبت ئەویٚ بیرتیژبیٚ و زانا و بهش بیٚ ئەویٚ وەسا بت مال بۆ وی باشه جهیٚ وی و دەرەجا وی وەکە یا تبع. تبع ئەو کەسه ئەویٚ باوەری بخودا و ڕەسول ئانییه و مالا خودیٚ کراس کریه دبێژن ئەوه ل ئەویٚ کراسی ل بەیتیٚ کریه. ئەڤ مەلك ژ یەمەنێیه چاخیٚ چوویێ غەزوا روهەلاتیٚ ڤەگەڕایی د مەدینیٚ ڕا هاتیه تەك خەلکیٚ مەدینیٚ زەلامەك ییٚ وی کوشتیه ئەوي ژی بریار دایه خەلکیٚ ویٚ بکوژه و دارخورما ببڕه. دوزانا ژ (جهێین) یەهودییێن مەدینیٚ هاتنه یا مەلکی گۆتنه هەکه تو ڤی باژاری خراب بکی. تو نامینی پاراستی خودا ویٚ بەلایەکی بده ته. گۆت: ژبەر چ گۆتن ئەڤدەر جهیٚ ڕەسولیٚ ئاخر زمانه ژ مەکەهیٚ ویٚ کوچ بکیٚ بێته ڤێدەریٚ ئەوي ژی ژ وا باوەرکریه ژ وڕ چوو وه خراب نەکریه ئەڤان هەر دوو زانا یان گۆتنیٚ مالا خودان ژی لیباس بکه ئەو ژی کریه و گەلەك تشتێت باش کرنه ئەو چیروك درێژه.

فلومد عمري الى عمره
لكنت وزيرا له وابن عم[٢]
وجاهدت بالسيف اعداءه
وفرجت عن صدره كل هم[٣]
لقد طابت الايام زال التأسف
وزال العنى لما تبدي جمالكا[٤]
جمانة ام شيعرى يمان وشامية
مجرة آفاق بدت من هنا لكا[٥]
بروق بدت من وجه ليلا بشرقنا
فياحبذا شرق سنت من بهاركا[٦]
تبدى علينا برقنا غير خلب
منضرة مخضرة كوننا بكا[١]

---

(١) ئەز ل سەر ئەحمەد دبم شاهد كو ئەو ڕەسولە ژ بال خوداڤە هاتیە هنارتن ژینە تورەك پاكە.

(٢) هەكە ژینێ من درێژ بوویا بگەهشتا ژینێ وی ئەزێ ببووما وەزیرێ وی وكورمامێ وی.

(٣) مـن دێ جیهـاد بكـرا بنـەیارێ ویـرە ب شـوری مـن ژ سـینگێ وی هـەمی خـەم ڕادكـرن. هەكە تە زێدەتر بڤێ. البدایه والنهایه ج(٢) ص١٣٤ هەرە لێ بنێڕە.

(٤) ئەڤ ڕۆژێن هە گەلەك هوەش بوون نەخوەشی ڕابو چاخێ جەمالا تە خویا بوو هەمی پەردە ڕابوون.

(٥) ما تو دوری یان ئەو ستێركا یەمانی یان یا شامی یان تو وەكە ڕێكاكا د زایێ ئەوا كو سەر و بنێ ئەسمانا گرتیە كو تو ژ ڤی لایڤە هاتبی دەر پەسنێ پەیخەمبەری ددی. خەلكێ یەمەن و شامێ ژی و ستێركا كو دبێژنێ شیعری دپەرەستن.

(٦) هنـدەك بروسـك ژ ڕووێ لیلایـێ د شـەرقامەدا، روهـەلات پەیـدابوون خـوەش روهەلاتـە ئـەو ڕۆناهی ژ ڕندیا تە پەیدابوویە.

فاهلا برحب نحن بابن زرارة
بعهد من الله بمنع عدوكا[٢]
توجهت اسعادا واسعدت وجهة
وغيث الورى مثنى برغد حياتكا[٣]
بيمناك قرأن ويسراك سنة
وفاصدع بما تؤمر غدت من شمالكا[٤]
فمازلت فياضا وشمسا موحدا
تقاصرت الافلاك انجاد مثلكا[٥]
فياحبذا أفق تهامة رويها
ويايمن أشبال نشت من حوالكا[١]

---

[١] پەیدا دبن ل سەرمە بروسکێن مەبێ تاریتی بەلکو ب ڕۆناهي و بکەسکاهی هەینا بتە و هارۆناهی دبێ. ڕۆناهیا ڕووێ ڕەسول دشبهێنێ ڕۆناهیا بروسکێ، بروسك چاخێ لێددن باران دبارە د بهارێ دە عەرد شین و کەسك دبێ نورها ڕەسول ژی شبهاندیە وێ ژبۆ وەلاتێ مە کو روهەلاتێ ترکیە کو دبێ کوردستانا باکوور. ئەو ژی بڤێ نورێ ڕۆناهی بوویە.

[٢] ئەم ژی دبێژن ئەهلا و مەرحەبا وەکە سەعد بن زرارە عەبدوڵڵا بن ڕواحە د شڤا عەقەبێدا ژ ڕەسول را گۆتن (اهلا وسهلا) ئەم سۆز ددن بۆو خودا کو ئەم تە ژ نەیارێ تە بپارێزن.

[٣] ئەم ژی ژبۆ ڕەسول ڕادبێژن مەرحەبا (اهلا وسهلا)، بەرێتە ل باشیێیە و بەردانا تە چاکە تو بوویی وەکە بارانا ڕەحمەتێ بۆ عالەمێ ژ ژیانا تەیە بۆ عالەمێ.

[٤] د دەستێ تەیێ ڕاستێدا قورئانە نە دەستێ تەیێ چەپ سونەتە پێك بینە ئەوا فەرمانا تە پێ تێتەکرن پەیدابوویە ژ ئەخلاقێ تەیێ چاکە.

[٥] تم و تم تو بداینێ دانا تە د هەرکە و تو ڕۆژا تەوحیدا خودایی تە فەلەکێ ئەسمانا کورت کرن وەکە واچاکێن وەکە تە کو ڕەسولن ئەڤ هەمی پەسنێ ڕەسول.

بأسـمائه الحسـنى واياتـه المثنـى
أعـذك مـن سـوء اذا مايسـووكا[٢]
بهيـرة نكبـائي فحتـى الـى متـى
امـا تتقـى فـي يوسـف مـن لحاظكـا[٣]
بعـين الرضـا فـانظرا تبـدى المسـاويا
وفـي الحلـم أنـت احنـف اعـف فحالكـا[٤]
اقـر بـأني لسـت اهـلا لـذا
ولكـن مـا تسـمح بـه مـن كمالكـا[٥]
لـك الحمـد يـارب صـلاة بـلا مـدا
علـى سـيد الرسـل وآل صـفيكا[١]

---

(١) چڤاس پاکە و خوەشە سەر و بنێ مەکەهێ ئاڤ داپینا وێ ج مرۆڤێت چاکن ئەو تێژکێن شیرا بەچکە شێر کو پەیدابوون ل دەوروبەرێن تە، پەسنێ جهێ خودێ دانا پەیخەمبەری د دێ.

(٢) یارەبی تو بدی خاترێ ناڤێن خوە یێن سپەحێ (٩٩) ناڤێن خودا هەنە دبێژن ئەسمائێ حوسنا و تو بدی خاترێ ئایەتێن دوبارە تێنە خوەندن ئەز خوە دپارێزم بخودێ ژ هەمی نەخوەشیا چاخێ تە د ئێشێنن ونە باشیێ دگهینن تە.

(٣) دبێژێ یا بهیرە بەهیرەت معشوقەك ناڤبانگە د ناڤ عەرەبا دە وەکە لەیلا ژبۆ شهری تینێ. نەخوشیا من، ئەو بارێ ل سەر ملێ من حەتا کەنگی ما تو دەربارەیی یووسف دا ژ خودێ نا ترسی، تەقواتیێ ناکی، ژ وان ئاورێن خوە بەس من ب ئێشینە.

(٤) جارەکی بچاڤێ رازی بوونێ لمن تەماشەکە ما کەنگی وەك هەڤی پەیدا دبت وتە ددلوڤانییێدە گەلەك خوەهری. ئەحنەف لنگ خوەر، لمن ببورە ماوێ چ ببن. مابۆ تە چ هەیە.

(٥) ئەز دزانم کو ئەز نەبابەتێ ڤیا تەمە لێ بەلێ ئەوا تو وێ پێش دکی ژ چاکیا تەیە و ژ کەمالا تەیە.

وفـــــرض علينـــــا ان نكـــــون لــــــدينـنا
كأصـــحاب اخــــدود وكهـــف كمـــا ورد[2]
وان نجعـــــل الـــــدين احـــــب والـــزم
مـــــن الـــــنفس والمــــال وزوج ومـــا ولـــد[3]
ومــــن بعـــد ان نســتن بهـــدى محمـــد
وتباعــــه الفـــرآء دينـــا ومــــن زهـــد[4]
ولانتخـــــذ اخـــــدان بســــوء بـــــدينـنا
والا وقعنــــا فـــي خصـــام وفـــي لــــدد[5]
شـــــحيح شـــــينة افحــــش شــــين

---

[1] سپاس بۆ تە یا خودا دلوڤانی بێ راوەستان ل سەر قاسدێ تە وال وێ یێن کو پاك و پاکژن بن.

[2] فەرزە ل سەرمە ئەم هەبن بۆ ئاینێ خوە وەکە وا کەسا بن ئەوێن ژبۆ سۆتنا وا ژلایێ نەیارێن وئەڤە ل سەر کو باوەرمەند بوو د کولانا دە کورت د کولان و ئاگر تێدا دکرن و لەشکەر ل وێ دێ ئامادەکرن هەر کەسێ ژ ئایینێ خوە نە ڤەگەڕابیا تاڤێتن ناڤ وی ئاگرێدا ژوارە (دگۆتن: أصحاب الاخدود) پەیخەمبەر ژ هەڤالا ڕە بەحسا وا کریە خودا ژی د پەرتووکا پیرۆز دا بەحسا واکریە. دڤێت ئەم ژ دینێ خوە ڕە وەسا ساخ لەم بن وەکە ئەوێن ژبەر دەقنانوس ڕەڤین چوویین د شەکەفتێدا ژبەر دینێ خوە کو مەسیحی بوون (٣٠٩) سالان خودا ئەو مراندن ب سەیێ واڤە کونا ڤێ وی قەگمیر بوو. پاشی خودا ساخکرن، ئودیسا مراندن ووندابوون.

[3] دڤێت ل با مە ئاینێ مە ژ هەمی هەینێن مە ب قەدرتر بێ وپتر ئەم حەژێ بکن ژ نەفسامە و ژ مالێ و ژ ئافرەتا مە و ژ زارۆکێن مە ژ هەمی هەیینامە.

[4] باش ئەڤا مە گۆتی ئەم خوە برێ دکن برێیا موحەمەدی ئەم ل دووڤ سونەتا ڕەسولن و هەڤالێن وی یێن چاك دئایندا وئەم درێیا وا کەسا دا نە ئەوێن کو زاهدن ژ گونەهان.

[5] ئەو هەڤالێ نە باشانە و ئەو نە دوستێ مەنە ئەوێن نەباشیێ بگەهینن ئاینێ مە. هەکە ئەم نە وەسا بن ئەمێ بکەڤ د قەرەبالخێدا و ژ گوم ڕەمیێ دا.

كريـــة المنظـــرين الرجـــال[١]

لـــبعض النـــاس قلـــب ذئـــب

بجلـــد الضـــأن فـــخ الأحتيـــال[٢]

فـــلا يغـــرركم منـــه ابتســـام

هـــو الشـــيطان فـــي زي الرجـــال[٣]

اذا مـــا شـــأت تملـــك الحـــرار

فبـــاز الجـــود صـــياد الرجـــال[٤]

غالـــت دهـــور ملايـــين الكـــرام فمـــا

ابقـــوا ســـوى امكـــن دالـــت علـــى الســـفل[٥]

جـــادت عصـــور بمـــا خالتـــه مكرمـــة

لا بـــل هـــي معبـــدة كالمـــال والهبـــل[١]

---

[١] مرۆڤێت كنوژ.كوند. دبێژنێ شەحیح تیپا شینا شحیح شینا فەحشێیە مرۆڤێ شەحیح فاحشە د ناڤ زەلاما دە روچكێ وی پیسە مرۆڤ ناخوازێ ڕووێ وی ببینێ مرۆڤێت كون و ژ د ناڤ مرۆڤادە ڕووێ وی نەخوەشە.

[٢] هندەك مرۆڤا دلێ وا دلێ گورایە نەیێ مرۆڤایە یێ دپوستێ مهێدانە ئەو ژی وەكە خەفكا حیلایە تەلهە مرۆڤا پێ دگرێ و واداپینە. ژ مرۆڤا وەیە كو مرۆڤەك باشە قەلبێ وی پاكە لێ دلێ وی یێ گورە پوستێ وی یێ مهێیە.

[٣] بلا هوون ب بەشیشتنا وی ژ كەنێ بێدەنگ را دبێژن بەششی بیا كونوژی شحیحی نەیێتە خاپاندن پێ نەخڕهن ژبەر كو ئەو شەیتانە د جلێ زەلاما دەیە، شەیتان چاوا مرۆڤا دخاپینە ئەو ژی وەسایە.

[٤] چاخێ تە بڤێ تو مرۆڤێن ئازاد.حور بێخێ بن دەستێ خوەدا توببە بازێ مەردێ بازهێ مەرد زەلاما نیچیر دكە یانی مرۆڤێت مەرد زەلام دكەڤن بن دەستێ ویدا.

[٥] هندەك چاخان دەوران حیلە ل ملیونا مرۆڤێن چاك وخودان رومەت كرنە تو تشت پاشی واڤە نەمایە ژبلی هندەك شون وار كو ئەو شونە ب مرۆڤ ددن زانین كا قەدر وقیمەتێ وا چەند بەر ژێر ونزم بوویە.

يـــا طالمـــا فـــي الهـــوى مازلـــت منحـــدرا

ياطالمـــا فـــي الهـــدى لـــم تتخـــذ رشـــدا[٢]

دع مهمـــلات الأمـــور خـــذ مقاصـــدها

ان شـــأت الا تهـــان فـــي هـــواك غـــدا[٣]

لاتتـــرك صـــحبته مـــن يرعـــاك مـــن زلـــل

ياحبـــذا صـــاحبا بأحـــب مـــن رغـــدا[٤]

عيشـــا ونوشـــا وقـــدرا اينمـــا اعتمـــرا

لـــم يـــنس فضـــلا بغـــر اينمـــا وجـــدا[٥]

ويـــا شـــقاوة مثلـــي دام منبعثـــا

غـــدرا تكـــاد الجبـــال منـــه تنهديـــدا[١]

---

(١) هندەك دەورا مەردیتی کر نە بو وان تشتا کو مرۆڤ هزر دکە کو چاکینە نەخێر نەوەسا یە بەلکی پەرستنە یان وارێ پەرسێیە وەکە مالی و هوبەلی. پوتەك پیێ موشرکا بۆ دپەرەستن.

(٢) یا ئەو کەسێ کو چاخەك درێژ دڤیانا نەفسێ دا هەر بن دەستێ بێ ژێرا نقژ بی و خوە ژێرا بشکێنی یا ئەوی ب درێژاهی د ڕێیا ڕاست را ژبۆ خوە چاك بوون و کامل بوون. ژێ فێر نەبوویی و تە ژبۆ خوە چاکی نەگرت.

(٣) تشتێت بێ سەروبەر و نەدیاروروهن نەین بهێلە وا کارا بکە ئەوێن کو پێویستن مرادن بۆ تە هەکە تەبڤێت تو دپێ شە ڕۆژا خودە کێم نەبێ دڤیانا خوە دە.

(٤) تو تەرکا هەڤالەتیا وان کەسا نەکە ئەوێن تە د ترسینن ژ تشتێت کێم و زەلیل ئەو هەڤال باشە کێماسیێت مرۆڤی بو مرۆڤ ببێژن. چ هەڤالەك باشە ژ حەژێکرن چاکیا مرۆڤ بڤێت.

(٥) مرۆڤ دعیشەك و ڤەخارنەك باشدا بت و قەدرێ مرۆڤ هەبت کو لکو دەرێ مرۆڤ ژیان بکە. دڤێت چاکی و باشی نەیێتە ژبیرکرن بڕۆناهایی بوراندنەك سبەهی ل کو بت ل کودێ مرۆڤ چاکیێ ببینە.

يا عين مجى يوقيتا بدجلة من

في خلف وعد الوصال بعدما عهدا[٢]

جاء البشير فترتد العيون عسى

يؤن حب بجمع بعدما بعدا[٣]

لم يأن يووسف أن تخشع ولائدكا

فأدع بهيآ لنا من امرنا رشدا[٤]

يا نفس تأتين من ابليس مسعدة

بموثق الأمن ملآنا من الفتن[٥]

خبيثة من خبيث بالخبائث

لذرار شوها عجوز خضرة الدمن[٦]

---

(١) يا نەباشیا وەکە من بەردەواما تەل سەر ڤێ نەباشیا هە ئەو غەدرەك خوسارەك وەسا تو ل خوەدکی نیزیکە ژبەر وێ خوساریێ چیا بهەرفن.

(٢) یا چاڤ و باڤێژە بهەرکینە وان هێستریێن سوهر وەکە لبێن یاقوتا برژینە د ناڤ شەتیدا ژبەر کو ئەو سۆزێن تەداییێن ژبۆ گەهاندنێ وهەڤالتیێ تو لوان سۆزا نەبوویێ خوەیێ تەپاش داهێلان. نەبحهـ نە ئانینە.

(٣) مزگین ڤایە هات و ئەو چاڤێن کوربویین ساخ بوون زڤڕین هیڤی هەیە ئەو حەزکرن نیزیك بوویە بگەهشتنا هەڤ. ب کۆمبوونا هەڤ پشتی ژ هەڤ دوورکەتین و بەلاڤ بوویی.وەکە یەعقووب پەیخەمبەر و زارۆکێن وی.

(٤) نە نیزیکە کو یووسف بترسە و زەحمەتیا دوعا و داخواز بکە بێژە یاخودا شولێ مەیێ چاك بۆ مە ئامادە بکە ملا یووسف ژی وەکە یەعقووب پەیخەمبەر کوڕێ خوە بەرزەکریە (ددو) ل کوردستان عیراقێ دانە سسییێ (٣) ل استنبولێنە.ژ هەڤ بەلاڤ بوونە.

(٥) یا نفس ژ ئبلیس بۆ تە سۆزێن سەرکەفتن و تەناهیێ تێت لێ ئەو سۆزێن ژ تەرا دایی تەژینە ژ نەخوەشیا وفتنا.

(٦) نەفس پیسە ژێ پیسە بیی سیتێ هاتیە ڤەهوونان و کەبیرە ژنەك تێك چوویە وەکە شیناتیا سەرگویە جهێ زبلە تاڤێژی نەفسێ نەفسا خەبیەسە نەیارەك مەزنە بۆ مرۆڤی.

كــــم مـــــن ملاحـــــم بــــوءت مقاعــــــدها
أرض ابلعــــي مـــــاء يــــاقوت بـــــلا هـــــدن[١]
كـــم ترهـــــات اتخـــــذتهن ملتحـــــدا
لنــــا وهيهــــات بـــــل هــــن مـــــن الــــوثن[٢]
كـــم نــــالني فـــي هـــواك زلــــة صــــرمت
حبـــــل الحقيقــــت فــــي حبالـــــه الــــوجن[٣]
اللـــــه اللـــــه اذ لـــــو كنــــت مؤمنـــــة
لمــــا اعنـــت عـــــدو اللـــــه فـــي المحـــــن[٤]
خـــل علـــى هيكـــل العظـــم الـــذي انـــتحلا
مشـــــاهد غمــــرات المـــــوت والكفـــــن[٥]
لا مـــوت يعـــدل مـــوت المـــرء مـــن ســـفه
فـــي قبضـــة الغيـــر مســـتول علـــى الـــوطن[٦]

---

[١] د گەلەك مەیدانێن شەریدا تە جهێ ڕۆنشتنا خو تێدا چێكریە ئەرزەك وەسا كو ئاڤا وێیا وەكە سیاقوتا دادقورچینە بێ ڕاوەستان.

[٢] چەند تشتێت بێ ئەساس نەچوو چوونە. ئەو گرتنە ژ مەرا كرنە یەك ئو ئەو ب مەڤە دانینە هەی هوونەتشتەكە بۆ تە بل كی ئەو ژ پوتانە. سەنەمن فەیدا وانینە دڤێت مرۆڤ باوەریێ بتە نەینێ وخوە بتایێ تە نەگریێ.

[٣] ژبۆ خاتریێ هەژێكرنا تە گەلەك جارا ئەز كیم كەتمە زەلیل بۆ مە وەریسێ ڕاستیێ و حەقیقەتێ تە بریە د ناڤا وەریسێ نێچركرنا خوەدە تەلێدایە.

[٤] ژبۆ خاتریێ خودێ هەكە تو باوەرمەندبی چما تو هاریكاریا نەیارێ خودادكی د نەخوەشیا دە. هەر د ڤامالكا دە سەبا نەفسێ دكە و دبێژێ گەلەك نەیارە و پیسە تێكل نەبن و خوە ب دەست ڤە بەرنەدن.

[٥] خوەبەردا یەسەر هیكەلێ هەستكێن حەلهایدا شاهدێن توزا مرنێ وكەفەنی.

[٦] ئەو نەمرنەك باشە مرنا مرۆڤێت دنەزانییێدا ود ناڤ پەنجێن بیانیادە ئەوێن دەستبسەر وەلاتی داگرتنە.

نعـــم اود ليســـتا مـــن مكـــر مـــات امـــرء
مـــن صـــدم حطـــم العـــدى الـــذل والمهـــن[١]

بليـــــدة نفســــي مارأيــــت كمثلــــك
غـــوت فـــي الخرافـــات ولـــم تعـــرف المنـــا[٢]

بـــــروح مهـــــين اذ اجلــــت مراغمــــا
كثيـــرا بـــأهواء الـــى ســـاحة الفنـــا[٣]

فللـــــه در مــــن يــــرد جماحهــــا
ويـــرحم مـــن مـــن قبضـــة الـــنفس فـــي ضـــنا[٤]

يتـــامى جبـــال شـــرقنا اذ تراكمـــت
كأنهـــا الثريـــا فـــي الســـماء اذ تنـــاكرت[٥]

عيـــون تمـــج مـــن قلـــوب تشـــققت
فيـــاطول اســـرآء لشـــمس تكاســـفت[١]

---

[١] پەیڤا (نعم) یاتی (بەلی) و (ئەود) پەیڤا تورکیە.یانی بەلێ ئەڤ هەر دوو نە ژ چاکیێن مرۆڤی نە د چاخێ لێدان ودەحف دانێدا ودەمێ بەر ژێر بوونێدا. دەمی نە ساخییێدا و زار بوونێدا و کێم کەنیێ دا ددەما رەبەن بوونێدا. یەك ل مرۆڤ بدە وئیش و ژانا بگەهینە مرۆڤ. مرۆڤ ژێرا لبێ وبەلێ بت نابە.

[٢] نەفسا من یا نەزان من نەدیتیە یەك وەكە تە خوە بەردایە د وا تشتێ بێ بنیات دا بێ عەسل.

[٣] كێل و میزانا خوە نە ناسیە بروحیەتەك كێم وچوونە تە گەلەك مەخسەدێن پڕ باش دا دانە سەخمەرەتیێ ڤیانا خوە تە ئاڤێتن مەیدانا چوو نەبوونێ وفەنائێ.

[٤] ژ خـودا ڕابـت خێـرا وی كەسـی ئـەوێ كـو هەفسـارێ وێ بگـرێ و ژ شـولێ نـەباش ڤەگەرێنێ. هەفسارێ نەفسێ، دلوڤانیێ ل وی كەسی بكێ ئەوی كو د ناڤ پەنجێن نەفسێدا د تەنگاتیێ دایە.

[٥] سێوییێن (یتیم) چیاییێن ڕۆژهەلاتا مە چاخێ دكەڤن سەرهەڤ هەر وەكی كۆم كا سێوێیا نە ل ئەزمانا چاخێ نەیێن دیتن.

جنـــاني جنـــان للحبيـــب ابحتهـــا
لهـــا فكلـــي مـــن حيـــث شـــأت بوصـــلنا[2]
واطلعـــت عينـــي ولمـــا جمالهـــا
بـــدا بـــرق العـــين وكســـف شمســـنا[3]
لا مرحبـــا لزمـــان بـــين اظهرنـــا
جـــاد بجهـــل مـــا قـــد حـــاد فـــي الجهـــل[4]
شـــلت يـــدا امـــم يمنـــاه فلســـفة
يســـرى مزخرفـــة القـــت علـــى الجمـــل[5]
اتـــت منـــك تبريـــك ولســـت لهـــا اهـــلا
ولكـــن صـــلات وامتثـــال بســـنة[6]
ولاتيأســـوا مـــن يوســـف الـــدهر هكـــذا
فيومـــا بســـاحات ويومـــا بربـــوة[1]

---

(١) هندەك چاڤ ئاڤێ د پەژقینن ژ ناڤا دلێن كەلشیین وشەڤ شەڤ بویین ئەڤ چ شەڤەك درێژ بو ژبۆ ڕیڤەچوونێ ژبۆ ڕۆژەكا خراب بویی، و ژ ڕۆناهیێ خلاس بووی.

(٢) مشتاخا من یا فێقی باخچە یە ژبۆ حەژێ كەرامن ئەوجنین من دیاری كریە بو وێ ژێ بخوە تە چاوا بڤبت چاخێ ئەم دگەهن هەڤ.

(٣) چاڤێت مـن ڤـەدبن چـاخێ جـەمالا وێ پەیـدا دبـێ چـاڤ شـەفەق دبـێ وڕۆژ دچـێ ئاڤـا پەردەپوش دبێ. ژبەر ڕۆناهیا حەژێ كەرامن.

(٤) نە مەرحەبا بو وی زەمانی د ناڤ مەدابت ئەوێ كو مـەردیتێ ب نـەزانینێ بكی هەوەسا د نەزانین و جەهالەتێدا دژوار بت و حەژێ بكت.

(٥) هـەر دوو دەسـتێ وێ گـەلی شـەل ببت ڕاستێ وی فەلسـەفە بت ویـێ چـەپێ تێدا تشتێت ڕەنگا ڕەنگ هەبن باڤێژێ سەر وا تشتێ نەدیار حەسابێ ئەبجەدێ.

(٦) دبێژێ: تەبریكـەك یـا پیرۆزبـاهیێ ژلایـێ تەڤـە بۆ مـن هـات ئـەز نەبایـەت بـووم بـووێ، لـێ بـەلێ گەهاندنا دلوڤانییێیە (صلة الرحم) و خۆ پـێ گرتنـا ڕێكـا پەیخەمبـەرە (سونەتا ڕەسولە) كو مرۆڤ هەڤدو ژبێرنەكێ.

اذا انقضـــــت الأنفـــــاس فـــــالموت دونهـــــا
فقبـــــر بمـــــا فيهـــــا وبـــــرزخ لجنتـــــي[٢]
اذا الأرض مـــــدت ثـــــم القـــــت بمـــــا فيهـــــا
فحشـــــر ونـــــار او نعـــــيم بجنـــــة[٣]
بليـــــت بـــــأبليس ونفـــــس ومـــــا تهـــــوى
ودنيـــــا بتلبـــــيس فمـــــن ايـــــن صـــــفو[٤]
عفـــــو مـــــن الحســـــنى وبـــــالعفو امـــــر
اذ الـــــذنب لـــــم توجـــــد فمـــــن ايـــــن عفـــــو[٥]
عـــــن الـــــذنب أن تعـــــف فـــــذا منـــــك رحمـــــة

---

[١] ژ یووسف بێ هیڤی نەبن بەحسا خوە دێ. چاوا یەعقووب پەیخەمبەری گۆتی زارۆکێن خوە (ولا تيأسوا من يوسف) چەرخا دنێ زەمان وهایە، جارنا مرۆڤ ل مەیدانێیە جار ل دەشتێ یە جار ل زۆزانا یە ل ژێر وژورە، هەر ڕۆژ مرۆڤ نە وەك هەڤە ڕۆژ زانێ.

[٢] چاخێ دەمێ. بێهن.هەناسە، نەفەس خلاس بوون ئێدی مرنە، وێ دەمێ مرۆڤ دمرێ گورە و هەمی تشتێت تێدا هەیین. کو پرسیارا مەلەکایە د گورێدا باشی عالەما بەرزەخێیە. ئەو دەما ناڤبەرا گورێ و قیامەتێیە.

[٣] ژێرە دبێژە بەرزەخ. جهێ من ئەوە، چاخێ دونیا خراب ببە وعەرد ڕاست ببە وئەو تشتێن د ناڤا وێ دە وەکە مرۆڤا وهەمی هەبینێن د ناڤا عەردێ دا وێ دەمێ کۆم بوونە حەشرە، و ئاگرە جەهەننەمە و خوەشیە و بەهشتە، یان مرۆڤ دەێ بچە دوژەهێ یان بەهەشتێ. ژ ڤان هەر دوو دەڤەرا زێدە تو جهـ دی نینە.

[٤] ئەز خودان بەلا بۆ مە ب شەیتانی وب نەفسێ وئەوا نەفس دخوازە وئەز خودان بەلا بۆ مە ب دونیایێ وپێ پیس بۆ مە پاش ڤان هەمیا، کانێ چاکیتی پاك بوون ل کووە.

[٥] هەر تو وی یارەب خودایێ لێ بوورتنێ ژ باشیا خوە و تەفەرمان کریە کو مرۆڤ ژی هەڤودوو عەفوبکێ [وان تعفوا... خيرا لكم] (التغابن: ١٤) چاخێ گونەهـ نەبن و مرۆڤ گونەها نەکێ لێ بوهرتنا خودا وێ چاوا چێببێ. عەفو ل گونەهکارا تێتەکرن و ل وا تێتە بوورین.

علـى مـن جنـى فيـك والا فجفـو[١]

فيـارب خـذني اذ بـدت فـتن تتـرى

مـن الكفـر والنكـر الـى خيـر منـزل[٢]

والا فجملنـي بصـبر وقـوة

ووفقنـي ماعشـت لأخيـر مأمـل[٣]

بحسـب امـرء شـرا وشـرا وشـيطنة

اذ كـان بـين النـاس ابنـا لنفعـه[٤]

ويغفـل عـن حـق وخلـق وخلقـة

وقلبـه قلـب الـذئب فـي جلـد نعجـة[٥]

فدعـه مهانـا ابتـر متمـردا

ويوضـع لـواء الغـادر عنـد اسـته[٦]

---

(١) يا خودا هەكە تو ل گونها ببووری وتو عەفوو بكی ئەو دلوڤانيا ژلايێ تەڤە ل سەر وا كەسێن كو گونەهـ كر نە دەبارەی ئايينێ تەدا هەكە تو عەفو نەكی ئەو جەفا ئو نەخوەشيە و سەزايە.

(٢) ياخودا تو من بمرينە چاخێ فتنە يەك ب يەك پەيدا دبن ئەو فتنە چ ژی كوفرێ بت و يان ژ نەزانينێ بت تو من ببە بال وی جهێ ژ من را چاكتر بت كو مرنە.

(٣) هەكە تە ئەز نەبرم من لاو و سپەهی بكە ب صەبرێ بێهن فرەهيێ و هێزێ بدەمن و تەوفيقا من قاسێ ئەز ل حەياتێ بم ژبۆ خێرێن هێڤيێن من كو چاكی و باشيە.

(٤) بەسە بۆ مرۆڤ ژلايێ شەرڤە و عەيب ڤە و شەيتانيڤە چاخێ ژ ناڤا مرۆڤان كورەك هەبێ ژبۆ فەيدا.

(٥) وی تەنێ هايێ وی ژ حەقيێ يێ و خەلقی و ئەخلاق نەبت و دلێ وی دلێ گورك يێ د ناڤ پوستێ، كەڤەلێ، بەرخا دبت يێ مهێ دابت.

(٦) پاشی هەميێ ئەوی بهێلە ئەو كێماسی ژ ويرا بەسە ئەو بێ دوندەها وێ نينە ژبن فەرمانا خودا دەرچووە ئالا خەدرێ ئوبێ يەخيتێ وێ بێتە دانين جەم كونا وی، حەديس (لكل غادر لواء يوم القيامة يوضع عند السنة في الحديقة على الطريقة المحمدية.

طوبى لمن بالحلال كان متحججا
موعودة الجنة اذ كان مبرورا[1]
ارجوك من حارتي من لاتفارقهم
عن المناسك واسمح تلق منجورا[2]
بأعظم اجر وبحسن عزائكم
وغفر قصور ام اولاد استاذ[3]
ومن بعد ذا تغدوا الخلائف قرة
واسوة يمن في العصور بأنفاذ[4]
فلا تأس يا ذخري وذكرى ومونسي
ومحيي قلوب موفى وعد بأنجاذ[5]

---

[1] كەیف خوەشی ژ ویرەبت ئەوێ كو دەلیلێن وی ژبۆ حەلالی بن بۆ چاكیێ بن ژ ویێ چاكرا سۆزا بەحشتێ هاتیە دایین ئەو خودان خێر دبێ ژناڤا دلێ خوەیێ گەرم.

[2] هێڤیا من هەیە ژ تە تو ژ ڤان لا نەدی ژ تاعەت ولێ بهورتن وێ دەمێ تو دگەهی خێرێ.

[3] ئەڤ سێ بەیتێن هە ژبۆ سەرخوەشیا سەیدایێ خوە چێكرنە و ژێرە رێكرنە سەیدا مەلا رەمەزان جێلەكی بۆهتی بابێ شەهید دكتور سەعید رەمەزان بۆهتی ل شامێ هەڤژینا وی چوو بوو بەر دلوڤانیا خودێ دبێژێ خودا خێرا هەوە مەزن بكە عەزائا هەوە خودا چاكبكە.

[4] خودا ل كێماسیێن دیا زارۆكێن سەیدایی ببوورێ پشتی ڤێیا هە خودا ڤاییێن مایین شونقە چاڤێن تە ژ وا تەژي بكە ببن مرۆڤێن ب بەرەكەت د دەور و زەمانا دە ب پێكئانینا شولێن چاك.

[5] تو بێ هیڤی نەبە یا هەمی یێ من وئەوێ هەر دبیرا مندایێ وئەوێ تو سەبرا منە تو ساخ كەرێ دلایێ و سۆزا بجهـ پێك تینێ پەسنێ سەیدایێ خوەددە. سەیدا هێژا یە كو پەسنێ وی بێتەكرن. سەیدا مەلا رەمەزان ژ هۆزا هارۆنایە ژ گوندێ جێلەكایە ئەڤ گوند دكەڤە سەر رووبارێ دجلە ژلایێ باكوورڤە رۆژهەلاتێ وی گوندێ هێتمایە باكوورێ وی باسایە گوندی سلوێ فەرحو. ئەڤ ئاغایێ وانە گوندێ دلۆپكێ

نـــــذرت علـــــى نفســـــي لا الفــــين مــــن
تــــذلل للــــدنيا لهـــــا متعبـــــدا[1]

ويأكـــــل مـــــن النــــاس بظلـــم وباطـــل
تخونـــــه المـــــال ببخــــل اذا ارتــــدى[2]

علـــــى نفســـــي الا اتخشـــــع لمـــــن يمـــنح
ليـــــذكر بـــــين النــــاس يومـــــا ويمخـــــد[3]

ولالـــــــه مـــــــداحا ولا متحلفـــــــا
بخفـــــض جنــــاح الـــــذل هـــــلا اعانـــــد[4]

ومـــــوتى احلـــــى مـــــن تعـــــرض حـــــاجتي
الـــــى غيـــــر اهـــــل الفضـــــل حـــــين تمـــــردا[5]

حـــــوالي تفقـــــدت ولســـــت مصـــــادفا
ســـــوى نــــاقض العهـــــد اذا ماتعهـــــدا[1]

---

وشكەفتێن سپی. کەهنیا هەژیرێ و شهریکا و شەوێ. ئەڤ هۆزا هارۆنا نە. ملا یووسف ژی ملاتیا جێلەکا وهێتما کریە (١٩٥١تا١٩٦١).

[1] من نەزرکریە ل سەر نەفسا خوە ئەز حەژ وی کەسی نەکم ئەوێ ژ دنێرە کیم بکە و دونیا پەرەست بە عیبادەت ژێرە بکە.

[2] ژ ئینسانا بخوە ب ستەمکاری (ظلم) و نەڕاست (باطل) مال ودەولەتیی بێ بەختیێ ب ویرە بکە بنەدانێ و بەخیلێ یێ چاخێ سەرویدە کنوژی یێ بەردد.

[3] سۆزیت ل سەر رحێ من ئەز خوە نەشکێنم ژبۆ وی کەسێ کو ددێ مالی دا قەنە رۆژەکی د ناڤ مرۆڤا دە ژێ باخڤێ و پەسنێ خوە پێ بدێ.

[4] من سۆز دایە ئەز ژ وی ڕا پەسنا نە دم وژێرا مەلاقیا نەکم وملێ خوە ژێرە نقز نەکم و ئەز خوە ژێرا نەشکێنم. ئەزێ نەیارێ وی بم دەڤ ژ نەیارەتیاێ وها بەر نادەم.

[5] مرن ژ من ڕا شیرین ترە کو ئەز پێدڤیێن خوە. پێویستی. بۆ وی کەسی بدم نیشاندان کو ئەو نەبابەتێ چاکی کرنێیە و نە ژ وا کەسایە کو چاکیێ دکن ددەمێ کو سەرخوە دچێ.

فكم من رجالات اذا مارأيتهم
كأنهم الطاق لكسرى تسندا[٢]

واياك لاتغرر بفخ احتيالهم
تظن وان الظن لايغني مسندا[٣]

تعاوت على الدنيا كلاب تمرغت
بها فاتق فيها بقلب فترشدا[٤]

فلا تلتقم من دوحة النهي تهبطا
ولاتقربا منه يشير الى الغدا[٥]

فيوسفك الجاني اتى باب رحمة
وطائره في عنقه قام شاهدا[٦]

ينادي ياربّاه جد لي بسمحة
ولازلت منانا ومازلت ماجدا[١]

---

[١] ئەوێن ل دەورو بەرێ من بوون ونداكرن، ئەڤ نەتشتەكە كو ژ نشكاڤە بت كو ئەو كەس مابن ئەوێن سۆزێن خوە دشكێنن چاخێ بو یەكی سۆزددن. یاني مرۆڤێن خودان سۆز و وەفادار نەمانە یێن بێ سۆز وبێ وەفا مانە.

[٢] گەلەك زەلام هەنە چاخێ تو وا ببینی تو دبێژی تاقێ كیسرا نە جهێ پالدانێنە وەسا بەدەووردن ولەڤهاتینە مرۆڤ دبێژێ ئەڤ بكێر تێن مرۆڤ پشتا خوە بوا گێرێ بدێ.

[٣] هایێ تە ژتە هەبێ بوا نەوە خاپاندن بتەلها (خەفكا) حیلەیێن وا تو هزرا دكی ژوا كو باشن لێ هزر وزەن نابن جهێ باوەریێ مرۆڤ نكارە خوە ب هزرێ بگرە.

[٤] هندەك سە كوچك ل سەر دونیایێ دكن كەوت كەوت ئەوێن خوە لێ وەردانە. خوە ژ دنێ بپارێزە ژ دل ب قەلب تو دێ باشی ببی.

[٥] تو پاریا رانەكە ژ وێ خارنا حەرام هەكە توراكی تو وێ بەر ژێرببی بلا تو نیزیك وی نەبی ژبەر كو سحار دووڤدا تێت، یانی حەساب و كیتاب هەیە.

[٦] ڤایە یووسفی تە یێ گونەهكار هاتیە بەردەرێ دلوڤانیا تە (ڕەحمە) دەفتەرا وی ژی د ستو كورا ویدەیە و ئەو شاهدە ل سەر وی.

كتبت على نفسك للخلق رحمة

شقيك بالباب رقيبا لترصدا[2]

ببسط ذراع بالوصيد ملاصقا

لعلك تعفو من بجهل قد اعتدا[3]

وشرة نفس الجا في شر هوائه

شريرة ابليس لعذرة تعضلا[4]

فياما سكاني اليوم يوم تزود

تحمقت عن عيش فهلا تزودا[5]

على الدنيا عفآء حتى تقنع

وتعرف انها ليست شويا[6]

وتعرف انها قصوى الدناءة

---

(1) گازى دكێ دبێژێ يارەببێ من تو ل سەر من سهل بكە بارێ من سڤك بكە ژبەر كو توهەر وهەر مننەت كرى وهەر وهەر تو خودانێ دانێ يى ومەردى. [وكل انسان الزمناه طائره في عنقه ونخرج له كتابا يلقاه منشورا] (الاسرا: ١٣).

(2) تە نڤيساندیە ل سەر نەفسا خوە ژ خەلقێرا دلوڤانى (بسم الله الرحمن الرحيم).ڕەحمان يانى دلوڤانى بۆ هەمى عالەمێيە، گونەهكارێتە بەحسا خوە دكە.

(3) ل بەر دەرگەهێ تەیە ئامادەیە دا چاڤ دێرییێ بكە هەر دوو دەست و زەندێ خوە درێژ كريە ل سەر عەردێ هێڤیاوى ژ تە هەیە كو تو وى عەفو، لێ بهوتن بكى ژ وا زێدەگاڤیا كو كر نە ژ نەزانین گونەها.

(4) شەڕێ نەفسا گونەهكار، ستەمكار ژ شەڕێ ڤیانا ویە، هەوائا نەفسێ ئەڤ شەڕێن هە هەمى ژ پیسیتیا شەرێن ئیبلیسە ئەو وێ تە نگارێ چێدكە.

(5) ئەوێ ژ باڤكێ ماسەكایە ئەڤ ڕۆژ ڕۆژا ئامادەكرنا زادێ ئاخرەتییێ تو بێ هش بوویێ ژ كاركرنێ تە زادێ ئاخرەتێ ئامادە نەكریە.

(6) شاعرى دونیا شبهاندیە ژنەكا ب پرچ ل سەر دنیایێ پورت هەیە ئەو خوە دپێچەدا بێتە زانین ئەو نە وەسایە.

فـــــــي العهـــــــــد ماكانـــــــــت وفيــــــــا[١]

وتعـــــــــــرف انهـــــــــا شـــــــــــوهاء دب

وامـــــــا حـــــــــين اذ وردت عليـــــــــا[٢]

تعـــــــانقني بلـــــــين فـــــــي الكـــــلام

بشـــــغف الحـــــب تقبـــــل وجنتيـــــا[٣]

وتســــــقيني شـــــــرابا وتهنـــــــى

بأفـــــــديك حيـــــات ابويـــــــا[٤]

ولــــم يطمســـــني انــــس خـــــذني خـــدنا

ولــــم تمتـــــد اعيـــــنهم الـــــي[٥]

فمـــــا ابـــــدع تحاســـــين محيـــــاي

كحـــــور فـــــي ســـــواد مقلتيـــــا[٦]

ومـــــن بيـــــت الأعـــــزة نشـــــأ عرقـــــي

لـــــذي وطـــــر لـــــدي مالـــــديا[١]

[١] بەلكو ڕندە حالبوكی ئەو تێتە ناسین كو داویا پیسی تیێیە هەر وەسا دسۆزا خوە دە نە وەفادارە سۆزا خوە پێك نایینە، نە خودانێ سۆزا خوەیە.

[٢] دونیا تێتە ناسین كو وەكە هرچەك دەڤ ڕوو تێك چوویە، لێ چاخێ تێتە با من.

[٣] دەست دستووێ من دا وەرتینێ وئاخفتنێن نەرم دكە ژ حەژێ كرنا دلێ خوە هەر دوو هناركێن رووێ من ماچ دكە.

[٤] د دێ من ڤەخارنەكی ودبێژێ نوشی جانبە و گوری تەبت ژیانا دێ و باڤێ من.

[٥] چوو مرۆڤا دەست من نەدانە من ژ خوە ڕە بگرە حەژیكەر بە و چاڤێت چو كەسی دریژی من نەبوونە و نەهاتنە لایێ منڤە.

[٦] چ تشتی هندە خەریب ب من كریە سپەهی تاهیی چ ساخ بوونا من وەكە وێ ڕەش و سپیتاهیا د ناڤا ڕەشكا چاڤێ من دا پەسنێ رندیا خوەدكە.

وتبـــــدي فـــــي جمانـــــة ماعليهـــــا
كـــأن هـــي فـــي الســماء هـــي الثريـــا[٢]

ومعـــــذا هـــــي حـــــرف مـــــن مبـــــان
الـــــى الأســـمى واهجرهـــــا مليـــــا[٣]

ورب الســـجن احـــب الـــــي ممـــــا
تراودنـــــي اليـــــه يـــــا فتيـــــا[٤]

فيـــــاليتني امـــــوت ولســـــت حيـــــا
اذا تعطـــــو بهيئتهـــــا اليـــــا[٥]

تعـــــرف جنيبـــــا بســـــوء العـــــذاب
وبـــــدار شـــــيبك قبـــــل الشـــــباب[٦]

اتعـــــرف خائنـــــة الأعـــــين
وضـــــائعة العـــــرض آن الغيـــــاب[١]

---

(١) ڕەگەزا من پەیدا بوویە ژناڤا مالا عەزیزێ ژ وی کەسێ حەوجەرا (پێویست) را لبا من هەر تشت هەیە ئەز کارم حەوجەهیێ وی پێك بێنم، پەسنێ خوەددە هەر بەحسا دونیایێ دکە.

(٢) دیار دبە ژوێ لۆلوئا ل سەر وێ هەر وەکی ئەو ل ئەزمانا کۆمکا سێویایە.

(٣) دگەل ڤایێن هە هەمیا ژی ئەو تیپەکە ژ تیپا مەبنی نە یانی نە چو تو نە تو وێ بهێلە تەرك بکە نەب قیمەتە.

(٤) یاڕەبي زندان بۆ من چێترە و ئەز پتر حەژێ دکم ژ وێیا ئەو من داخواز دکێ بالڤە یا قیزێ ئەوا کو دبن پەردێ دایە بەحسا دونیایێ دکێ.

(٥) خوەزی ئەز مری بووما و نەساخ بووما وێ دەما ب ڤێ پێکهاتنە خوەڤە کو تێتە بال من ڤە. چاخێ ددێ ب ڤێ تەمتێلا خوەڤە بۆ لایێ من ڤە.

(٦) ناس بکە نەفسا خوە ئەوا د ناڤا تەنشتێ تە دایە ب پیستر سەزا لەزێ بکە لپیراتیا خوە بەرێ لاوی تیا خوە.

اتعرف بادني العذي
جاهلا بجلد الضئون وقلب الذئاب[٢]

تكشف اذ كنت ممتحنا
لك دب شوهاء تحت النقاب[٣]

اجنك دهرا بأن ابتسام
ويلقيك غيا وبئس المئاب[٤]

اروني صالحة من قرى
امن امة ام شراب السراب[٥]

تعوذ بربك من امرأة
تشيبك في بكور الشباب[٦]

فصاحب جنبك بئس القرين
تبومت منها وهو كالغراب[٧]

---

(١) ماتو دناسی ئەوێ چاڤێ وی بێبەخت و خایێن ئەوێ نامووسا تە دەردێ د چاخێ تو نەحازر بی ل مالا خوە.

(٢) تو ناس دکی ب ئاورەك. بنێرینەك. هندك وکێم نەزانە د پوستێ مها دایە و دلێ وی دلێ گورگایە.

(٣) بۆ تە کفش دیت چاخێ تو پس پوڕ بی چ هرچەك تێك چوویە دبن پەردێ دایە. بەروك کریە.

(٤) تو دبن کری زەمانی کو ب تە ڕە بەشیشە ڕاستە تە تێت وەکە وی بەرێ سەر سەرێ مرۆڤ.

(٥) دکێ فرفر یان وەکە ئەو گەلێن دکەڤن بن سها شورادە یانی شورێ زەمانی دکەڤێ سەرسەرێ تە ئەڤ نەخوەش مراد و مەخسەدە.

(٦) تو ب خودایێ خوە، خوەبپارێزە ژ وێ ژنا کو تە پیر دکە د دەمێ لاویتیا تەدا.

(٧) هەڤالا ل تەنشتا تە پیس هەڤالە ژبەر وێ تو وەکی بومێ لێهاتی یانی سەرێ تە سپی بوویە ئەو بخوە وەکە قژاکێ ڕەشە.

أكـــــــل فتـــــــات تعجبنــــــــك حســــــــنها
فتاتـــــــا فـــــــذا منــــــك خيــــــال لأســــــافل[1]

عليــــــك بـــــذات الـــــدين بقعـــــآء وقتهــــــا
وعنقـــــا وجـــــودا مـــــن خـــــراف وباطـــــل[2]

مـــــن اكبـــــر الأفـــــات حرصـــــك ياشـــــقي
وارزل الأخـــــــلاق فانتـــــــــه واتـــــــق[3]

لمـــــزت وفـــــي العـــــين نصـــــول رماحنـــــا
وانــــــي لممـــــن فـــــي العيـــــون القـــــذآء[4]

ارى النــــاس طــــرا فــــي جنــــى وجنايــــة
والحـــــاد ديـــــن هـــــل لـــــذا الـــــداء دواء[5]

ولاتجعـــــل الجهـــــال فـــــي الـــــدين مرشـــــدا

---

[1] ما گەلو هەمی کەچك تە دهێلن عەجێمایی ڕندیا وا ئەو کەچن ئەڤاهە ژ تە هزرە وخیالە یا وا کەسێن نەفس نمزە.

[2] ل سەر تەبت وا کەچا ژ خومرە ببژێرە ئەوا خودان ئایین بت ئەو ژی غەلا دەمێ خوەنە.پەیدانابن. هەییناوا وەکە پرندێ (گیرێ) عنقایێە ناڤ هەیە ئەو بخوە نینە ژ تشتێت خورافاتە بەتالە. وەکە دبێژن: فلان تشت رومانە ئەفسانەیە. ئەو ژنێن خودان ئایین ژی گەلەك کێمن هەبن ژی بدەست مرۆڤ ناکەڤن. پەیخەمبەر ژی دبێژن: (فظفر بذات الدين تربت يداك).

[3] ژ ئافات و بەلایەك مەزنە ڤیانا تە حرسا تە، یا ئەوێ گونەهـ بار و خویێ نەباش، ئەخلاقێ ڕەزیل. ژڤانا ڤەگەرە و ژ خودا بترسە.

[4] تو ئاورا ڤە ددی دچاڤارە دا رمامەتێدایە ئەژێ دچاڤدا قرنی و قەوالە مرۆڤ دڤێت خوە بپارێزێ ژڤان بەلایان و هەلاکەتا.

[5] ئەز دبینم مرۆڤ بەش بەشن د دەست درێژاهیا دا د تاواناده تاوانێ هەر کەسی نە وەکی هەڤن و د ماندلاکرنا ئایندا ژی کو هندەك هەنە ژ تو ئایینا باوەر ناکەن وەکە شوعیا و کۆمونستا، گەلو ما هەیە ژ ڤێ نەساخیێڕا دەرمانەك یان دەردێ دەرمانە.

كـــــذا الأعمــــــى فــــؤادا والا فتهلكــــــــا[1]
عليـــــــك بخيــــــر والأطاعــــــة شـــــطره
والقـــــى الخـــــلأ الجهـــــل والا فتهلكــــــا[2]
حـــــذاريك حرصــــا والمـــــروءة محــــتم
قناعتـــــــك الحصـــــــن والا تفتكـــــــا[3]
ويووســـــف مــــن دار الضـــــيافة غـــــادر
مواجـــــه آبـــــاد الــــــى اللـــــه جــــآئر[4]
فيـــــا خيبــــة مــــن ســـوء ذنــــب تراكمــــت
ويــــــالهف ايـــــام بســـــوء ينـــــاير[5]
ومــــــن يتقـــــي اللـــــه يفـــــرج لــــــه
ويرزقـــــه مــــن حيـــــث لـــــم يحتســــب[1]

---

[1] تو مرۆڤێن نەزان(جاهل) د ئاییندا ژ خوەرە ڕێناس هەروەسا یێ کور ژی نەکە دەلیل بت وێ دەمێ تو دێ بچی هەلاکەتێ.

[2] تو گوهێ خوە بدە گۆتنێن پەیخەمبەری و بیاکرن ژی ڕەخەك یێ وێیە و نەزانینێ باڤێژە دقەدەم گهێدا. تووالەت هەکە تو وەنەکی تو دێ ژناڤ بچی و ب هەتکی.

[3] خوە بپارێزە ژ ڤیانا زێدەبوونێ (حرص) پێویستە تو خودان مروەت بی و قەناعەت. خوە ڕاگرتن بۆ وێ یا خودا دایێ تە ژ کەسی چو نەخوازە ئەو بۆ تە کەلهە هەکە نە وەسابی دێ ژ هەڤ بەلابی.

[4] ژ خوەڕە دبێژە یووسف ژ خلنیێ مێهڤانداریێ دەرکەڤە بەرێ وی ل وارەکێ ئاڤایە و هەر هەیە. دچێ بال خوداڤە جیرانەتیێ یان جائر گونەهکار، دونیا نەجهەك بەردەوامە ئاخرەت هەر وهەر هەیە.

[5] ئەز پووشمانم ژ وان گونەهێن پیس کەتین سەرهەڤ یا پوشمانی دوان ڕۆژێن ب گونەها هاتن پیسکرن ڕۆژێن کانوونا پاشی ژبۆ وەزنێ گۆتیە ڕۆژێن کانونا پاشی زڤستانێ، کە نەخوە دهەمی ڕۆژادە گونەهـ پیسن.

ومن يتوكل فهو حسبه
وبالغ امره لا يحتجب[٢]

موانع العبد عن معبوده اربعة
مال وجاه وتقليد ومعصية[٣]

فخذ من العلم ترياقا تصح به
داريك في نوره والناس مقتبس[٤]

متنا ترابا بلا همس ومعرفة
يلقى مآثر اعمال على غفل[٥]

طوبى لمدكر يدعوا بمغفرة
لله يرحم من يرحم بلا قلل[٦]

ان التفاضل بين نوع انسان
ليست بمال وانساب وابدان[١]

---

[١] کەسێ ژ خودا ترس بە خودا دەرگەهێ خێرى ژێرا ڤەدکە ورزقێ وی ددە ژ دەرەك وەسا کو ئەوی ئاگەهـ ژێ نەبوویە و ئەوی نەزانی حەساب ژێرە نە کربوو.

[٢] کەسێ هەیینا خوە (تەوەکەلا) خوە بەردێ سەر خودا ئەو بەسی ویە و شول کارێن وی ل سەر وی بەردە پۆش ناکە هەمێ ڤیانێن وی ب جهتینە.

[٣] ئەو تشتیت کو ناهێلن عەبد ژ خودا ڕە پەرەستیێ بکێ چارن، یەك مالە، یەك مەزناهیە، یەك خوە وەکە هندەکا لێ دکە، دبێژی: ئەزی وەکە فلانی، یەك گونەهن.

[٤] تو ژ خوە ڕە زانینێ بگرە (علم) ئەو وەکە دەرمانێ نوژداریە تو دێ بوێ ساخ ببی ڕۆناهی وێ ژ خانیێ بچێ و شەفەق بدێ خەلك وێ بێن ژ خوە ڕە ژ وێ ڕۆناهیێ ببینن.

[٥] ئەم مرن و بوونە ئاخ بێ دەنگ و ناسکرن ئەم ڕاستا کریارێن خوەییێن نەباش هاتن بێ ئەم بزانبن.

[٦] مزگین ژبۆ وی بت ئەوێ ژێرا تێت گازیکرن ب لێ بهورتنێ خودا دلوڤانیێ لوی دکێ ئەوێ کو دلوڤانە وبرەحمە بێ کێماسی و بێ ڤال و قیل.

بل بالتقى في الأمور خذ حقائقها
دع المجاز ولا تغرر بأخدان[2]

فلم ادعوك من بين البرايا
وكم ادعوك في دفع البلايا[3]

وكم ادعوك في كشف الكروب
وادهى مانلاقي في المنايا[4]

وكم ادعوك في آصار حمل
وفي رفع المآرب والخطايا[5]

وكم ادعوك مضطرا يئسا
وكم ادعوك في حل القضايا[6]

---

[1] چاكی تی د ناڤ بەشێن مرۆڤا دە نە ب مالە و نە ببنیاتە ڕەگەزە ونە ب لاشە، مالێ ڤێ ژینێ ڤی زێدەیە بلا قەدری ویژی زێدە بت ئەڤێ هە ژ فلان بنەمالی یە ژ ڤێ هە چێترە یان ئەڤێ هە لاوەك ڕندە و سپەهیە.

[2] بەلكی ب تەقوا و ژ خودا بترسە دهەمی تشتا دە و دڤێت خوە ب ڕاستیا بگرێ خوە بگرە بڕاستیا دەست ژ تشتێ نەڕاست و چوونە بەردە و نەوە خاپاندن ب دوستان كو بێژن ئەڤ باشە ئەڤ نە باشە.

[3] گەلەك جارا ئەز گازی تە دكم ژناڤا مرۆڤا و عالەمێ و گەلەك ئەز گازی تە دكم ژبۆ لادانا نەخوەشیا و بەلا.

[4] ئەزگەلەك گازی تە دكم كو تو نەخوەشیا و كەربا ژ سەر من ڕاكی و وان زەحمەتییێن كو د چاخێ ژارییێدا ئەم ڕاستاواتێن.

[5] ئەز گەلەك داخوازێ ژ تە دكم كو تو بارێ گران ل من نەكی [ولاتحمل علينا اصرا كما حملته على الذين من قبلنا] (البقره: ٢٨٦)، و ئەز گازی تە دكم تو ژ سەر من ڕاكی داخوازییێن من یێن نەباش و گونەهـ.

[6] گەلەك جارا د دەمێ نەخوەشی و بێهیڤی بوونێدا گازی تە دكم، گەلەك جارا ئەز گازی تە دكم د ڤەكرنا دۆز ودەعوا دە.

الالـــــى فـــــي الخطـــــوب شـــــاهدات

بـــــأن اللـــــه قيـــــوم البرايـــــا[1]

الهـــي انـــت مقصـــودي رضـــاك عنـــي مطلـــوبي

فـــوفقني لمـــا ترضـــى الا تســـمح بمرغـــوبي[2]

قـــد انـــدمغ الحـــق ونـــاس بباطـــل

دارت الـــدنيا لرفعـــة جاهـــل[3]

نعـــم جـــآء علـــى الانســـان حـــين مـــن الـــدهر

ولـــم يـــك فـــي الـــذكر ولا فـــي الهياكـــل[4]

ياجـــامع العظـــم ويـــا قـــادرا متـــى

تســـوى بنـــان بصـــمات الرســـائل[5]

لطـــول الســـرى بثـــت علامـــات شـــرقنا

اذا باتـــت الافـــق بليـــل مباهـــل[1]

---

(١) ژبۆ من گەلەك شاهد هەنە د ئاخاڤتنێن مندا كو خودایە شول و گازی و هەمی هەینێ عالەمێ ئەو پێك تینە ئەز خودانێ ڤێ باوەرییێمە.

(٢) یا خودایێ من مەخسەدا و مرادا من هەر تووی ئەز ژ تەرازی بوونا تە دخوازم یارەبی ئەوا تو حەز ژێ دكی تو وێ بكە نەسیبێ من ماتو نادی من ئەوا كو داخوازا منە. داخوازا من ڕازی بوونا تەیە.

(٣) ڕاستی و حەقی بسەر كەفت هندەك مرۆڤ هێزێ ل سەر نەڕاستیێ نە هەر وەكو فەتلوگەرا دنێ ژبۆ بلندكرنا نەزانیە جاهلیە [جاء الحق وزهق الباطل ان الباطل كان زهوقا] (الاسرا: ٨١).

(٤) بەلێ ئەڤە ل سەر ئینسانیدە دەورەك هات ژ زەمانی كو نەدهاتە ژێ ئاخفتن و هەینیا وی نەبوو و لەڤداناوی نەبوو.

(٥) گازی خودا دكە دبێژێ یا ئەوێ كو هەستیا بهەڤ ڤەگرێ ددێ و د جڤینێ كۆم دكە یا ئەوێ خودانێ شیانێیە كەنگی تو دێ ڕاست بكی سەر تلییێن شەهدەبوونا نامان. ئەو تلییێن كو وەكە موهرێ ل نامان ددەن.

فيـــا ســــرمد الليــــل الــــبهم الـــى متـــى

فأصـــــبح بنـــــا ليـــــل بيــــوم مـــــداول[٢]

وليــــل كمــــوج البحــــر ارخـــى ســـدوله

علـــــي بـــــأنواع الهمـــــوم انحـــــل[٣]

وســـــبحان فينـــــا اذ بغـــــيم تـــــدرعا

كـــأن رســـتم فـــي حميـــة الشـــرق قنعـــا[٤]

ســـبحان اذ ســـمي لشـــأن مـــد لهـــم

ففـــــي ذاك تلمـــــيح مـــــآثر تتبعـــــا[٥]

اراصـــــد شـــــرق فـــــي الحراســــة قـــيم

---

(١) ژبـۆ درێژاهیـا ڕێڤـەچوونا شـەڤێ نیشـانێن ڕۆژهـەلاتا مـە ئاشـکەرە دبـێ چـاخێ هـاویر دوور شەڤ بسەردا تێت وهەمی یێ دادپوشە، نەوێرە ناڤێ کوردستانێ بێنیێ ژبەر ترکا.

(٢) یا ئەو شەڤا دێرێژا بەردەوام حەتا کەنگی بلا لمە ببە سحار یا شەڤێ بڕۆژەکی کو جارەکی ژبۆ مەبیێ. ڕۆژا ئازادیێ یا سەرخوەبوونا گەلێ کورد خودا دبێژە [وتلك الایام نداولها بین الناس] (أل عمران: ١٤٠) [یوم لنا ویوم علینا]. ڕەسولی خودا گۆتیە دشەری چیایێ ئوحودێدا. أحد وصل یارب علی من قال (ان من الشعر لحکمە وان من لبیان لسحرا فقل یا یوسف کال من عند الله).

(٣) شەڤ وەکە پێلێن دەریایێ داواخوە بسەرمندا بەردایە ب هەمی ڕەنگێن خەما کەتنە سەر من ئەز مام دبن دا و هاتمە پێچان.

(٤) چیایێ سیپانی د ناڤمەدا د کوردستانێدا خوە زەرپوش دکێ بمژێ هندی بلندە سەرێ وێ پڕ جارا مژە عەورە مرۆڤ دبێژێ: قەي ڕوستەمێ زالە ژبۆ پاراستنا ڕۆژهەلاتێ کوردستانێ کۆم زرە وەرگرتیە.

(٥) چاخێ ب سبحان هاتیە ناڤ کرن ئەڤ ژبۆ کارەکی مەزن و موهم تێتە گۆتن چاخێ مرۆڤ تشتەك مەزن دبینە مرۆڤ دبێژە (سبحان الله) ئەڤاهە هندەك ئیشارەتن یەك دووڤ یەکی تێت دبێ ئەسەرتێدا هەبێ کوژێرا گۆتبە سبحان نەخوراهی ئەڤ ناڤ لێهاتیە کرن.

اهـــو اســـد شـــاكي الســـلاح مروعـــا[1]
وتســـنى بـــروق النجـــد منـــه بشـــرقينا
فيـــا حبـــذا شـــرق بـــه ماتلمعـــا[2]
ادلهمـــك الأمـــر المـــد لهـــم مثلمـــا
دلهـــت بـــدهر بالخيانـــة تصـــدعا[3]
انالـــك مثلـــي شـــغف حـــب مقامـــه
كعنقـــا مقامـــا لاينالـــه مـــن يســـعى[4]
ورأســـا بـــرأس لاتفـــاوة بيـــد أن
بكـــآء بـــلا عـــين بكـــآء بمـــدمعا[5]
تـــلألأ بمـــا فيـــه كأنـــه جمانـــة
فمازلـــت عطـــارا ولازلـــت تنبعـــا[1]

---

[1] ما گەلو چاڤ دێریا روهەلاتێ دزێرەڤانییێدا پیك تینە و پێ ڕادبە یان شێرەکی بچەك هاتیە پیچان کو نەیارا دترسینە.

[2] یان تیرۆژن وێ وەکە بروسکا ژ نەجدا حیجازە ڤەداین روهەلاتێ رۆناهی دکە چاقا رندە رۆژهەلات بووی چاخێ تیرۆژ ژێ دچن یان رۆناهی ڤەدەرە. چاخی خەندەك سەحابا کولا بەرەك تێدا دەرکەت نەکارین بشکێنن پەخمبەر هات دەربەك لێدا بترۆژێ ڤەدا بەحسا وێ بروسکێ دکە سەیداین جزیری ژی دبێژە (لامع ژ عەرب برقێ د فخارێ عەجم دا).

[3] کریارێن تاری ب سەر تەدا گرتیە وەکە وێ تاریتیا ژ زەمانی ب سەرمندا هاتی ب خیانەت ئەز ژ هەڤ شەق کریم.

[4] ما بۆ تە چ هەیە وەکە من کو دلێ وی پەردەپوش بوویە ب حەزکرنا جهـ و مەقام وەکە جهێ پرەندەی عەنقاییێیە ناگەهێ وی جهی چەند کوشش ژێرا بێتەکرن تەیرێ عنقا.

[5] سەرێ من ژی وەکە سەرێ تەیە چوو جودابوون د ناڤ بەراوادە نینە ژبلی وێ یەکێ گرینا یەکی بێ چاڤە ویا یەکی ژیر و هندکایە.

صـــــبا فاســــتطب منــــه بـــــأنواع طيبـــــه
فـــــلا مســـــك يعدلــــه اذا مــــا ترعرعـــــا[٢]
نســــيم الصــــبا فـــأت مبشـــــر رحمتـــــه
بفـــــيح جبــــال تحيــــى قلبــــا مزلعـــــا[٣]
ويــــا نفحـــــات هيجـــــت مــــن خيالنــــا
الذكـــــرت لاخـــــوان الصـــــفا التفجعـــــا[٤]
فيوســـــف يرجـــــو منــــــه رغــــد حيـــــاتكم
بســــنو بــــروق مــــن جبـــال تهمعـــــا[٥]
صــــبا كلمــــا تـــــذهب وتحظـــــى بروضــــة
اليهــــا ومنهــــا بالســــلام لتســـــرعا[٦]
ونصـــــحى لـــــذي قلـــــب ســــليم تســــلما

---

[١] چاڤێن من ڕۆهنك ژێ تێن یێ سیپانێ خەلاتێ كەهنی نە وروبارن شەفەق ژێ دچێ بوا تشتێت كوتێدا هەنە هەروەكی دوورێیە بەردەوام تو بێهنا خوەش بەلاڤ دكی ودڕەشی نی، بەردەوام تو ئاڤێ د پەژقینی و ژناڤا تە ئاڤ دزێ.

[٢] بایێ سحارێ خوە بێهن خوەش بكە بهەمی جورێن بێهن خوەشێین وێ نە بێهنا مسكێ وەكە بێهناوێ یە چاخێ دهەژهە ودرەعرەعە.

[٣] بایێ سحارێ ئەوێ هوونك كو ژلایێ ڕۆژهەلات ڤە تێت وەرە مزگینیا دلوڤانیێ بدە ب وێ خوەشیا دفورهێ ژ چیا ودلێ پەرچقی ودلێ پەرچقی ساخ دكە. دلێ بریندار.ساخ دكە.

[٤] یا ئەو گوربوونا بێهنێن خوەش كو ژ هزرێن مە د پرقن ما تە بیرئانیە ئەو برایێن صفا. نەخوەشی وشەڕ ئەو كەسە بوون كو دچاخێ ڕەسول دا سەف دگرتن ژبۆ شەر.

[٥] یووسف هیڤی دكێ ژ خودا ژبۆ وە ژیانەك خوەش بوان تیرۆژێن بروسكان ژ جیایێن مەیین كو ڕوندكێن وان كەهنی نە كانی ژ وا دزێن ودهەركن.

[٦] یا بایێ سحارێ چقا تو بچی و دا ناڤ باخچا ڕە دە بەرهەمەند بی ب وێرا و ژ وێ سلامێن بلەز ئەم ڕێ دكن.

مـــــن الــــــنفس والـــــرجس ودنيـــــا يـــــلام[1]
مـــالي وجـــه مـــن فعـــالي مـــن لـــي ان لـــم تبـــالي
يالحـــالي مـــن مـــآلي يـــا لمـــالي مـــن غـــرام[2]
يـــالي مـــن يـــوم التلاقـــي التفـــت ســـاق بســـاق
يالخبـــث مـــا الاقـــي مـــن شـــجى يـــوم القيامـــة[3]
ارانــــــي اراراتــــــا بــــــثلج وشـــــيبة
وضــــنو ثيـــاب الغـــيم ماكـــان ينجلـــي[4]
ادرعـــــت اثـــــواب الضـــــنى لكرامنـــــا

---

[1] [رب اشرح لي صدري ويسر لي امري واحلل عقده من لساني يفقهوا قولي] (طه: ٢٥) شيرەتا من بو وى كەسێ خودانێ دلەكى ساخە ئەو خوە بپارێزە ژ شەرێ نەفسێ وگونەها ودونيا كو دبێ جهێ لوما. يارەبى سنگا من ڤەكە شول و كارێن من ژمن را سەهل بكە و گرێكا زمانێ من ڤەكە دا قەنە گۆتێن من ژبۆ مەخسەدێ بێنە فەهم كرن. ئەڤە گۆتنا نەبى مووسايە.

[2] ژبەر كريارێن من ڕوويێ من نەمايە هەكە تو هاريكاريا من نەكى كى هەيە خەمێ ژێ بخوێ كا حالێ من وێ چاوا بت ئەزێ خوەبكى بگرم مالێ من تێرا غەرامەتا من ناكە.

[3] كا وێ حالێ من وێ چاوابت دوێ ڕۆژا لنگێ من بهەڤدوڤە بێ نە پێچان ل هەڤ دحەبلن. كا چەند نەباشە ئەوا كو ڕۆژا رابوونێ قيامەتێ ژوێ برينێ حالێ من ژوێ برينا ڕاستامن بێت.

[4] من چيايێ ئارارات، چيايێ ئاگرى، گرى داغ، هێكو دەكەڤە سەر تخووبێ كوردستانا باكوور و دەولەتا ڕووس و كوردستانا ايراني. دكەڤێ دەڤەرا سەرحەد، چيايێ هەرى بلندەل كوردستانێ سەرێ وى ژبەر ڤێ هەرسپيە، ژبەر وێ خوەجهى دبێژنێ هێكو، شاعر پەسنێ وى د دە. دبێژێ: من ديت ئارارات بەفر بوو و سپى ببوو وەكە مرۆڤێ پير سەرێ وى سپى بووبێ كنجێ ژ مژێ ل خوە پێچا بوو وەسا لێ هاتبوو نە دهاتە ديتن ژبەر مژێ و عەورا ژ خوە سەرێ وێ تم عەورە.

اذا استولت الروس عليهم بالقتل[(١)]
وترثى كشكلي نا بفيح رياضكا
واكمام ازهار وعطر القرنفل
كسبحان من سلفي خجى الشنگ حبة
تموت وابقى ليس ذا من تبقل
امن ذكر ايام بأبنآء دولة
تقضى ببياز من جبال مصندل
وزهرة دنيانا بها الطفل يلعب
عسيلتها سم وشاربها طفل[(٢)]
فأن تدعى صدقا وفوزا بجنة
فدم زاهدا فيها وجد فتكمل[(٣)]
ابشركم معشر الأسخياء
سخاؤكم خلقته الأصفياء[(٤)]
سخا دوحة الجنة اغصانها
الى الأرض تدلى لرقى السماء[(١)]

---

(١) من گۆت ماته جلا زەریوشی ل خوە کریه یا حوزنێ ژبۆ مرۆڤێن مه یێن خودان چاکی و کەرامەت چاخێ ڕووس ئەو دەڤەرگرتی کەتی بن دەستێ وێ ئەو زەلامێن مه یێن کورد جامێر بوون هاتن کوشتن بدەستێ ڕووسا ژبەر وا ئەو کنجا حوزنێ وەگرتیه

(٢) دونیا مه یا وەکه کولیلکا زارۆك پێ دلەیزن جارجار دگۆتن دونیا لەیستوکا زارۆکایه. یانی مرۆڤێت خودانێ عەقلێ تەمام وکامل گوهێ خوە نادەنێ. هنگڤی نو کێ وێ ژەهره ئەوێ ڤەدخوێ هێژ زارۆکه تەمامه کامل نەبوویه.

(٣) هەکه تو دبێژی: ئەز ڕاستم بۆ خودا ومن دڤێت بچم بەحەشتێ دڤێت بەردەوام تو خوە ژێ بپارێزێ و تێکل نەبی و تێدا د تەنگی یێدا بی وێ دەمێ تو تەمام دبی دی مرۆڤەك کامل.

(٤) ئەز مزگینیێ ددم هەوە کۆما مەردان مەردیتیا وە ئەخلاقێ مرۆڤێن باشه وچاکه.

سخى اذا اعطى فلا دخل للرايآء
جواد اذا اعطى تطرقه الهباء[٢]
لأن السخا منه غريز وعنصر
فيوض من الله ارتقاء الى السماء[٣]
ولست افيد من هواء وانما
من الكتب فأشكر وافد بالدعاء[٤]
ان فرعون علا في ارضنا واستكبرا
ليس لي مصر بمآء تجري تحتي استهمرى[٥]
ثم في اعماق بحر انهوى واستنكرا
فأطرقن ياكرا أطراق كرا اطرق كرا[١]

---

(١) مەردیتیی دارا بەحشتێ یە چڤێن وێ ژبۆ عەردێ دا حەلانە دا مرۆڤێ مەرد پێڤە بچە ئەزمانا. بچێ بەحەشتێ.

(٢) مرۆڤێت مەرد چاخی دانیێ دێ جهێ ڕومەتیێ تێدا نینە مرۆڤێ مەرد دەما دانێ دکە وەکە بالێبدە و ڕاکە ببە یانی دلێ وی نە پێڤەیە. ل بەر چاڤێ وی نایە دچێ ونائێخە منەت ل سەر کەسی.

(٣) ژبەر کو مەردیتی د ناڤ ویدە هاتیە چاندن د ناڤ چێکرنا ویدایە ژ عوصرتی ویە فەیزەکە ژ خودا وکەرەما خودێیە نادێ هەر کەسی ب مەردیێ مرۆڤ بلند دبە دچە ئەزمانا دەگەهێ خودایێ خوە.

(٤) ئەڤ گۆتنن دەربارەیێ مەردی تییێدا من گۆتین نە ژبەر خوە من گۆتنە بەلێ ژ پەرتووکا من گۆتنە سپاسیا وا بکە و ژبەر ڤە دوعا ژ من ڕا بکە.

(٥) فیرعون خوە مەزن کر دڤی عەردێ مەدا و سەرخوە چوو گۆت ما مصر هەمی نەیامنە و ئەڤ ڕووبارێن ئاڤێ دبن قەسر و قوسوورێن مدا دبوورن گۆت: [انا ربكم الاعلى] (النازعات: ٢٤) [اليس لي ملك مصر وهذه الانهار تجري من تحتي] (الزخرف: ٥١).

الحسنى تثنى ولا تنسى لدى احد

والسوء سوأت عمال اذا عملا[٢]

احسن كما احسن الله اليك ولا

تبغى الفساد لفي قارون قد نزلا[٣]

قرآننا حكم يا فوز ممتثل

به ومن لا فهو ثاني الذي قد خلا[٤]

اعن بصبر على حمل الشدائد من

بعض لتدع بفقر الذنب اذ جهلا[٥]

اذا استسلم الناس لمصالح امرهم

فذا عين اسعاد ارتقاء الى العلا[٦]

والا فذا منهم دمار لمجدهم

---

(١) پاشى فرعون دكوراتيا دەرياێيدا چوو خارى وندا بوو هەرە خار وندا دەبنێ دەريايێ يا كەرا وەكە عەرەب دبێژن دانيەيا پەرەندى كەرا يا پەرەندێ كەرا. كەرا ناڤى تەيرەكيە وەكە مولنك چاخێ سەر وا دە دمرە دبێژن: اگرق كرا.

(٢) پەسنێ چاكيێ تيتە دايين لبا كەسى نايێتە ژبير كرن  پيسيتى پيسە چ دەمێ بێتەكرن و ژ لايى كێڤە ببێ ببت.

(٣) تو چاكيێ بكە چاوا خودا چاكي ل تە كريە نەباشيێ دعەرديێدە بەلاڤ نەكە ئەڤ [ولاتبغي الفساد] (القصص: ٧٧) دەربارەيى قارۆندا هاتيە قارۆن ژ گەلێ موسى (عليه السلام) بوو.

(٤) قورئانا مە حكمەتە تشتێت خەريب تێدا هەنە ئەو كەسێ خوە پێ بگەرە و وەكە وێ كاريكە ئەو خلاس بوويە ئەو كەسێ نە وەسابە ئەو وەكە قارۆنە چوويە وندايە.

(٥) ب صەبرێ ئارى كار بە ل سەر هلگرتنا نەخوەشيا ژ هندەك كەسا بيژە يارەبي ل گونەهێ وابيورە ژبەر كو نەزانن. هەكە نە نەزان بوونا نەخوەشيى چێ نەدكرن.

(٦) چاخێ ئينسان رحەت بن وچاك بن ژبۆ پيك ئانينا شول و كارين خوەڕا ئەو عەينێ سەركەڤتن و بلندبوونا وايە و هەوا كەتنە بال دەرجێن بلندڤە.

شـــــقاوة داريهــــــم ومـــــــا نـــــــالوا مـــــــأملا[1]

لـــــيكن شــــمالك عفـــــو مــــــن قــــد اعتـــــدى

ليزيــــــد عــــــزا بــــــالعزيز مــــــن اهتـــــدى[2]

خـــــذ مــــــن كتـــــاب اللــــــه خيـــــر شــــمائل

طــــوبى لمــــــن قــــام بـــــه وبـــــه اقتـــــدى[3]

هـــــــلا تســــــائل عـــــــن دم الحســــــــين

تـــــأتي وتســــــــتفي عــــــن دم البراغيـــــــث[4]

ذا مــــــن نفــــــآق مــــــن جهلـــــك بالـــــدين

تــــب مـــــن نفاقــــك يـــــا داعـــــي الفـــــرديس[5]

فكـم مـن ذاكـر للـه عقعـق لـه قلـب بـدنياه معلـق

---

(١) هەکە نەوەسا بن ئەو تێك چوونە ژبۆ باشیا وا و نەخوەشیا هەر دوو خانایە خانا دونیایێ ویا ئاخرەتێ ئەو ناگەهن مەخسەد و میرادین خوە. مرۆڤێن نەقەنج هەر د خوسارێ دانە.

(٢) بلا هەبت چەپێ تە ژبۆ لێ بوهورتنێ بت ژبۆ وان کەسێن کو تەعداکرنە نە حەقی کرنە دا قەنەچاکیا تە مەزناهیا تە زێدەببت بوبێ کو عەزیزە عەزیز هەر خودایە و هاتنا سەر ڕێیا ڕاست ژی بدەستێ خودایە کی بڤبت ئەوی هیدایەت دکێ.

(٣) خۆیێن چاك ئەحلاقێن باش ژ پەرتووکا خودێ کو قورئانە ژ خوەرە بگرە. مزگینی بۆ وي بت ئەوێ خوە ب وێ بگرە وقورئان ژێرە ڕێبەر بت و خوە پێ بگرە و دووڤ بچە.

(٤) تو چما پرسا خونا حوسەین ناکی تو تێ پرسا خوونا کێچا دکی کا نڤێژ پێڤە دبێ یان نە. بەکی خەلکێ عراقێ کەربەلایێ هاتیە لایێ ئیمامی گۆتیە کا خوونا کێچا نڤێژ پێڤە تێ کرن یان نە ئیمام دبێ ژێ تو ژ کویی زەلام دبێژێ ئەز کەربەلایێمە ئیمام دبێژێ پرسا خوونا حوسەین کو نەڤیێ پەیخەمبەرە ناکێ هاتیە پرسا خوونا کێچا دکە ئەو بوو مەسەلە ژبۆ وا یێن پرسا تشتێت مەزن ناکەن پرسا یێن بچووك دکەن.

(٥) ئەڤاهە ژ درووتیێ تێت یان ژ نەزانینا ئایین تێت. ئەوێ دووڕو بت دەستێ وی بشی کیهێ یا ئەو کەسێ گازی کوجکێن سادکی و هەڤالێ وایە.

فأياك ودنيا والكرامة وفي ذين اذا ما خاضت تفرق[١]

تـــــذكر ابـــــا جهـــــل بمـــــاذا تشـــــأما

غـــدا بـــين اقـــران مـــلاز التباهـــل[٢]

حـــذاريك جهـــلا يـــا فتـــى خيـــر حـــاذر

تعلـــــم فـــــأن ابهـــــل ام الرذائـــــل[٣]

اعظـــم كـــل عظـــيم اكبـــر كـــل كبيـــر

اغيـــر كـــل غيـــور ومعيـــذ كـــل بـــر[٤]

اقصـــم ظهـــر ظـــالمي غـــراء شـــرع بـــالبلا

وببـــأس بيـــنهم والســـاعة ادهـــى وامـــر[٥]

ليـــت الـــدين بـــدورا ليـــت بـــدرا راجـــع

مـــن صـــناديد الزمـــان حســـبنا المـــولى الأبـــر[١]

---

[١] گەلەك هەنە زكرێ خودێ دكن لەق لەقاویە دلێ وی ب دونیایێڤە گرێدایە خوە ژ دونیایێ بپارێزە تێكلی نەبە بلا تو ئەهلێ كەرامەتێ بی ئەڤ هەر دوو چاخێ ڕاستا هەڤ تێن ژ هەڤ د ڤەهنی بهەڤرە كۆمنابن لایەكی كەریم بت وژلایەك دیئە دونیا پەرەست بت.

[٢] بدە بیرا خوە كا ب چ ئەبو جهل شووم بوو. بۆ مرۆڤەك نەباش و پیس ژبەر كو كەتە ناڤبەینا هەڤالێن كو شول و كارێن وا لەعنەت.

[٣] بۆ خوە بپارێزە ژ نەزانین یا لاوك باش خوە ڤەدە، وبزانبە لەعنەت دایكا هەمی پیسیتیایە ڕەزالەتایە ژ هەڤالێن پیس خوە ڤەدە.

[٤] خودا مەزن ترێ هەمی مەزنایە ئەكبەر ژی وانا وێ مەزن تر ژ هەمی هەینا مەسترە خودا ژ هەمی تشتا ب خیرەت ترە خلاسكەرێ هەمی چاكا یە.

[٥] پشتا ستەمكارا د شكینە ئەوێن كو ستەمێ ل شەریعەتا ڕوهن و ڕەوشەن دكن، نەخوەشیا وا دێ ناڤ وا دە بت و ڕۆژا ڕابوونێ (قیامەتێ ) ژڤ یێژی ژبۆ وا نەخوەشترە و تەحل ترە.



Zakho Centre for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەكۆلینێن كوردی

فيارب رغم انف مستولي حقنا
بتشتيت شمل وبأخذ شديد[٢]
بتشديد قلب وبتطميس أموال
وتدمير بنيان بهل من مزيد[٣]
عسى ان يكون آية للخلائف
وزجرا لأفاك عذاب الوعيد[٤]
ومن رحمتك دفع ظلوم بظالم
والا فما حال ضعاف العبيد[٥]
فعجل بنصر حل عقد تسومنا
سواك فليس من اليه من نجيد[٦]
الزامك المتعنت بخع نفس

---

[١] خوزی ئایین هەیڤێن جاردە. شەڤیبوویا خوەزی ئەو هەیڤ ڤەگەڕابوویا ژناڤ پەنجێن زۆرداریێن دەورێ زەمێن بەسی مەیە خودایێ مە ئەوێ کو گەلەك گەلەك چاکی کەرە خێرکەرە.

[٢] یارەبی تو ب گەمرینی دفنا وان کەسێن دەست سەر مافێن مەدە گرتنە تو هێزا وا بەلاڤ بکە و تو بهێز وا بگەرە.

[٣] تو ب دلەك هشك وا بگرە ومالێ وا پووچ بکە و مالا وا خراب بکە و هێژ زێدەتر تو وا ژ ناڤ ببە.

[٤] هیڤی هەیە کو ئەڤ ببت دەرسەك ژبۆ وایێن پاشڤە تێن و ببێ نەهێلان گەلەك بێ بەختان وسەزاك کو هاتیە سۆزران بۆ وان.

[٥] ژ دلوڤانیا خودایە ستەم لێ کەری ب ستەمکارێ لاددی دەفع دکێ. هەکە نە وەساب ت حالێ یێ ژار و کولە وێ چاوا بت.

[٦] یارەبی سەرکەفتنەك زوو ژبۆ ڤەکرنا وان گریکێن کو مەدئێشینن ژبلی تە ژ غەیری تە چو خودا مە نینن کو ئەم هەوار بگەهێننێ و ل هاوارا مەبێت و هاریکاریا مە بکە ژبلی تە یارەبی.

اذ لـــــيس فــــي طــــوق الهمــــام العــــالم[١]

فعليــــــك بـــــالهجران يـــــا اهـــــل الحمــــى

هجـــــرا جمــــيلا مثــــل هجـــر الظـــالم[٢]

تـــــرجح ذا جهـــــل معانــــــد ذي علـــــم

تكشــــفت لـــــي وطـــواط كهـــف التجاهـــل[٣]

اذا مالـــــــدهور واجهتنــــــــي بوجههـــــــا

ملاوكـــــس فـــي ليلـــى ولافيــــه مـــن شـــطط[٤]

وكـــــم مـــــن ليــــال ابرقــــت وبهــــا اهتـــدى

وكـــم مـــن نهـــار لايهـــدي لمـــن ســـقط[٥]

كأنــــــك يعقــــوب وهـــــا أنــــا يووســـــف

فقـــــدتني احـــــوالا ولـــــم اك اذكـــــر[٦]

---

[١] تو بێژی ئەزی و یێ خودانێ نەفسا ڕەزیل زەلیل ڕازی بکم و ڕاوەستینم یان هەڤالـەتیا وی بکم.

[٢] وەسا نەکە ژبەر مرۆڤێت مەزن و جەسور و زانا ناکەڤە دوێ چەمبەرێدا. بلا تو تەرکا وی بکە ژێ گەرانەك ڕند و باش وەکە تو چاوا تەرکا ستەمکاری دکی.

[٣] تو وی جاهلێ نەزان هەل بژێرە ل سەر وی زانایێ خودان عیناد ونەڕاست موخالف بت. تە بۆ من دا دیارکرن و کفش کر دەنگێ چلی چلێن شکەفتا نەزانینێ. وەکە وان ئەو کەسایە کو بیێ هشە وکێم عەقلە و جاهل و نەزان ژێ وەسایە.

[٤] چ چاخێ زەمانی بەرێ خودامن برووێ خوە چو کێماسی د شەڤێدا نامینە و دوورا تیژی تێدا نامینە هەر تشت بۆ من نیزیك دبە.

[٥] گەلەك شەڤ هەنە ڕۆناهینە شەفەق ژێ دچە مرۆڤ ڕێیا خوەیێ دبینە. گەلەك ڕۆژ هەنە ئەو کەسێ کەتیی و بیچارە ڕێیا ڕاست تێدا نابینە. ژبەر کو کەتیە ڕۆناهی فەیدا وی نادە.

[٦] ئەز وەسا تەماشەدکم کو تو وەکە یەعقووب ئەڤە ئەز ژێ یووسف گەلەك سالان تە ئەز هێلامە و نەدیتمە نایێتە بیرا من کا چەند سالن.

اقول بعدل لست اهلا لذالكا
ولكن ماتسمح به من كمالكا[1]
وفيك مقام مثل من كان راعيا
ضياع عبير راع وتنكر[2]
دنى الرحل لو يقبل لكنا فدائكا
لتحظى بك الكون بكشف المغمة[3]
فيارب متعنا به اسوة لنا
وعالا معولا قوى في المعية[4]
وحببه فينا يامآل المحبة
وحف بلطف يالطيف احبتي[5]
ونور به اكوان ضاعف اجوره
وصن صلبه من كل شر وشرة[6]

---

[1] ئەز دبێژم: بڕاستی ئەز نە هێژامە بۆ وێ یەکێ کو تو پرسا من بکی لێ ئەڤا هە ژی ژ چاکیا تەیە و ژ جامێریا تەیە.

[2] تو د جهەك وەسادەیی وەکە وێ کو شڤان بت و دەڤەهەك یا وی بەرزە بت. بەرزەبوونا دەڤەهێ کێماسیا شڤانیە و ژێرا نەخوەشە د شڤانیا وی دە یەك ژی بەرزە ببت.

[3] بارکرن ژ دنێ نیزیکە هەکە قەبوول ببت مە دڤێت ئەم گوری تەبن دا قەنەهەیین ژ تە بەهرەمەندبت بروهنی کرنا وان تشتێت نە ڕۆهن و نە دیار وتاری و فەیدی ژ نە بینن مرۆڤێت زانا ڕۆناهیە جاهل تاری تیە.

[4] یاڕەبی مە ب وێ خودان هەیین بکە وێ بکە ڕێ ناس بۆ مە وی بکە جهێ پاراستنا مە و ژ مەرە ببێ هێز د هەمی مرادێن مەدا.

[5] د ناڤ مەدا بکی حەز ژێ کەر بڤیانێن حەز ژێ کرنێ تو و ب ڤیانا خوە وێ تەژی ڤیان بکی ئەز حەس ژێ بکەم.

[6] یاڕەبی تو دونیا و ئاخرەتێ بو وی ڕۆناهی بکی وچاکێن وی پرپکی و زارۆکێن وی بپارێزی ژ هەمی نەخوەشی و دژواریا.

فياشـــوق مـــا انســـى ويـــا قلـــب مـــا اقســـى
ويـــا ذنـــب مااحصـــى فـــذا مـــن هويـــة[١]

لـــك الحمـــد يـــارب علـــى ماقضـــيت لـــي
صـــلاة علـــى طـــه بصـــحب وامـــة[٢]

الـــى مـــن الشـــام ســـلام امـــنكم
فـــأن بـــك مـــنكم ذا جـــواب الـــيكم[٣]

وكـــم ار آتيـــه ســـوى مـــن ومـــن
تقطعـــت الأســـباب منـــي فـــأنتم[٤]

ولمـــا اتيـــت العفـــو مـــنكم اعـــرت لـــي
عفـــوا مـــن الحســـنى شـــفيعا لـــديكم[٥]

والا فـــذا رأســـي بســـيف وطـــائر
بقطعتـــي اســـبابي بـــأمري الـــيكم[٦]

---

(١) يا ئەو حەز ژێ كرنا هاتى ژبيركرن يا ئەو دلێ هشك بووي. يا ئەو گونەهێن پڕ كو نايێن هەژمارتن ئەڤێن هە هەمى ژ من پەيدابوونە، ژ داخوازێن نەفسا من چێبوونە.

(٢) سپاس بۆ تە ياخودا ل سەر وايێن ژ من ڕە پێك ئانيى ڕەحمەت ل سەر (تەها) وهڤالێن وى وئومەتا وى بن.

(٣) سلاڤ ژ شامێ ژ هەوە بۆ من هاتنە هەكە ژ هەوە خودان بەرسڤ بت ديسا بو وەبن ژبۆ سەيدايێ خوە مەلا ڕەمەزان جێلەكى دبێژێ باڤێ سەعيد ئەلبوتي.

(٤) چەند من ديتيە هاتين باوى ژبلى ئەوى و ئەوى ئەو ئەوى ئەو ئەگەرێن هاتين بڕين ژ من هوون بوونە. ئەوێ ئەز پێرە داخشم دڤا چەند بەيتادە سەيدايێ من مەلا ڕەمەزان جێلەكى ل شامێ ل گەرەكا صالحيێە خودا بەرەكەتى بدە وى، بابێ سەعيد ئەلبوتي.

(٥) چاخێ ئەز هاتم من داخوازا لێ بهورتنێ ژ وە كر من ژ خوە ڕە لێ بهورتن كريە گەرەو ژ چاكيێ كو مەهدەرچيىێ لبا هەوە.

(٦) هەكە نە وەسا بت ئەڤە سەرێ من و شورێ هەوە بفرينن ژبەر كو من ئەگەر برينە و ئەز كارێ خوە ددم بال وەڤە.

ان كـــــان غـــــيظ بظلــــم حقـــــي يطلقنــــي

وان بحـــــق فمنـــــــك العفـــــو يلحقنـــــــي[١]

جســـمي ظلـــم دن اولورســـة حـــق بنـــي اخـــراج ايـــدر

گـەركـە حقلكـدن اولورسـة عفـو بنـي اخـراج ادر[٢]

لـــــيس الشـــــديد بصــــرع بــــــل اذاغلبــــا

نفســـــا لــــــدى غضـــــب هـــــلا ترحمنـــــي[٣]

والــــــثم شـــــــفتي اســـــــتاذ علـــــــم

ســــنآء البــــرق فـــــي نشــــر الكـــــلام[٤]

ومــــــن ذا النشـــــر شـــــأنه لـــــيس بخلـــــو

مــــن الكبـــــر ســــوى مــــن فــــي اهتمـــام[٥]

تـــــداوي قلبــــــه مــــــن كــــــل آفـــــة

لـــــدى شـــــيخ وهــــو عنقـــــا المقـــــام[٦]

ثــــم الســـــلام مــــدى الأحـــــوال والعصـــــر

علـــــى الرقيــــب وبخشـــــى ميـــــديا وثـــــرى[١]

---

[١] هن نەخۆشی بۆ من ستەمكاری بت خودا وێ من بەردێ و ڕەها بكێ هەكە ژ خوە حەقا بت ژلایێ تەڤە لێ بهورتن وێ بگەمن.

[٢] ئەڤ مالكاهە ب زمانی توركیە واتایا بەری وێ یا ڤێیە ژی مەعنا وا یەكە ئەو عەرەبیە ئەڤ توركیە.

[٣] مرۆڤێت بهێز خورت نە ئەوە كو هەڤالێ خوە ل عەردێ بدێ بەلكی ئەو كەس بهێزە كو كار بێ نەفسا خوە دچێ غەزبێدا ما تو ڕەحمێ ل من ناكی.

[٤] ئەز ماچ دكم هەر دوو لێڤێن سەیدایێ زانا. ڕۆناهیا برِوسكێ ژ بەلاڤكرنا ئاخفتنێن وی پەیدا دبن.

[٥] ژ ڤێ بەلاڤكرنێ ئەو نە ڤالایە ژ كوبارێ. ئەڤ ژی داخوازا منە.

[٦] دلێ وی ژ هەمی بەلا و ئافاتان بێتە دەرمانكرن لبا شەیخەكی مورشدەكی ئەوێ وەسا ژی پەیدانابە چاوا پەرەندا عەنقایێ پەیدانا بە و جهێ وێ نینە، مورشد ژی وەسایە.

وهـــــم ذريــــرة مــــن بـــالترك قـــد تركـــا

لفيـــف ثـــوب الضـــنى ضـــناه مـــن ســـقر[٢]

اضـــاء البيـــت شـــوقا مـــن رســـوم

خيـــــالي تـــــلألأ كالثريـــــا[٣]

عيـــون جـــادت اليـــاقوت تتـــرى

بأشـــــواق اذا وردت عليـــــا[٤]

امـــن عجـــب عجـــاب ذا فكيـــف

اذا جـــآؤا بأنفســـهم اليـــا[٥]

مـــن الشـــعب لاتيـــأس اياســـا ممنعـــا

وكـــد لمفـــروض عســـى ان توافقـــا[٦]

علـــى المـــرء ان يبـــذر لنيـــل مؤجـــل

---

[١] پاشى هەمى گۆتنێ ب درێژاهيا سال و زەمانا سلاڤ ل سەر عەبدولڕەقيب و بخشان وەكە چاوان ميديا و پەريێ بن.

[٢] ئەڤێن هە زۆر بەتا وان كەسانە كو ل تركيێ هاتنە هێلان و تەرك كرن ئەوێن كو جلا ژاريێ ل خوە پێچانە ئەو جلا كو ژ ساربوونێ مرۆڤ ل خوە دپێچە. عەبدولڕەقيب ناڤ بانگە ب مێژوونووس و عالمێ ئاسارا كوڕێ مەلا يووسف خودانێ ڤێ ديوانێ، پخشان ژنا.

[٣] خانى ژ كەيفا وا وينەيێن خيالي ڕۆناهى بۆ ڕۆناهێ ژ وا دچێ و شەفەق ددن وەكە ستێركێن كۆم كا سێويا.

[٤] چاڤ ژ كەيفا ديتنا وان رەسما، ل دووڤ هەڤ لێبن ياقوتا ددن چاخێ ئەو هاتن با مە هێسترێ چاڤا دشبهێن ياقوتا.

[٥] ژ عەجێب وعەجێبيێيە چاخێ ئەو بخوە بێنە بامە. ئەڤاهە وينەيێن خيالي بوون هنارە ئەم كەيف خوەش بوون هەكە ئەوێن كا وێ چاوابت وى عەجێبت.

[٦] بێ هيڤى نەبە ژ گەلێ خوە بێ هيڤيەك كو تە ژ دۆزا تە پاش بێخە كوشش بكە ژبۆ مافێ خوە هيڤى هەيە تو ب دەست خوە ڤەبينى.

اذا لم يوافق فالذراري توافقا[1]

ارى السلامة في قلب المكان ولا

يخفى على الفطن اذربه رجلا[2]

يارب صن كله يسر له كله

خير الخلائق لي وربه رجلا[3]

ورونق وجهي رونق النجم اذ هوى

عليه فلم يبق سوى هيكل العظم[4]

كأنك ان لاقيت لا تعرفنه

كأن لم تراه في عصور تقدم[5]

وعما قليل تسمعن غيابه

وتبدي لك الأيام مافات من رحم[6]

فأف لدنيا هي غرام وفرقة

---

[1] ل سەر شەخێ پێدڤیە كار بكی ژبۆ دەست خستنا پێشە ڕۆژێ هەكە دەست ڤە نەهات وێ ب دەست میرات خوەرێن ویڤە بێت.

[2] ئەز دبینم تەناهی، سەلامەتی، دگوهورینا جهـ دایە تو جهێ خوە بگوهەری ئەڤا هە نە ڤەشارتیە ل سەر مرۆڤێت زانا وهوشمەند ژبەر كو خوەش زەلامە.

[3] یاڕەبی تو هەمێ وی بپارێزی و هەمێ ڤیانێن وێ ژێرە سەهل بكی ئەو چێترینێ پاش مایێ منە و خوەش مرۆڤە. ئەڤاهە بۆ من یانی كورێ خوە مەلا ئەحمەد یووسف حەسەن را نڤیسیە چاخێ كوردایەتی دكر. د سالێن ١٩٨٠ دە چاخێ دەستهەلاتا لەشكەریدا ل تركیە دەورا كەنعان ئەڤرەن.

[4] ڕۆناهیا ڕووێ من وەكە ڕۆناهیا ستێرەكایە دەمێ پەرەدە ب سەر دەتێت ژبلي هەیكەلێ هەستكا تشتەك نەمایە.

[5] هەكە تو ڕاستا وی بێي تو وی ناس ناكی هەر وەكی نە ئەو د دەمێن بووریدا نەدیتبێ.

[6] ددەمەك نیزیك دا هوونێ مرنا وی ببهیزن وێ ژ تەرا ئاشكەرە ببن ئەو ڕۆژێن بهورتین ژ بێ دلوڤانیێ بێ ڕەحمیێ.

تـــــــــنفص ايــــــام لــــــذات اذا تصــــــــرم[١]

ايـــــا دهـــــر لـــــم تــــأت علينـــــا بـــــذكرنا

وانــــي مـــدى الـــذكر لمـــن فـــي التقـــدم[٢]

مـــــآ لـــــي أن تســـــئل فضــــعف وشــــيبة

مـــن البـــوون شـــكل مـــن عظـــام مهيكـــل[٣]

منــــــي اليـــــك بـــــالجواب المعجـــــل

اذ لا اصـــــطبار فــــي الفــــراق المعضــــل[٤]

فيــــا ايهـــا الأنســـان انـــك كـــادح

الـــى ربـــك كـــدحا فأنـــت ملاقيـــه[٥]

يمينـــــا يمينـــــا طـــــائرا متيمنـــــا

شـــمالا فـــلا تشـــمل والا تهـــن فيـــه[٦]

---

[١] ئوف بت ژ دونيايێ ڕا كو خوساره و ڤەقەتاندنە، ڕۆژێن وەسانە كو خوونێ پالدن ژبۆ وی زاتێ كو خەلاس بوویە و نەمایە.

[٢] یا چاخ یا زەمان تو نەهاتی سەر مە و مەبیر بینی و بەحسا مە بكی چەند بیرئانینا وایێن بەری مە چوویین چەند درێژە.

[٣] هێڤیا من ئەوە كو تو پرسا مەب كی ئەم ژاربوونە و پیربوونە یا جودا یا حازر كوشەكلەك ژ هەستكا وەكە پوتەكیە.

[٤] ژ من بۆ تە بەرسڤەكا بلەز ژبەر دقە قەتاندنا كوپێ شمالي تێتە كرتن خوە ڕاگرتن نینە صەبر.

[٥] یا مرۆڤ تو كوششێ د كی و جەهدێ دكی ل كریارێن خوە بال خودا ڤە دچی تو دێ بگەهێ وا كریارێن خوەچاكبن یان خراب بن هەمی هاتیە زەبت كرن لبا خودا. ئەڤ ئایەتە پاشەشایە د سورەتی [اذا السماء انشقت] (الانشقاق: ٥).

[٦] چاخەكی ڕاست و چەپ پەیدابوون یەمینی ویە ساری، د پەرتووكا پیرۆز دا ژی خودا گۆتیە (اصحاب الیمین واصحاب الشمال). دبێژی: فكرا تە بلا ڕاست بت نە چەپ بە

ويا ايها الانسان يأتيك بغتة
وفات ماعسى انت بأبيه[(١)]

بنان ستبلى في الثرى والمحاسن
ولم يبق منك غير ماانت راويه[(٢)]

بقصوى بلاد من يتامى بلا قربى
بحسب امرء شرا ضياع ذراريه[(٣)]

من شعر ثم السلام مدى الأعصار
الى هنا خطابتي لولدي عبدالرقيب[(٤)]

من هيكل العظم من دهر قد انبعثا
غدرا تكاد السماء منه تنفطر[(٥)]

ارخى على سدولا من هموم لظت
احشائى منها فما حالي بمؤتمر[(١)]

---

مرۆڤ ب ڕاستیی سەردکەڤە پێ دفرە دچە دگەهێ خودا چەپی تی نەباشە نەبە چەپگیر هەکە تو ببی چەپگیر تو وێ کێم بکەڤی.

(١) یا مرۆڤ نشکا ڤە هەو تەدیت مرن هات تو گرتیی هیڤیا تەمامیینە باڤێ خوە ژی ببینی.

(٢) سەرتبل سەرتلی وهەجوانی ورندی دپێژە ڕۆژادە وێ برزن توتشت ژ پاش تە نامینە ژبلی ئەوێن کو تە بەهس کرن و روایەت کرین.

(٣) ل دوراهیا وەلاتی هندەك سێوی یەتیم بێ مرۆڤ دمینن ئەڤاهە بەسی وی کەسیە ژ شەرهێلانا زارۆکا بێ کەس وکار.

(٤) ئەڤاهە ئاخاڤتنا منە بو کورێ من عەبدولڕەقیب. کو ژ وەلاتی دوور کەتیە و زارۆکێن خوە هێلانە بێ خوەیی و بێ کەس.

(٥) ئەز بۆ مە هەیکەلەك ژ هەستکا ژبەر کو زەمانی غەدر ل سەرمندا شیاندیە نیزیکە عەزمان ژبەر وێ غەدرێ هل وەشێ و ژ ناڤ هەرە.

فهلا اطعتم والدا معشرالولد
ومنه تفرون فراركم من اسد[2]
الستموا اطفالا وانتم بعجزكم
وكنتم على حفر من النار يا ولدي[3]
الستم سكارى ومجانين وقتكم
وهل لكم حذر من الضر ياولدي[4]
الستم جياعا وعرايين يومكم
من المطعم المكسي لكم معشر الولد[5]
الستم كالبهم من الراعي غيريا
فهلا تتوبوا وارجعوا مفرز الولد[6]
الستموا جهالا وكنت معلما
فهلا سمعتم والدا خادم الولد[7]

---

[1] هندەك مەرەقا وخەمان خوەبسەرمندا بەردایە ژبەر وان خەمان ناڤا من. روڤیێن من دشەوتن وئاگر پێ كەتیە ما ژبۆ من مایە. ما حال وچاخێ من هەیە كو بریارا بدەم.

[2] ماچ را هەوە گوهێ خو نەدا باڤێ خوە یا كۆما زارۆكا، هوون ژبەر وی د ڕەڤین وەكە هوون ژبەر شێر ب ڕەڤن.

[3] ما هوون نەبچووك بوون و بێ دەستهەلات بوون نە كاربوون هوون ل سەر كورتەك یل ئاگربوون یا بچووكێن من.

[4] ماهوون نە سەرخوەش و شێماتێن دین، چاخێ خوە بوون ما نە دڤیا هەوە خوە ڤەدا بوو یا ژ زەرەرێ یا بچووكێن من.

[5] ما هوون نە برسی و ڕووتێن چاخێ خوە بوون ماكی بۆ خارن و جل و بەرگ بۆ وە دابین دكر یا كۆما زارۆكا.

[6] ما هوون نە وەكە ئاژەلابوون ما نە ئەز بووم شڤان بۆ وە ما ژبلی من هندەك دی هەبوون ما چما هوون ژوڤان پووشمان نابن و ناڤەگەرن. یا مەفرەزا زارۆكا یانی كۆما زارۆكا.

[7] زارۆكێن وی كوربوون و چار ژی كەچ بوون. هەم ژی ساخ بوون نها ژی هەمی ساخن.

الستموا اوتارا ومن لزواجكم
فهلا شكرتم حين صرتم ذوى ولد[١]

فهلا استعذتم من عقوق تراكمت
فهلا تتوبوا واتقوا في يا ولدي[٢]

عليكم بعلم ووصيتي فوزكم
وما بيننا الا الوفآء بذا العهد[٣]

وأفوا بعهدي الآن اوف بعهدكم
صميما ولا اغدو خصيما لكم غد[٤]

فبالعلم حيوو به فتمتعوا
ولاغالب اليوم لكم من ذوى الجند[٥]

ومالي سواك يا الهي خليفة
اليك أأديهم فصنهم عن الردى[٦]

---

[١] ماهوون نەكەت بوون. نەزەوجى بوون. كيبو هوون كرن جوت چما هوون سپاسيێ ناكن چاخێ هوون بوون خودان بچووك و زارۆك.

[٢] چما هوون خوه ناپارێزن ژ وان گونەهێن كەتين سەرهەڤ چما هوون ژوڤان نابن و پوشمان نابن و دەربارەيى مندا ژ خودى بترسن يا بچووكێن من.

[٣] ل سەر وەبێ بزانينێ هوون عالم بن شيرەتا من بۆ هەوەيە ئەڤ خلاسيا وەيە. ئەوا د ناڤ بەرا من و هەوە دا بجهـ ئانينا. سۆزێيە ئەڤێ سۆزێ هوون پێك بينن ئەم يێن هەڤن. هەكە هەوە پێك نە ئانى سبە ڕۆژێ ئەم نەيارێ هەڤن.

[٤] هەكە هوون سۆزا خوە پێك بينن ئەز ژى ئانها سۆزا خوە پێك تينم ئەوا من بۆ وەدايى ژ دل هێژ نەبوويى سحار هەكە وەسا نەبت سحارێ ئەزێ ببم دوژمنێ هەوە.

[٥] بلا ژيانا هەوە ب زانستيێ بت وێ ژ خوە ڕە بكن مال و ملك وێ دەمێ وێ ڕۆژێ چو كەسيێ خودانيێ لەشكەرا ل سەر وەدە زال نابت.

[٦] يا خودا ژبلى تە چو كەس من نينە كو پاش من ڤە لوا بنەرێ ئەز وا دسپێرم تە تووا ژ نەباشيا بپارێزى و ژ كێم كەتنێ.

واشواقكم هاجتني ها انا جمرة
واشعل نارا ومالي رقدة[1]
وامري مريج لا اكاد اصيبكم
بجسم نحول في قفار وربوة[2]
واني لمذ بوح وفي حركاته
وان تسئلوا عني فذا من هويتي[3]
من بعد أن تتقى الله بمعرفة
اني مهنيك بالعلم وبالعمل[4]
أرخ مآثر قوم هم طوالعنا
ذكر بأيامهم جيلا على غفل[5]
يافوز من نال بالتاريخ مأمنه
ياحوذ من قال من أسلافه الأول[6]

---

(١) ڤيانا هەوە ئەز سۆتمە ئەز بۆ مە پەلەك ئاگر ئەز بۆ مە ئاگرەك ب ڕۆناهی ژبۆ من راوەستان نینە ونارازم.

(٢) شول وكارێ من تیكل هەڤە ئەز نكارم بگەهم هەوە بلا شەك زەعیف و ژار دجهەك خالیدا ناڤ وەحشادە.

(٣) ئەز هاتمە سەر ژی كرن د ناڤا لڤ لڤاندنا دا مە هەكە هوون پرسا من بكەن ئەز ئەڤم وهامە. ئەز هاتێمە ناسین.

(٤) پاش من ڤە هەكە تو ژ خودا بترسی بزانین. تەقواتیێ بزانین ئەزێ پیرۆزباهیا تە بكم ب زانستێ و ب كریارین باش.

(٥) مێژووا گەلەكی و بەرمایێن وا مێژوو بكە. ئەو ل بەراهیكا مەبوو نە دابێتە بیرئانین رۆژێن وان ژ بوونا میرات گەرێن كوژێ نزانن.

(٦) سەركەفتن بوویە كو ب مێژوویێ گەهشتیە مرادا خوە ئەو كەس سەرفرازە كو ژپیێ شێین تاخڤی و ژووا خەبەر د دێ خەبینەتا وی كەسیە كو مریێن خوە ساخ دكن ب بیر ئانینێ.

يـــاغم مـــن أحيـــا أمواتـــا بـــذكرهم
يـــاغبن مـــن عـــاش كـــالوحش علـــى قلـــل[1]
هـــو يـــا مـــن قريـــب لرقيـــب غـــدا
يوســـف يعقـــوب فـــي بـــوون وفـــي مثـــل[2]
رعـــد اعـــراف نحـــل مـــريم حـــج فرقـــان واســـرى
نمـــل ســـجده صـــاد ســـجد نجـــم انشـــقت واقـــرا
ســـجدة الصـــاد لشـــكر والبـــواقي للـــتلاوة
ســـجدة الحـــج مثنـــى فأشـــكرن رب الـــورى

---

(١) بيرئانينا وا ساخ كرنا وايه خوسار بۆ وى يه ئەوێ كو ژيان دكن وەكه وەحشا ل سەر كێماسيا. يان ل سەر كونا.

(٢) ئەو نێزيك منه كو ناڤێ عەبدلڕوقيب ژێۆ يووسف. يووسف وەكه يەعقووب دمه سەلا خوەده و دچاخێ خوەده. يانى ئەو ژمن دووره وەكه چاوا يووسف ژ يوعقووب دووريو. باڤێ من ل كوردستانا باكوور بو ل باژارێ نسێبينێ وكورێ وى عەبدولڕەقيب ل باشوور ل باژارێ سليمانيێ ژ هەڤ دووربوون سالا هەڤو دوو نەدديتن.

## القرآء السبعة وراويهم

عاصم حمزة ابن كثير نافع　　دار ابو عمرو الكسائي سابع[١]

لنافع خذ ورشا وقالون راويا　　ولأبن كثير البزى وقنبلا[٢]

ويحيى ودوري وسوس لبصرى　　هشام أبو عمرو لدار قرنفلا

ابو بكرن الرضا وحفص لعاصم　　خلف وخلاد على حمزة تلا

روى عن كسائي العلى ليث بو الحرث　　كذا حفص الدورى وفي الذكر ودخلا[٣]

رب قد آتيتنى مالم اكن اهلا له　　حسن ظني فيك ربي لي شفيع يارحيم[٤]

استحي من اقترافي سئل مالست له　　أنت أعلم بأضطراري يا مجيب ياعليم[٥]

اني مصنوع يديك خطفتني العدى　　خذني منهم ياغيور يا غفور يا حليم[١]

---

(١) ئەڤێن هە ئەو حەفت كەسێن كو قورئان وەكە هەڤ نەخوەندنە خوەندنا وا جودایە وەكە كیژان ژڤا قورئان بێتە خوەندن دبەو تەمامە.

(٢) هندەكا ژی ژوا ڤەگراندنە ڕوایەت كرنە وەكە وەرش وقالون ژ نافع ریوایەت كرنە. بزی وقنبل ژ ئیبن كەسیر بهیستنە، ئەڤا گۆتنە وها خوەندنە.

(٣) ئەڤێن هە ئەو كەسن كو خوەندنا پەرتووكا پیرۆز ژوا هەفت خوەندەڤانان هاتتی بهیستن كو گۆتنە وها دخوەندن. دبێژن وێ خوەندنێ تەجویدی. یانی هەر تیپەكی مافێ وێ بێتە دایین.

(٤) یاخودا براستي تە گەلەك دایە من كو ئەز نەبابەتم ژێرا. لێ هزرێن من یێن چاك ژ تە خودا كو مەهدەرچی بت بۆ من یا ئەوێ كو دلوڤانە.

(٥) ئەز شەرم دكم كو ئەز داخوازا وێ بكەم كو ئەز نەبابەتێ وێ بم تو باشتر دزانێ كو ئەز چەندە حەوجە مە و پێی ویسیتیا من پێ هەیە یا ئەوی داخوازا پەسەند دكێ قەبوول یا زانا.

قفـت بالبـاب صـريخا يـا الهـي أتنـي    ياعظيما فوق كل يارقبيى يا كريم[2]

فـأفتح البـاب ولا تجعـل جـوابي لاولـن    يديى كشكول بصدري ياعظيم ياعظيم[3]

ضـاق بـي الأرض بأسـباب بـدت غـدراتها    في حشاي قلب سقيم ياحكيم ياحكيم[4]

يووسـف أنـذر بقـى عمـر لجـأ بـاب رحمـة    عل أن يسمح بتوب من هو تواب رحيم[5]

ألا رمـــى الســـهم تأديـــب الفـــرس    لعبـــه زوجـــه تفـــريح الـــنفس[6]

---

[1] ئـەز ب هـەر دوو دەسـتێ تـە هاتمـە ئافەرانـدن نـەيارا ئـەز ڕەڤاندمـە مـن ژ وا وەرگـرە نـەيار، نەفسە، وشەيتانە، دونيايە وهەڤالێ پيسە.

[2] يا ئـەوێ ژ هـەمی تشـتا ب خيـرەت تـرە يا ئـەوێ كـو ل گونـەها دبـوورە يا ئـەوێ كـەريم خودانێ حلمێيە، حەليمە نە تو ل ڤەكەرە.

[3] تو ل من دەرى ڤەكە بەرسڤا من نەكە، نا، نو چرا دەستێت من كەشكولە كەشكول ژ دارا يان ژ چـەم دهاتـە چێكـرن دەروێشـا ژ خـوەرە خـارن بەرهـەڤ دكـرن تێـدا د گـۆتنێ كەشـكول، دبێـژێ دەسـتێت مـن ژى كەشـكولن ل سـەر سـنگا مـنن تـو داخـوازا مـن پەسەند بكە يا مەزن يا مەزن.

[4] عـەرد ل مـن تـەنگاڤ بوويـە ژبـۆ هنـدەك ئەگـەران كـو غـەدر تێـدا پەيدابوويـە د ناڤـا سنگامندا دلەكى نەساخ هەيە نەخوەشە يا حەكيم ياحەكيم. يا ئەوێ كو هەر تشت د جهێ وێ دا دانيە دبێژێ خوە يا يووسف ئەڤ ژيێ تە يێ نەزر بكە.

[5] ل بەردەرێ دلوڤانيا خودێ بە و ژوێدێ جودا نەبە هێڤى هەيە كو پووشمان بوونا تەبێتە پەسەندكرن، قەبوول كرن كو ئەو گەلەك تەوبا قەبوول دكە و دلوڤانە ژ كولەيێن خوە ڕە.

[6] هەر تشتەك كوڕێ ئادەم پێ بلەيزە بێ بنياتە و پووچە كورێ دەمێ، يان دەورێ فەيدێ ژێ نابينـە، ژبلـى هاڤێژتنـا سـەرتيرێ ژبـۆ ئـەدە ب دانـا هەسـپێ مێـر ژى ب ژنـا خـوە بلـەيزە كەيفخوەشيە ژبۆ جانى نەفسێ، ئەڤ هەر سێ باشن و درستن.

## ثنائي للملا محمد شريف امام جامع القشلة ـ نصيبين

اراك حاتمـــــا فينـــــا خوانـــــا
بـــــنفس خالـــــدة نوشـــــيروانا[١]

ســـجى مـــن ســـجايا خـــتم رســـل
مـــن الأشـــراف مـــن اطهـــار نســـل[٢]

[١] ئەز تە دبينم د ناڤ مەدا تو هاتەمى، حاتەمێ طڕائى ناڤبانگە ب مەرديتيێ يەك مەرد بت دبێژى فلان كەس وەكە حاتەمە. يانى تو مەردى، تو وەكى نوشى ڕەوانى ئەوێ ب وەك هەڤيێ عەدالەتێ. ناڤ داربوو هەر و هەر ناڤێ وى مايە د (٥٧٩ز) دە مريە. يەك عەرەب بۆ كو حاتەمە يەك ژى عەجەم بۆ كو نوشى ڕەوانە، ئەڤ هەر دوو ناڤ دارن دمێژوێدا.

[٢] نەرمى وخويێ تە ژيێ پەيخەمبەرێ ئاخرێ زەمانيە تو ژ مرۆڤێن شەريفى و ژ دوندەهەك و نەسلەك. پاكى.

## ئەڤ هەر دوو فارسین:

نظرگـــــاه ((ســــليمانى)) رســــيد مــــۆر
كـــــه فيظـــــى نــــوريى از عــــالم ژۆر[1]

گلــى خــوش بــويى گــر بــويم بلــى مــن
ز كمـــالى گلســـتان بـــاغ گلســـتن[2]

امــــل ايــــم رود دعــــامن در حضــــوري
مهــدر اذنـــي بـــۆ مـــن بيـــت تـــه ژ ژورى[3]

ماشـــآء اللـــه تـــو صـــادقى بـــى نفـــاقى

---

[1] مێهر، مێرى چاخێ سليمان (عليه السلام) ب لەشكەرێ خوەڤە گەهشتە نەوالا مێرووێ (وادى النملـه ) مێـرووێ گـازى هـەڤالێن خـوەكر گـۆت هـەرن دكـونێن خـوده دا قەنـە سليمان و لەشكەرێن وى پێ لهەوە نەكن، ژبەر كو هايێ وا ژهەوە نينە. دبێژن ميرو هاتە لايێ سليمان ورانەك يى كولێى د دەڤێ وێدەبو وبزمانێ حالێ خوە دگۆت ئەڤاهە ديارىا منە هوون مێهڤانێ منن دبێژن ئەو لنگ ئاڤيتە دەريايێ گۆت هەچى گەهشتە گۆشتى بلا گۆشت بەرنەكەت بلا ئاڤاوێ بخوە گۆتە سليمانى ديارى وەكە بابەتێ خودانێ خوەيە ئەز ئەڤم بابەتێن منە لێ تو دنيا و ئەوێن تێدا هەمبەرێ تەناييێت تو ژ هەر تشتى بهاترى.

[2] گۆت (بأن الهدايا على مقدار موهديها) شاعير دبێژە: ئەڤاهە بابەتا منە نەكو ياتەيە رۆناهيا بەلاڤ دبە ژ عالەما رۆژێيە، هەريا بێهن خوەش ئەو بێهن نەيامنە بەلكو بێهنا گولێيە ژ باغێ گولاتێت، ئەو ژ كەمالا گولێ گەهشتيە من. يانى ژ زانستێ و علم پەيدابوويە.

[3] هێڤيدارم داخوازێن من بكە ببن ئەگەرا ئامادەبوونێ مەهدرا ئزنێ بۆ من بێت تە ژ ژورێ.

گـــەلـــەك فـــەرق ژ مـــەڤـــان اخـــوان بـــاقى[1]

بــــە مـــــن دەژڤـــــان دران ســــــينم تژيكـــــە
تبـــــارك ســــــينئى تــــــو پاســــــفيكە[2]

لكــــــــــف الأذى ولحمـــــــــــــــل الأذى
تكـــــون حمـــــولا تكـــــن حبــــــذا[3]

ولاتـــــــك ممـــــــن يئــــــوذي المــــــؤمنين
اذاهــــــم بهتــــــان واثــــــم مبــــــين[4]

اذاهــــــم كبيــــــر كبيــــــر كبيــــــر
عــــــذاب شــــــديد ويــــــوم عســــــير

خـذ الامـر مـن التـدبير مـن ارياب ذا الـداهي
توكـل بعـد اسـباب وقـل كـل مـن اللـه[5]

بـــلا تلقـــوا وشـــاورهم واعـــدوا خـــذ ياتـــاه

---

(١) سپاس بوخودا تو ڕاستى دروستى ب تە ڕا نينە گەلەك فەرقا تە و مە هەيە ئەم ئەڤ برايێن مايێن پاشدا ئەم نە وەك تەڕاست ودرستن.

(٢) بدە من ژڤاندەران و سنگا من تەژى بكە ژ زانستێ، سپاس بو خودا سنگاتە وەكە دەريا پاس فيكێيە وەسا تەژى يە.

(٣) تو ئەو كەس بە هەمى نەخوەشيا ڕاكى و نەخوەشيا هلگرە هلگرێ نەخوەشيابە تو وێ دەمێ چاكبي و چاك تێيى ژمارتن و دبى ژ باشا.

(٤) تو نەبە ژواييێن كو نەخوەشيێ دگەهينن باوەرمەندا نەخوەشى گەهاندنا وان بێ بەختيە و گوناهەكى مەزنە.

(٥) د حەديسێدا هاتيە شول وكار ب تەدبيرێيە، هەكە تەڤيا تو بكارەكى ڕابى دڤێت تو تەدبيرا وێ بكى ژێرە ئامادەكارى تە هەبێ ئەڤاهەژى يا مرۆڤێت زانا و زيرەكە، پاش كو تە ژ وێ شولي ڕا تە هەر تشتێت پيويست ئەو ئامادەكر پاش تەوەكولا خوە بەردە سەرخودا و بێژە هەمى تشت ژ خودايە.

بماقـــدر كـــان لا ان انـــت مـــن ذوى الجـــاه [(١)]

زكـــاة العلـــم تعلـــيم فـــاد حـــق مـــن يســـئل
ولاتـــنقض ميثاقـــا مـــن اللـــه اذا تبخـــل[(٢)]

فـــارو مـــن ذوي العطـــش كبـــادا لـــيس يرويهـــا
يسوى العلـم مـايحيى السماء رضـا بمـا فيهـا[(٣)]

فعلـــم ايهـــا العـــالم برفـــق اي مـــن يجهـــل
وانفـق مـا سيخذيك بـه (اللـه) ل (لـم تبخـل) [(٤)]

تقـــول علمـــى مـــن عنـــدي واعـــرض عنـــي ياتـــاه
ونـور العلـم نـور الشـمس قـل كـل مـن اللـه[(٥)]

الأرض تحيـــا اذا مـــا عـــاش عالمهـــا
متـــى يمـــت عـــالم منهـــا يمـــت طـــرف[(٦)]

---

(١) خو نه ئاڤێژه زەرەر و زیانێ و ب هەڤالا ڕە شێورێ بكه و ژبۆ نەیاران هێزێ ئاماده بكه ئەڤێن هه پێویستن یا ئەوێ هایێ وی ژوی نینه. پاشی بلا باوەریا ته ب قەدەرێ هەبت ئەوا هاتی نڤیساندن وێ ببه یا ئەوێ ژ شەرەف مەندایی.

(٢) زەكاتا زانینێ فێركرنا مرۆڤایه ودانینا مافێ پرسیار كەرایه وێ سۆزا بخوداره نەشكێنه هەكه ته شكاند تو ژ بەخیلاتیێ ژمارتن.

(٣) وایێن تێهن تو ئاڤ بده هندەك مێلاك كەزەب هەنه نەب زانینێبن نایێنه ئاڤەدان چاوا بارانا ئەزمانا ئەو تشتێن دعەردێدا هەمیا ئاڤ دده وەسا زانین ژی هەمی نەزانینا ئاڤدده.

(٤) تو فێر بكه یا ئەوێ زانا ب ڕحەتیی سەهلاهی ئەوێ نەزان بت كیبێ بلا ببه تو بده ئەو مالێ دنێ كو خودا ب وی حەسابی ژ ته بخوازه. ئەو زانینا خودا دایی ته تو بده هەكه تو وەسا نەكی خودا وێ ته سەزا بكه دێ بێژه چماته ئەو ماف ژ سەر خوه ڕانەكر.

(٥) تو دبێژی زانینا من ژلایێ منه من پەیداكریه ژ من بگەره یا ئەو مرۆڤێ نەزان وبێ هش ڕۆناهیا زانینێ و ڕۆناهیا ڕۆژێ تو بێژه هەمی ژبال خودایه.

(٦) دونیا عەرده ساخه هەكه زانایێ وێ ساخ بت چ دەمێ زانایەك ژ دونیایێ مر لایەك یێ دنیایێ دمره مرنا عالمی مرنا عالەمێیه.

كــــالأرض تحيــــا اذا ماالغيــــث حــــل بهــــا
وأن ابــــى عــــاد فــــي اكنافهــــا التلــــف[١]

مــــن الــــدنيا نرحــــل كتبــــي منــــك امانــــة
الــــى ايــــن مــــن ايــــن ومــــالي رقابــــة[٢]

الهــــي اعنــــي مــــع صــــدق اليقــــين
علــــى طاعــــة منــــك فــــي كــــل حــــين[٣]

تــــولى الأمــــر بأحســــن تنظــــيم
وزيــــن شــــؤني الأخــــروي بتــــزين[٤]

وفيمــــا تحمقــــت ربــــي نــــدمت
فأقبــــل متــــابي برفــــع الهمــــم[١]

---

(١) هەروەكو عەردی عەرد ژی ساخە هەكە باران لێ وەرە هەكە باران لێ نەهات ئەو تشتێت سەر عەردێ وبن عەردێ خراب دبن و تەلەف دبێ قال رسول الله (صل الله عليه ويلە وسلم) (ماعلم الله عالما علما الا اخذ عليه من الميثاق ما اخذ على الانبياء لتبيننه للناس ولا تكتمونه) طنطاوي ص٥٧. قاسدێ خوەدێ دگۆت سلاڤ لێبن، خودا چاخێ زانینێ ددێ زانایەكی و فێری زانینی دكە سۆزەكی ژێ وەردگرە وەكە وێ سۆزا ژ پەیخەمبەرا وەرگرتی كو وێ زانیێنێ ژبۆ مرۆڤا بێژن و نەڤەشێرن. ئەو عالمێ علمێ خوە ڤەشێرێ و بەلاڤ نەكێ ئەوی سۆزا خوە بخوداره شكاندیە، سەزایێ وی قورسە وگرانە.

(٢) ژ دونیایێ ئەمێ بار بكن پەرتووكێن من ژلایێ تەڤە ئەمانەتن بۆ كو دێ و ژ كو دێ ژبەر كو ئەز نەچاڤدێرم ل سەر وا چاڤدێری بۆ من نینە ب هێڤیا تەڤەنە.

(٣) یا خودایێ من تو هاری كارێ من بی دگەل باوەریەكا ڕاست ل سەر تاعەتی (كریارێن) پاك ژلایێ تەڤە دهەرچاخ و دە مادە.

(٤) یاخودا تو من زال بكە ل سەر شول و كارا دە ب چاكترین لێك دایین تو شول و كارێ من یێ وێ دنیژی ڕند بكە ب ڕندبوونی.

